هەڤاڵ ئەبوبەکر حسەین

# چەشنە ئەدەبی و ڕۆژنامەنوسییەکان و ڕەنگدانەوەیان لە "ژیان و ژین"دا

( ١٩٣٢-١٩٥٠ )

بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٧

٠٧٠,٠٧٢
هـ ٩٧٢ هەڤاڵ ئەبوبەکر حسەین
چەشنە ئەدەبی و ڕۆژنامەنوسییەکان و ڕەنگدانەوەیان لە "ژیان و ژین"دا
(١٩٣٢-١٩٥٠)/ دانانی هەڤاڵ ئەبوبەکر- سلێمانی، بنکەی ژین، ٢٠٠٧.
٤٨٦ل، ١٦,٥ × ٢٣سم، وێنە، بەڵگەنامە، پاشکۆ، خشتە.
١- ڕۆژنامەوانیی کوردی- لێکۆڵینەوە ٢- ناونیشان ٣- زنجیرە (٦٠)
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی پۆلێن و پێڕستی ئامادە کردووە

**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح**

زنجیرە: ٦٠
کتێب: چەشنە ئەدەبی و ڕۆژنامەنوسییەکان و ڕەنگدانەوەیان لە "ژیان و ژین"دا ١٩٣٢-١٩٥٠
نووسەر: هەڤاڵ ئەبوبەکر حسەین
تایپ و مۆنتاج: هەڤاڵ ئەبوبەکر حسەین
بەرگسازی: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ١٠٠٠
نرخ: ٥٠٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن: ٢٧٣ی ساڵی ٢٠٠٧
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لە بڵاوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٢٣
نۆرماڵ: ٣١٨٣٦٣١ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩
سنووقی پۆست: ١٤ E. Mail: bnkaizhin@yahoo.com

# ڕوونکردنەوە

بنکەی ژین، ئەگەرچی کارەکانیی بەگشتی تەرخانی ژیاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانی ی کوردین، بەدەر لەو بەرنامەیە، پێویستی بینی لەو ماوەی دوو ساڵێك و نیو زیاترەی تەمەنی چالاکییدا، کارێك بکات بۆ ڕێزنان لە گەورەیی ی بەهەشتی حاجی تۆفیقی مەحموودئاغای هەمزاغای مەسرەف "پیرەمێرد"، کە ڕۆژنامەی "ژین"و وێنەکەیی - بۆ پیرۆزی و بەرزی نواندن - لە ناوو دروشمی خۆیدا جێ کردوونەتەوە.

ئێمە دڵنیاین "پیرەمێرد" تائێستا وەکوو پێویست، نە لە ناوەندی ڕۆشنبیری ی کوردیدا ناسراوە، نە وەك ڕۆژنامەوانێکی پیشەکاری خاوەن ڕۆژنامەی ئەهلی هەقی تەواوی خۆی دراوەتێ؛ ئەمە جگە لە بەهرە گەورەکانی تری ئەو زاتە لە چەند مەیدانێکی تری ڕۆشنبیریدا. هەر ئەو ڕاستییە پێشتر هانی داین چەند جارێك ڕوو لە مامۆستایانی زانکۆی سلێمانی بنێین ڕاسپێرن تێزی ماستەر یا دکتۆرا لەسەر کارە ڕۆژنامەوانیەکانی پیرەمێرد بنووسرێ. چاکیان کرد کە پێشنیارەیان پەسند کردو ئەو ئاواتەیان هێنایە دی، ماستەرنامەکەی کاك هەڤاڵ ئەبوبەکر بۆ لایەنێکی ئەو مەبەستە تەرخان کرا؛ کاری ڕاست بێ، دڵسۆزانەو سەرکەوتوانە بە ئەنجامی گەیاندو وەکوو خۆی لێی قبووڵ کرا.

بۆیە وا بە هەلی ئەزانین ئەم بەرهەمە کە دیوێکی ژیانی ڕۆژنامەوانی ی پیرەمێردی بە شێوەیەکی زانستی تێدا خراوەتە بەرچاو، هەم بۆ نیشاندانی لێهاتوویی و سەلیقەی زۆری ڕۆژنامەوانیی و نەخشی دیاری لە بنجبەستکردنی

نەریتی ڕۆژنامەوانیدا لە کوردستانی عیراق، هەم وەکوو دیارییەکی شایان بۆ یادی ١٠٩ ساڵەی جەژنی ڕۆژنامەوانیی کوردی، بخەینە کتێبخانەی کوردییەوە، کە هیوامانە کەلێنێکی تێدا پڕ بکاتەوە.

**بنکەی ژین**

## سەرەتا

ئەم کتێبە، لە بنەڕەتدا، ماستەرنامەیەکە، لەلایەن (هەڤاڵ ئەبوبەکر)ەوە، وەك بەشێك لـە پێویستییەکانی وەرگرتنـی پلـەی ماجـستێر لـە ئـەدەبی کوردیدا، پێشکەشی کۆلیژی زمانی زانکۆی سلێمانیی کراوەو بــەڕێز (پ. ی. د. محەمــەد دلێــر ئــەمین میــسری) سەرپەرشــتیکردووە، لــە ڕۆژی ٢٠٠٦/١١/١٤دا لەلایەن لیژنەی هەڵسەنگاندنەوە، وەکو خۆی وەرگیراوە. بـۆ دەوڵەمەنـدکردنی زیـاتری نامەکـە، هـەوڵ دراوە سـود لـەو سەرچـاوە نوێیانــەیش وەربگیرێــت، کــە کــاتی بڵاوکردنــەوەیان کەوتۆتــە دوای گفتوگۆکردنی نامەکە.

# پێشکەشکردن

## پێشکەشە:

- بە نەتەوەکەم (کورد)، بە نیشتمانەکەم (کوردستان).
- بە دایكو باوکم، ئەو دوو چرایەی ڕێگا تاریکەکانی ژیانیان بۆ ڕۆشنکردمەوە.
- بە ڕۆحی زیندوی پیرەمێرد..
- بەهەر کەسێك کە گەر بەوشەیەکیش بێت، فێری کردبم،

بەناوی پیرۆزی "مامۆستا"...

- بە شیلان، شەن، ڤاریۆ ڤالان.

# سوپاسنامه

- سوپاس بۆ سەرۆکایەتیی زانکۆی سلێمانیو کۆلیژەکانی زمانو زانستی مرۆڤایەتییو لیژنەی خوێندنی باڵاو سەرۆك بەشو مامۆستایانی هەریەك لە بەشەکانی کوردییو ڕاگەیاندن، کە ئەوپەڕی خەمخۆرییو دڵسۆزییان نواند.
- سوپاسو ستایشو پێزانینی زۆرم بۆ سەرپەرشتی نامەکەم،

بەڕێز پ.ی.د. محەمەد دلێر ئەمین میسری.

- سوپاسو ستایشو پێزانینی زۆرم بۆ بەڕێزان پ.ی.د. دڵشاد عەلی محەمەد– سەرۆکی لیژنەی هەڵسەنگاندنی نامەکەمو پ.ی.د. فازڵ مەجید مەحمودو پ.ی.د. محەمەد ئەحمەد سەعید– ئەندامانی لیژنەی هەڵسەنگاندن، کە بە سەرنجو تێبینییەکانیان لێکۆڵینەوەکەیان دەوڵەمەندکرد.
- سوپاس بۆ مامۆستاکانم، خوێندکارەکانم، هاوڕێکانم، کەسەکانم، هاوولاتیانی ولاتەکەم، کە گەر دڵسۆزیی ئەوان نەبووایە، منیش نەدەبووم.
- سوپاسی زۆرم بۆ هەریەك لە بەڕێزان:

(نەوشیروان مستەفا، ڕەفیق ساڵح، سدیق ساڵح)، کە دڵسۆزانە هاوکارییان کردمو ماندوبوونی زۆریان لەگەڵدا کێشام.

- سوپاسی زۆرم بۆ مامۆستا خالید خاڵ، کە بەو پەڕی ڕاستگۆییو دڵسۆزییەوە هەموو کتێبخانە تایبەت و ناوازەکەی مامۆستای بەرزو بەڕێز شێخ محەمەدی خاڵی خستە بەردەستم.
- سوپاس بۆ بەڕێوەبەرو کارمەندانی هەریەك لە کتێبخانەکانی ( ئەوقاف، گشتیی سلێمانی، مۆزەخانە، کۆلیژی زمان، زانستەمرۆڤایەتییەکان، بەشی کوردی، بەشی ڕاگەیاندن، ناوەندی زانکۆ، پەیمانگای تەکنیکیی سلێمانی، ئەرشیڤی نەتەوەیی).
- سوپاس بۆ ( کاك ڕزگاری ئەندازیار، بێخاڵ ئەبوبەکر، شەماڵ ئەبوبەکر، ئۆراڵ ئەبوبەکر)، کە هاندەرو هاوکارم بوون.
- سوپاس بۆ بنکەی "ژین" کە ئەرکی چاپکردنی نامەکەیان گرتە ئەستۆ.

## پێڕست

## ١/٠ ناونیشانی نامەکە:

ئەم نامەیە بەناونیشانی (چەشنە ئەدەبی و ڕۆژنامەنوسییەکان و ڕەنگدانەوەیان لە "ژیان و ژین" ١٩٣٢-١٩٥٠)دایە، مەبەستی سەرەکیی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەستنیشانکردنی چەمك و چەشن و جۆرو هونەرە ئەدەبی و ڕۆژنامەنوسییەکانە، لەلایەك بەپێی بنەما جیهانییەکانی ئەم بوارانە، لەلایەکی تر بەو شێوازەی لە ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی "ژیان و ژین"دا بەکاربراون.

## ٢/٠ بواری نامەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات لەهەموو چەشن و جۆرەکانی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی بکۆڵێتەوەو دواتر لە ڕۆژنامەکانی "ژیان و ژین"دا دیارییانبکات و ڕۆڵی "پیرەمێرد" وەك کەسی نوسەر لەم پرۆسەیەدا دەربخات کە دوو بواری گرنگی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی ئاوێزانکردووە، "ژیان و ژین" دووناون بۆ یەك ڕۆژنامە لە دوو قۆناغی جیاداو پیرەمێردیش وەك کەسێکی کارکردوو لە هەردوو قۆناغەکەدا کە زۆرترین ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی دەرکردووە، وەرگیراوە. بۆیە ئێمە لەم نامەیەدا زیاتر قۆناغی پیرەمێردمان وەرگرتووەو قۆناغەکانی ترمان لە پێناوی دەرخستنی ئەم قۆناغەدا باسکردووە.

## ٣/٠ گرفتی نامەکە:

نوسین و لێکۆڵینەوە لەم جۆرە بوارانەدا بەپلەی یەکەم دووچاری ئەو گرفتە درێژخایەنە دەبێتەوە کە نەبوونی ئەرشیڤ و نەبوونی کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەن بەتەواویی، بۆیە ئەم نامەیەش لە سەرەتادا بێبەش نەبووە لەم گرفتەو دوای هەوڵێکی زۆرو گەڕان بەچەندین کتێبخانەی گشتیی و تایبەتیی و ئەرشیڤە کەسییەکاندا، توانراوە ئەوەی پێویستە دەستبخرێت.

## ٤/٠ هۆی هەڵبژاردنی نامەکە:

"ژیانو ژین" بەقۆناغێکی بایەخداری مێژوی ڕۆژنامەنوسیی کوردیی و ئەدەبی هاوچەرخی کوردیی دەژمێررێت، پیرەمێردیش وەك کەسێکی ئەزمونگەر توانیویەتی بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردیی دەربکات، لەلایەك تائەمڕۆ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت بە تایبەتی لەسەر قۆناغی "ژیانو ژین"ی "پیرەمێرد" نەنوسراوە، لەلایەکی تریشەوە بایەخێکی وەك ئەوەی پێویستە بەخودی پیرەمێردیش نەدراوە، جگە لەوەی ئەم ڕۆژنامەیە بابەتگەلێکی وەهامان دەداتێ کە وردترو ڕاستگۆیانەتر مێژوو هونەرەکانی ئەدەبو ڕۆژنامەنوسیی کوردیی تۆماربکەین، ئەم ڕۆژنامەیە کە دواجار دەبێتە ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆ، بۆ ئەمڕۆی کوردستانی دوای دیکتاتۆرییەت گرنگە، بەتایبەتی بۆ ئەوەی نەوەی نوێ بەئاگاییەوە بڕوانێتە ڕابردوی ڕۆژنامەگەریی خۆی، ئەم نامەیە خستنەڕوی پێشخانێکی کەلتوریی و هونەریی و ئەزمونیی ڕۆژنامەنوسیی کوردییە، بۆ ئەمڕۆو ئایندەیش.

## ٥/٠ ئامانجی نامەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە هەوڵی گەڕاندایە بەدوای دۆزینەوەو یەکلاکردنەوەی زانیارییەکانی دەرچوونو چۆنێتی بەڕێوەچوونو بەکاربردنی هونەرە ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسییەکانو ، پێوانەکردنێکە لە نێوان ئەدەبو ڕۆژنامەنوسیی جیهانیی و ئەدەبو ڕۆژنامەنوسیی ئەو قۆناغەدا، کە قۆناغێکی گرنگی گەڵاڵەبونی ڕەوتی ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسیی کوردییە. دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان کەسو بابەت، ئەدەبو ڕۆژنامە، تێکەڵاوبوونو لێکجیابونەوەی چەشنو جۆرو ژانرەکانەو، گەڕانە بەدوای دیوی ناوەوەی ئەم پرۆسەیەدا کە تا ئەمڕۆش زۆر لایەنی گرنگی بەنادیاریی ماونەتەوەوئەم لێکۆڵینەوەیە بەئامانجی خۆی زانیوە بەرجەستەیانبکات. بە ئارستەیەکی تریشدا ئەرکی دۆزینەوەی هەموو ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەی لەو قۆناغەدا بەهێند وەرگرتووە.

## ٠/٦ پرسیارو گریمانەکانی نامەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە بەدوای وەڵامدانەوەی پرسیارگەلێکدا دەگەڕێت، لەوانە: چەشنە ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسییەکان چین؟ چۆن دروستدەبن و چۆن گەشەدەکەن و چۆن لاوازدەبن؟ پەیوەندیی چەشنە ئەدەبییەکان بەجۆری کۆمەڵگا مرۆییەکانەوە چییە؟ پەیوەندیی لە نێوان ئەدەب و ڕۆژنامەنوسییدا چییە؟ تێڕوانینە خودیی و بابەتییەکان چی لەیەکیان جیادەکاتەوەو چی بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە؟ "ژیان و ژین" چین؟ "پیرەمێرد" کێیە؟ پەیوەندیی کەسی پیرەمێرد بەم ڕۆژنامەیەوەو دواتر بەچەشنە ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسییەکانەوە چییە؟ "ژیان و ژین" چۆن دەرچوون، هەڵەکانیان کامانەن، ئاستەنگ و لایەنە گەشەکانیان لە کوێدا دەبینرێنەوەو...تاد؟.

## ٠/٧ سنوری نامەکە:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنها قۆناغیڕۆژنامەنوسیی و ئەدەبیی "پیرەمێرد"ی "ژیان و ژین"مان وەرگرتووە کە دەکەوێتە نێوان (١٩٣٢/٥/٩بۆ ١٩٥٠/٦/١٥)، بۆیە لە ژمارە (٣٢١-١٠١٥) بەپلەی یەکەم بۆتە سنورو چێوەی نامەکەمان، بەڵام بۆ سەلماندن و دەرخستنی ئەم سنورە زۆرجار ناچاربوین بۆ پێش ئەم قۆناغەو دوای ئەم قۆناغەو بۆ ڕەوتی ڕۆژنامەگەریی تەریب بەخودی قۆناغەکەیش بگەڕێینەوە.

## ٠/٨ ڕێبازی لێکۆڵینەوەی نامەکە:

لەم نامەیەدا ڕێبازی شیکردنەوەی پەسەنکەرانەمان پەیڕەوکردووە، لەلایەك بۆ ناساندن و خستنە ڕوی کەرەستەکان، لەلایەکی تر بۆ شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی بابەتەکان.

## ٩/٠ کەرەستەی نامەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە بابەتو لاپەڕەکانی (٦٩٥) ژمارەی "ژیانو ژین"و (٢٩٤٨) لاپەڕەی ئەم ژمارانەو هەزاران بابەتی ناو ئەم ڕۆژنامەیەی کردۆتە کەرەستەی پراکتیکیی خۆی، ئەمە جگە لەو هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارو بابەتانەی کە بۆ یەکلایکردنەوەی بابەتەکانی ئەم نامەیە سودیان لێوەرگیراوە.

لە ڕووە تیۆرییەکەیشییەوە، چەشنە ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسییەکانی ناو ئەدەبو ڕۆژنامەنوسیی جیهانیی و کوردیی بەهێند وەرگرتووە. لەگەڵ ئەمانەدا دەستنوسگەلێکی پیرەمێردمان دەستخستووە کە بۆیەکەمجارە لە لێکۆڵینەوەیەکی وادا وەك کەرەستەی لێکۆڵینەوە بەکاردەبرێن.

## ١٠/٠ ئەو بابەتانەی پێشتر لەم بوارەدا نوسراون:

تا ئەمڕۆ لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەسەر "ژیانو ژین"ی ئەم قۆناغە نەنوسراوە، ئەوانەی هەن زیاتر خۆیان یان لە مێژووی ڕۆژنامەنوسیی یان لە بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەنوسییدا دەبیننەوە، ئەوانەیش بریتین:

- عەلائەدین سەجادی، یادی پیرەمێرد، ١٩٥١.
- محەمەد ڕەسوڵ هاوار، پیرەمێردی نەمر، ١٩٧٠.
- سەعید ناکام، چەند بیرەوەرییەك لە ڕۆژانی ئیشکردنم لەگەڵ پیرەمێردی نەمردا، ڕۆژنامەی "برایەتی"ساڵی ١، خولی دووەم، ژ٢، تەموزی ١٩٧٠.
- عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٩٥٢، ١٩٧١.
- جەمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی، ١٩٧٣.
- کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی، بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەکان، ١٩٧٨.
- مستەفا نەریمان، فەرهەنگی ئەدیبو نووسەرانی کورد، ١٩٨٤.
- مەلا عەبدوڵای زێوەر، گەنجینەی مەردانو یادگاری ڕۆژانی دەربەدەری، ١٩٨٥.

- حەمەسالّح فەرهادی، چەند لایەنێکی ڕۆژنامەنوسی کوردی، ١٩٨٨.
- س. ع. شادمان، ئاهەنگی بیستەمین ساڵەی ڕۆژنامەی ژین چۆن کرا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٦٣)، ئازارو نیسانی ١٩٨٨.
- کەمال ڕەووف محەمەد، "ڕۆژنامەی ژیان"ڕۆژنامەی ئاسۆ، ژمارە (٣٢)، ١٩٩٠/٢/٣.
- دیوانی پیرەمێرد، بەرگی یەکەم، ١٩٩٠.
- محەمەدی مەلا کەریم، بیری کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری پیرەمێرد، ١٩٩٢.
- ئومێدئاشنا، پیرەمێردی ڕۆژنامەنووس، ١٩٩٨.
- وریا جاف، کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردی، ١٩٩٨.
- معروف خەزنەدار، موجز تأریخ الادب الکردی المعاصر، ٢٠٠٠.
- ئومێدئاشنا، پیرەمێردو پێداچونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم، ٢٠٠١.
- فاروق عەلی عومەر، ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عیراقدا، ٢٠٠١.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی (١٩٢٦-١٩٣٨)، ٢٠٠٢.
- جەبارجەباری، کۆی بەرهەمە کوردییەکانی نوسەر، ٢٠٠٢.
- ڕەفیق ساڵح، بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەنوسیی کوردیی لەشاری سلێمانی ١٩٢٠-١٩٩٠، ٢٠٠٢.
- ڕەفیق ساڵح-سدیق ساڵح، ژیان (٣٢١-٤٠٠)، ٢٠٠٥.

لەمانە (ئومێد ئاشنا، نەوشیروان مستەفا، سدیق ساڵح) هەوڵیانداوە بچنە دیوی ناوەوەی مێژو و بابەتەکانەوە بۆیە بابەتەکانیان هەرچەندە نەبۆتە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت و سەربەخۆ بەم قۆناغە، بەلام قوڵییەکی زیاتریان تێدا بەدیدەکرێت.

## ۱۱/۰ بەشەکانی نامەکە:

نامەکە لە پێشەکیی و چواربەش و ئەنجام و سێ پاشکۆ پێکهاتووە:

بەشی یەکەم: ئەم بەشە بۆ لێکدانەوەی چەمکی ئەدەب و چەشنە ئەدەبییەکان و پۆلبەندکردنیان لەسەر بنەمای شیعرو پەخشان، تەرخانکراوە.

بەشی دووەم: بۆ لێکدانەوەی چەمکی ڕۆژنامەنوسیی و چەشنە ڕۆژنامەنوسییەکان و پۆلبەندکردنیان لەسەر بنەمای خودیی و بابەتیی تەرخانکراوە.

بەشی سێیەم: بۆ پەیوەندیی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی تەرخانکراوەو تیایدا تایبەتمەندییەکانی هەر بوارێکیان و چۆنێتیی جیاکردنەوەیان و گەشەکردنیان و پیرەمێرد وەك ئەدیبێکی ڕۆژنامەنوس و "ژیان و ژین" وەك ڕۆژنامەیەکی تێکەڵاوی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی لێیان کۆڵراوەتەوە.

بەشی چوارەم: بۆ ڕەهەندەکانی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی تەرخانکراوە، تیایدا لە چەشنەکانی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی لە "ژیان و ژین" و لە چەشن و جۆرو هونەرە بەکارهاتووەکانی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی لەم ڕۆژنامەیەدا کۆڵراوەتەوە.

ئەو ئەنجامانەیشی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەدەستهاتوون، لە کۆتاییدا دەخرێنەڕوو.

پاشکۆی یەکەم: کە پاشکۆی ( أ)ە، بۆ ژمارەیەك لە ئۆریژناڵەکان دانراوە.

پاشکۆی دووەم: کە پاشکۆی (ب)ە، بۆ دەستنوسەکان تەرخانکراوە.

پاشکۆی سێیەم: کە پاشکۆی (پ)ە، بۆ خشتەیەکی تایبەت بە هەموو ژمارەکانی(۳۲۱-۱۰۱۵) دیاریکراوە.

## ١/١) چەمکی ئەدەب

لێکۆڵینەوە لە چەمکی ئەدەب، لێکۆڵینەوەیە لەو هەموو بەرهەموسەردەمو کەس‌و بابەت‌و ڕێبازو تیۆرە ئەدەبییە جیاجیایانەی کە هەندێکیان لەبەرامبەر ئەوانی تردا، نەك تەنها جیاوازیگەلێکی تەواویان هەیە، بەڵکو ناکۆکیی‌و دژیەکیشیان دەربارەی خودی ئەم چەمکە هەیە، کەواتە مەبەست لە شیکردنەوەی چەمکی ئەدەب، ناکاتە ئەو ئامانجەی کە دواجار پێناسەیەکی تەواوو یەکگرتوو بۆ ئەدەب دابنێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە "ئەدەب" چالاکییەکی بەهاداری کایەمرۆڤایەتییەکانە، سروشتی ئەم جۆرە بوارانەش وەهایە، کە تێڕوانینی کەسێك لە شوێنێکی دیاریکراوداو لە سەردەمێکی دیاریکراودا بۆ چەمکێکی دیاریکراو، جودایە لە تێڕوانینی کەسێکی دی بۆ هەمان چەمك با لەهەمان کات‌و شوێنیشدا بێت، ئینجا ئەمە ئەگەر بۆ زانستەکانی وەك: (مێژوو، جوگرافیا، کۆمەڵناسیی، زمان، ڕاگەیاندن، ئابوریی، یاسا،...هتد)، ڕاستبێت، ئەوا بۆ ئەدەب ڕاستتردەبێت، چونکە ئەدەب خۆی بۆخۆی لە بنەڕەتدا پرۆسەیەکی داهێنەرانەی تاکەکەسییە.

ئەمەش بەو مانایەدێت، کە ئاسان نییە ئێمە بگەینە پێناسەیەکی چەسپاو، بۆ دیاردەیەکی گۆڕاوی وەك ئەدەب، کە زۆرجار بەر لەگەشەی مرۆڤەکانیش گەشەدەکات، بۆیە ئەرکی ئێمە لێرەدا، خستنەڕووی دیدە جیاوازەکانە لەسەر هەمان چەمك، بۆ ئەوەی بەهەموویان وێنایەکی زانستییانە بنیاتبنێین کە لێیەوە پەیکەری ئەدەب لە تێڕوانینێکی شاراوەی نا بەرجەستەوە، بکەینە کەرەستەیەکی ئاشکرا بۆ لێکۆڵینەوە، (( دەشێ لێدوان لە بەرهەمێکی ئەدەبیی ئاسان بێت، بەڵام کاتێك بەدوای ئەوەدا دەگەڕێین کە ئەو شتانە چین ئەدەب لە بوارەکانی تر جیادەکەنەوە، یان ئەوە چییە وا لە کارێکی ئەدەبیی دەکات ببێتە کارێکی ئەدەبیی، ...ئەوا لێرەدا دووچاری ئاستەنگ‌و گرفتی زۆر دەبینەوە، چونکە ئەم پرسیارانە هەرچەندە لە شێوەیاندا ئاسانن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا سەخت‌و

دڕوارن))[1]. ڕۆجەر فولەریش، دەڵێت: ((پرسیارکردنی بەلاغییانە دەربارەی ئەوەی "ئەدەب چییە؟" زۆر بەڕونیی ئەو مانایە دەگەیەنێ کە قەوارەیەك هەیە ناوی ئەدەبە، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەوەش دەگەیەنێ کە پێناسەکردن‌و دەستنیشانکردنی ئەو قەوارەیە بێکێشەنییە))[2].

مێژووی ئەدەب وابەستەی مێژووی شیعرە، یان ئەدەب درێژکراوەی گەشەی ئۆرگانیی شیعرە، ئەم چەمکە لە سوکراتەوە دێت تا ئەو کاتەی ئەدەب دێتەکایەوەو شیعر دەکاتە یەکێك لە پێکهاتە بنەڕەتییەکانی خۆی (( داخۆ ئەدەب چییە؟ ئەو گوتارەش کە لەم بابەتە دەدوا لە کەلەپوری ڕەخنەییدا پێیدەوترا "هونەری شیعر"، بەڵام هەنوکە بە "تیۆری ئەدەب" پێناسەدەکرێ... لە سەدەی نۆزدە بە دواوە ئەدەب بەتەواوی جێی شیعری گرتەوە))[3].

لێرەوە، هەندێك جار "ئەدەب" وەك ڕەچەڵەك دەبرێتەوە سەر "فەلسەفە"، لانی کەم بەو بەهانەیەی کە بەشێکی زۆر لە ئەرگومێنتەکانی ئیفلاتۆن لە بەرهەمە دیارەکانی وەك ( ئایۆن، کۆمار، یاساکان)[4]داو دواتر ئەرستۆش لە کتێبی "شیعر" دا، کەرەستەی سەرەکییان شیعر بووە، یان بە دیدێکی تر، بەرهەمە ئەدەبییەکان، هەڵگری دوو جۆر لە واتان، کە یەکەمیان واتایەکی ڕوکەشانەیەو دووەمیان واتایەکی قوڵەو دەقەکان فرەلێکدانەوە هەڵدەگرن، کەرەستەن بۆ خوێندنەوەی جیاجیاو فرە ڕەهەند.

هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، ئیفلاتۆن (٤٢٧-٣٤٧پ.ز)، بە یەکەم بانگەشەکەری ڕاستەقینەی هونەرو ئەدەب دادەنرێت لە مێژوودا، بەدوایدا ئەرستۆ (٣٨٤-٣٢٢پ.ز) دێت، کە (( یەکەم کتێبی ڕەخنەیی لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، بەناوی "شیعر"ەوە، دادەنێت))[5]. پەیوەندیی نێوان فەلسەفەو ئەدەب، وەك پەیوەندیی

---

[1] د. شكري عزيز الماضي (١٩٨٥ : ٩).

[2] روجر فولر (١٩٩٩ : ٢٤).

[3] سەرچاوەی پێشوو ( ٢٤، ٣١ ).

[4] د. شكري عزيز الماضي (١٩٨٥ : ١٨ ).

[5] سەرچاوەی پێشوو (٣٠).

نێوان دوو بازنەی یەکتربڕ وان، بەجۆرێك لە کاتی یەکتربڕیندا، پانتاییەکی گەورە لە هەر یەکەیان تێکەڵ بەوی تریان دەبێت[٦].

تێڕوانینێکی تر ئەدەب دەباتەوە سەر زانست، بەو لێکدانەوەیەی کە (( هەر شتێك شتێك بخاتە سەر زانین، ئەوا خۆی زانستە))[٧]، یاخود ئەدەب ڕێوشوێن و تیۆرو پەیڕەوی خۆی هەیە، کەدەشێ پێوەری هاوبەش بۆ پێوانەکردنیان دابنرێت، ئەمەش ئەدەب دەخاتە خانەی جۆرێك لە زانستەکانەوە، کە زانستەمرۆڤایەتییەکانە، وردز وورس دەڵێت: (( شاعیر بە زانست و بە عاتیفە، ئیمپراتۆریەتی کۆمەڵی مرۆڤایەتیی کۆئەکاتەوە، شیعریش سەرەتا و کۆتایی هەموو زانستێکە))[٨]، ماکسیم گۆرکیش دەڵێت: (( ئەدەب زانستی ناسینی مرۆڤە))[٩].

لە دیدێکی تریشەوە، ئەدەب بەیەکێك لە هونەرە جوانەکان دەژمێررێت، کە لە ڕێی کەرەستەی وشەوە، وێنەکان دەخەملێنێت، دەقە ئەدەبییەکان بۆ ئەوەی لە دەقێکی ئاسایی جیابکرێنەوە، ئاستی دەستڕەنگینیی نووسەر لە چنینی وشەکاندا ڕۆڵدەبینێت، بۆیە "ئەدەب" هونەری وێنەکێشانی بیرە، ((ئەدەب یەکێکە لە پێنج هونەرە جوانەکان*، وێنەکێشان و پەیکەرتاشیی و سەماو مۆسیقاش چوارەکەی ترەو وەکو ئەوان کارێکی هونەریی ئەوتۆیە کە شێوەیەکی کاریگەرو جوانی دەرونی مرۆڤ دەردەبڕێ))[١٠].

ئەم تێڕوانینانەو چەندین تێڕوانینی تریش کە ئەدەب ئاوێزانی بوارە دەروونیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئایدۆلۆژیی و ....هتدەکانیش دەکەن،

---

[6] بڕوانە: محمد راتب الحلاق (٢٠٠٠ : ٢١).

[7] د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

[8] مجید محمود مطلب (١٩٧٨ : ٢٢).

[9] د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

*دیارە ئەم دابەشکردنە کۆنە، چونکە (شانۆو سینەما)ش دەچنە خانەی هونەرەجوانەکانەوە، هەر ئەمەشە کە بە هونەری سینەما دەوترێت: هونەری حەوتەم.

[10] میشال عاصي (١٩٧٠ : ٧٤).

هەموو ڕاستن بەمەرجێك بە لەیەكدابڕاویی وەرنەگیرێن، بەڵكو پێكەوە ئەو ڕاستەقینەیە تەواودەكەن كە هیچ بوارێكی ژیانی مرۆڤایەتیی بێ بوارەكانی تر هەڵناكات و گەشە ناكات و نوێ نابێتەوە، بۆ نموونە: ئەدەب لە فەلسەفەوە دورنییە، لەو ڕوانگەیەی ئەدەب لەسەر تەوەری سەرەكیی "ئیستاتیكا" دەوەستێت، ئیستاتیكاش دەچێتە دەرونی فەلسەفەوە، هەروەها ئەدەب بەپێی بنەماگەلێكی پەیڕەوبەندانە كاردەكات، بۆیە لە زانستیش دورناكەوێتەوە، هەموو ئەمانەش هونەرمەندانە بە ئەزمونێكی هونەرییانە، دەكرێنە بەرهەمێكی ئەدەبیی، بۆیە لە هونەرە جوانەكانیش ناچێتە دەرەوە، كەواتە ئەدەب بەرجەستەبووی كۆكردنەوەو لێكدانی زانستگەلێكی وەك: سایكۆلۆژیی و سۆسیۆلۆژیی و سیاسیی و ئایدۆلۆژیی و دواتر فەلسەفەو هونەرە جوانەكانە، بەم شێوەیە:

فەلسەفە + هونەرەجوانەكان + ئەزمون و توانستی هونەرییانە + زانست = ئەدەب

زاراوەی "ئەدەب" لە بەرامبەر زاراوەی (Literature*)ی ئینگلیزییدا دێت، ئەم وشەیەش لە وشەی (littera)ی لاتینییەوە وەرگیراوە"[11]، دەركەوتنی وشەی ئەدەب لە زمانی ئینگلیزییدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەیەم، بەڵام مانای ئیستاتیكیی زاراوەی ئەدەب لە بنەڕەتدا، لە هەردوو سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا بەكارهاتووە، ئەدەب لە كۆتایی چاخەكانی ناوەڕاست بەدواوە، بۆتە كاڵایەكی كولتوریی وەها كە هەر كەسێكی بە ئاگا لە نووسین و كتێب و زمانەكان قۆرخی كردووە بۆ خۆی، هەمیشە وەك شتێكی بەنرخ و ناوازەش تەماشاكراوە"[12]. ((بەكارهێنانە بەراییەكانی زاراوەی ئەدەب بەگشتی ئاماژەیان بۆ خوێندن و

---

*ئەم زاراوەیە لە عەرەبیدا بە " الأدب" و لە فەرەنسیدا بە"Litterature" و لە ئەڵمانیدا بە "Litera" و لە ئیتاڵییدا بە "Lite" و لە ئیسپانییدا بە"Litera " دێت. بڕوانە: Euro Dictionary(2005 : Literature).

[11] بڕوانە: فەرهەنگی Britannica، ( ١٩٧٤ : كینیث Rexroth ).

[12] بڕوانە: روجر فولر (١٩٩٩ : ٣٢-٣٣ ).

شارەزایی پەیداکردن لە کتێبدا دەکرد، دور لەو تایبەتمەندییە مۆدێرنەی کە لە مانای خەیاڵیی و ئەفرێنەرانەی "ئەدەب"دا هەیە))[١٣].

هەندێك لەڕێی ئامڕازەکانییەوە دەیناسێنن، بۆیە "ئەدەب" ((بەهونەرێکی زمانەوانیی، یان زمانی ئەندێشە، یان کیانێکی زمانیی، یان جەستەیەکی زمانیی، یان بەکۆمەڵە ڕستەیەك دادەنێن))[١٤]، هەندێکی تر بە فۆڕمێکی جوانیی تەواو، یان کارێکی هونەریی پەتیی، یان سیستمێك لە هێماو واتا کە دەق بەرهەمیان دەهێنێتو لە ناو دەقدا دەژینو هیچ پەیوەندییەکیان بە دەرەوەی دەقەوە نییە، دادەنێت[١٥]، یان گوزارشتکردنێکە بەوشە بۆ هەڵوێست وەرگرتنی ئەدیب لە جیهانو دەوروبەری خۆی، یان ئامڕازێکی گوزارشتکردنی چینایەتییە، یان داڕشتنێکی زمانییە بۆ ئەزمونگەلێکی مرۆیی قوڵ، یاخود بەکارهێنانێکی تایبەتمەندانەی زمانە بۆ بەدیهێنانی ئاستێکی دیاریکراو[١٦].

فەرهەنگی ئەدەبناسیی ڕوسیی، دەربارەی ئەدەب، دەڵێت: (( ئەدەب بریتیە لە هونەری وشە، نوسراوبێت یاخود نە نوسراو، کەپەیوەندیی بەبەرهەمی خوڵقێنەری سەرزارییەوە هەبێت، کە فۆلکلۆرە...)) [١٧]، (ئەمرسن) دەڵێت: ( ئەدەب تۆماری بیری پەسەندە)[١٨].

لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرددا " ئەدەب" بەمانە دەوترێت:

١. ا. ئەو نوسینانەی کە بەهادارن، وەك بەرهەمێکی هونەریی، بەتایبەتیی داهێنانی کەسو ڕووداوەکان، دراماو شیعر، ( وەك پێچەوانەیەك بۆ کتێبە تەکنیکییو ڕۆژنامەگەرییەکان).

---

[13] ڕۆجەر فۆلەر: ( www.sardam.info/sardam/37/06.htm).

[14] د. شكري عزيز الماضي (١٩٨٥ : ١٠).

[15] بڕوانە: سەرچاوە پێشوو.

[16] بڕوانە: سەرچاوە پێشوو( ١١ ).

[17] د. شوکریە ڕسول: (١٩٨٩: ٧).

[18] سەرچاوە پێشوو( ٨).

ب. چالاکیی نووسین یاخود خوێندنی بابەتە ئەدەبییەکان، وەك پلەی خوێندنی فلان لە لیتریچەی ئەمریکییدا.

پ. نووسینە ئەدەبییەکان لە وڵاتێکی دیاریکراو، یاخود لە ماوەیەکی تایبەتدا، وەك لیتریچەی فەرەنسیی، یان لیتریچەی ئینگلیزیی لە سەدەی هەژدەیەمدا.

٢. نووسین دەربارەی بابەتێکی تایبەت، وەك: هەموو ئەو ئەدەبەم خوێندۆتەوە کە دەربارەی کشتیاریی لەبەردەستدایە.

٣. نامیلکە یاخود بڵاوکراوەی کورتو بچوك، وەك: تکایە هەرچی ئەدەبی پشووی کامپ هەیە لە ئیسپانیا(وەك نامیلکەو بڵاوکراوەی بچوك) بۆم بنێرە[١٩].

فەرهەنگی زاراوە ئەدەبییەکانیش( A Dictionary of LITERARY TERMS) ، بەم شێوەیە لە "ئەدەب" دەدوێت: (( زاراوەیەکی لێڵو تەمومژاوییە، هەمیشە ئاماژە بەو وتانە دەکات کە دەگەڕێنەوە بۆ ژانرە سەرەکییەکانی وەك: داستان، دراما، لیریك، ڕۆمان، کورتە چیرۆك، ئۆد(شیعری گۆرانی). ئەگەر وەسفی شتێك بکەین وەك لیتریچە، وەك دژیەك بۆ هەر شتێکی تر، زاراوەکە لەگەڵ خۆیدا ئاوەڵواتای چۆنێتیی هەڵگرتووە، کە لە نێو خۆیدا ئەوە دەگرێتەوە، کە ئەوەی باسی دەکرێت خەسڵەتگەلی باڵاو زاڵی هەیە، واتە ئەو کارە زۆر لە سەروی کارە نووسراوە ئاساییەکانەوەیە، بۆ نموونە " ڕۆمانەکانی جۆرج ئیلیۆت بریتین لە ئەدەب، لە کاتێکدا کە کتێبەکانی فلیمینگز بۆند حاشا هەڵنەگرە کە وەهانین")) [٢٠].

(لسان العرب)یش دەنووسێت: (( ئەدەب بانگکردنی خەڵکە بۆ خوانێك، خواردن چێژی تیایە، ئەدەبیش هەروەها)) [٢١]، فەرهەنگی زاراوەکانی ڕاگەیاندنیش( DICTIONARY OF MASS COMMUNICATION

---

[19] OXFORD ADVANCED LEARNER`S DICTIONARY: (1989 : 728).
[20] J. A. Cuddon (1984 : 366).
[21] لسان العرب (بلا: أدب).

TERMS)، ئەدەب بە کۆمەڵە ئاسەوارێکی پەخشانیی یان شیعریی، ناوازەی جوانی فۆرم یان داڕشتن و بارکراو بە کرۆکێکی بەهاداری نەمر دەوترێت[22]، کتێبی (مذاهب الأدب الغربي)، " ئەدەب" بەبەشێك لە مێژووی زمان دادەنێت و دەنووسێت: ((کاری ئەدەبیی، بونیاتێکی زمانییەو زۆرترین توانستەکانی زمانیش بەکاردەبات))[23]. فەرهەنگی( Collins Dictionary of the English Languge,1986)یش دەنووسێت: (( ئەدەب: ١. بەرهەمێکی دیاریکراوە لە ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراودا، یان لە ڕۆشنبیریی میللەتێك لە میللەتەکاندا: ئەدەبی ئەسکەندەناڤی وەك نمونە. ٢. بابەتێکی تۆمارکراوە وەك شیعر، ڕۆمان، وتارو...تاد، بەتایبەتیش ئەو کارە ئەندێشەییانەی کە جۆرێك لە شێوازو گوزارشتی باڵایان تێدایەو ئەو بابەتە گشتییانەش لە خۆدەگرێت کە دەمێننەوە. ٣. بابەتێکی تۆمارکراوە، یان بە شێوەیەك لە شێوەکان چاپکراوە دەربارەی پرسێکی دیاریکراو: بابەتی زانستیی، ئەدەبی ئامێری کەمانچە. ٤. بابەتێکی چاپکراوە بەمەبەستی پیشاندانی چەند زانیارییەك: پامفلێت. ٥. هونەر ، یان پیشەی نووسین. ٦. فێرکردن ( واتایەکی کۆنە).))[24]، فەرهەنگی ( Oxford English Dictionary,1971)یش دەربارەی لێکدانەوەی زاراوەی" ئەدەب" ، دەنووسێت: ((١. شارەزایی پەیداکردنە لە نووسین و کتێبدا، فێربوونی ڕەفتاری جوان و بەرهەمی هزری مرۆڤ و ڕۆشنبیریی ئەدەبییە. ٢. کار یان بەرهەمی ئەدەبییە، چالاکیی و پیشەی ئەدیب و جیهانی نووسینە. ٣.أ. بەرهەمی ئەدەبە بە گشتیی: ئەو بەرهەمەی لە وڵاتێکی دیاریکراو، یان لە سەردەمێکی تایبەتدا ، یان لە جیهاندا بە شێوەیەکی گشتیی نووسراوە، بە مانایەکی ڕونتر لە نووسیندا دەردەکەوێت بە لە بەرچاوگرتنی بنەمای جوانیی داڕشتن و کاریگەریی سۆزدارییانە. ب. کۆی ئەو کتێب و بەرهەمە نووسراوانەیە کە دەربارەی بابەتێکی

---

22 PROF. KARAM SHALABI( 1994 : 570).

23 د. سالم أحمد الحمداني (١٩٨٩ : ١٥).

24 روجر فولر (١٩٩٩ : ٣٢).

دیاریکراو نووسراون. پ. بڵاوکراوەیەکی چاپکراوە بۆ هەر مەبەستێك بێت))[٢٥].
یان دەوترێت "ئەدەب" نووسینێکی ئەندێشەئامێزە، بەو واتایەی گوزارشتێکی ڕاستەقینانەی ڕاستگۆیانە نییە لە بیرەکان، بەڵکو هەر بیرێك لە ئەدەبدا بە ئەندێشەیەکی قوڵ زاخاودراوەتەوە[٢٦]. لە فەرهەنگی (EasyLingo)یشدا ئەدەب بە ((پیشەسازیی ئەدەبو بەرهەمو پرۆفێشناڵێتیی ئەدەبیی، یان کۆمەڵەکارێکی ئەدەبیی دیار، یان کۆمەڵە شتێك کە دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو نووسرابن، یان مادەیەکی چاپکراو))[٢٧] باسدەکات.
لە کتێبی(النص و الممانعة)دا هاتووە: (( ئەدەب گوزارشتکردنە لە بیری ئومەتو ژیانو بەهاکانیانو بە گوزارشتکردنێکی مێژوویی پێشکەوتووانە دەژمێررێت، درەوشاوەیە بە شێوەگەلی جۆراوجۆرو نوێ و گەوهەردارە بە ناوەڕۆکگەلێکی گۆڕاو))[٢٨].لە فەرهەنگی (Wikipedia)یشدا، ئەدەب بەمجۆرە ناسێنراوە: (( ئەدەب یەکێکە لە شێوەکانی گوزارشتکردنی مرۆیی لە هەموو ئەو سۆزو بیرو هەژانو هەڵچوونە مرۆییانەی کە بە شێوەیەکی باڵای نووسین، بە شیعر بێت، یان پەخشان، دەردەبڕرێت، بەمەش دەروازەیەك بۆ مرۆڤ دەکاتەوە تا بتوانێت توانستی گوزارشتکردنی هەبێت لە هەر شتێك کە ناتوانێت بەم ڕێگایە زیاتر، گوزارشتی لێبکات. ئەدەب پەیوەندییەکی توندی بەزمانەوە هەیە، نەك هەر ئەوە بەڵکو بەرهەمی ڕاستەقینەی زمانێکی نووسراوو ڕۆشنبیرییەکی تۆمارکراوە))[٢٩].
بەراوردکاری ئەمریکایی (هنری ریماك) دەربارەی مێژووی ئەدەب دەڵێت: ((مێژووی ڕاستەقینەی ئەدەب ناتوانێ مێژووە هاوتەریبەکانی تری داهێنانی هونەریی فەرامۆش بکات، بۆیە ناکرێت مێژووی ئایینەکان، سیستمە فیکرییەکان، ئەخلاق، مومارەسە ڕۆشنبیرییەکان، لە ئەدەب دابڕین، بۆیە

---

25 سەرچاوەی پێشوو.

26 بڕوانە: تیری إیجلیتون(١٩٩٧ : ٨).

27 www.easylingo.org (2006).

28 محمد راتب الحلاق (٢٠٠٠ : ٢١).

29 www.wikipedia.org/wiki (2006)

پەیوەندیی نێوان ئەدەبو بوارە مەعریفییەکانی تر، یان بیروباوەڕەکانی تری وەك هونەرەکانی وێنەکێشان، پەیکەرتاشیی، تەلارسازیی، مۆسیقا، فەلسەفە، مێژوو، زانستەکۆمەڵایەتییەکان، ئایینەکان،...تاد، پێکەوە گەشەدەکەنو ڕووبەڕووی یەکتر نابنەوە))[٣٠]، (رینیە ویلیك)یش لە کتێبەکەیدا (تیۆری ئەدەب) پێی وایە، هەر هونەرێك لە هونەرەکان گەشەکردنێکی تایبەتیی خۆی هەیە و وابەستەی ڕیتمو بونیاتی ناوەکیی تایبەتیی خۆیانن[٣١].

ئەوەی گرنگە هەر هونەرێك بە تایبەتمەندیی جیاکارییانەی خۆی گەشەدەکات، بەڵام دواجار لە بونیاتێکی گشتگیردا پەیوەندییەکی گەشەکردووانەی تەواوکارییانە لەگەڵ هونەرەکانی تردا پێکدەهێنێت، (مەدام دی ستاڵ) دەڵێت: ئەدەب بەهرەیەکی تایبەتییە کە نووسەرێك یان شاعیرێك واتە تاکەکەسێك دەیهێنێتەدی، لەبەر ئەوە نابێت سنورێکی بنجبڕ دابنرێت بۆ سەوداو ڕوخسارو ئامانجەکانی، هەر ئەو دەڵێت: ئەدەب بەپێی ئاووهەوای کۆمەڵایەتیی دەگۆڕێت[٣٢]، (د. علی المصری) دەڵێت: (( ئەدەب چالاکییەکی داهێنەرانەیە، خاوەنی چۆنێتییەکی تایبەتییو باڵایە بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی بوونی مرۆیی، بە شێوەیەکی ڕیشەییو گشتگیرانە))[٣٣]، (د. محمد مندور)یش دەڵێت: ((مەبەست لە ئەدەب لای ئەورووپییەکان، هەر شتێکە کە بەهۆی تایبەتییەکانی داڕشتنی لایەنە جوانکارییەکەیەوە، یان بەهۆی هەڵچوونەکانی سۆزەوە، یان هەردووکیان پێکەوە، بمانبزوێنێت))[٣٤]. (د. عبدالعزیز عتیق)یش ڕای وایە: ((ئەدەب پرۆسەیەکی خوڵقاندنو داهێنانە...، وابەستەییەکی تەواوو ڕاستەوخۆی بە سروشتەوە هەیەو گوزارشتکردنێکی خودییانەیە لەو شتانەی ئەدیب درکیان

---

[30] دانییل– هنری باجو (١٩٩٧ :٢٢٣).

[31] سەرچاوەی پێشوو.

[32] بڕوانە: د. إحسان فؤاد (٢٠٠٠ : ١٣٥–١٣٦).

[33] د. علي المصري (١٩٩٨ : ٢٧).

[34] د. محمد مندور (١٩٧٤ : ٤).

پێدەکات))[٣٥]، (د.عیزەدین مستەفا ڕەسول)یش "ئەدەب" بە بینینی واقیع بە چاوی زات، باسدەکات[٣٦]، (عەلادین سەجادی)یش دەڵێت (( ئەدەب: بەجۆرێکی تایبەتیی ناوە بۆ ئەو کۆمەڵە زانینانەی کە هۆنراوەو- نووسینی جوان و هونەری نایابو مۆسیقای دڵ ڕفێنو پیشەی قەشەنگ ئەگرێتەوە))[٣٧].
بەدوای ئەم لێکدانەوانەدا، پۆلێنکردنی ئەدەب دێتەکایەوەو دابەشدەبێت بەسەر دوو بواری سەرەکییدا، کە بریتین لە: داهێنانی ئەدەبیی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی.

## ١/١-١) داهێنانی ئەدەبیی

داهێنانی ئەدەبیی، وابەستەی کاری ئەدەبیی دەبێتو خۆی لەو بەرهەمەدا دەبینێتەوە، کە بێژەرێك یان نووسەرێك دەیهێنێتە بوون، وەك: شیعر، چیرۆك، ڕۆمان،...تاد، (( دابەشکردنێکی سەرەکیی ئەدەب ئەوەیە کە ئەدەب دەکات بە دوو جۆر، ئەدەبی داهێنانو ئەدەبی لێکۆڵینەوە، داهێنانەکە ئەوە دەگرێتەوە کە بەرهەمی بیرو هەستو سۆزو ئەندێشەو شێوازی داڕشتنی تایبەتیەو، نووسەر لە نەبوونەوە دروستی دەکات))[٣٨]، دەشێت بەرهەمی ئەدەبیی داهێنەرانە، گۆڕین، وەرگێڕانیش بە لقەکانی ئەم داهێنانە ئەدەبییە بزانرێت، لەبەر مەبنای بەرهەمی ئەدەبییشدا دەتوانین دابەشکردنێك بۆ داهێنانی ئەدەبیی بکەین، بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

[35] د. عبدالعزیز عتیق (١٩٧٤ : ٩).
[36] د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).
[37] علاءدین سجادی (١٩٧١ : ٩).
[38] د. عەزیز گەردی، پێشەکیی کتێبی "جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا"، ئیدریس عەبدوڵڵا(٢٠٠٣: ٣).

١. ئەدەبی فۆلکلۆریی: ئەو بەرهەمە خوڵقێنەرانەیە کە دەماودەم و پشتاوپشت، کوڕ لە باوکەوە*، مناڵ لە دایکەوە دەیبستێ و دەمێنێتەوە، بۆیە بە بەرهەمی تاقەکەسێك دانانرێت و دەدرێتە پاڵ هەموو میللەت و بە بەرهەمی خوڵقێنەرانەی گەل دەناسرێت[٣٩].

٢. ئەدەبی میللیی: بەرهەمێکی ئەدەبییە، بە زمانێکی سادەو ساکاری میللییانە دەنووسرێت، گوزارشت لە کات و سەردەم و رووداوەکانی خۆی دەکات و خاوەنێکی ڕاستەقینەو دیاری هەیەو باس لە ژیانی کۆمەڵایەتیی دەکات و پڕیەتی لە زانست و ڕۆشنبیریی میللیی کە دەبنە مێژووی پەیدابوونی ئەدەبە جدییەکانی تر[٤٠].

٣. ئەدەبی کلاسیکیی: بەرهەمگەلێکی ئەدەبیی هونەرییانەیە، کە بە ڕەچاوکردنی بنەما هونەریی و جوانکاریی و ڕەوانبێژییەکان و بە زمانێکی باڵا دەنووسرێت و دەکەوێتە نێوان ئەدەبی میللیی و ئەدەبی هاوچەرخەوە.

٤. ئەدەبی هاوچەرخ: بەو بەرهەمە ئەدەبییانە دەڵێن کە هاوزەمانی سەردەم یان چەرخەکانن، لە ئەدەبی زۆربەی گەلاندا بە قۆناغە ئەدەبییەکانی دوای قۆناغی کلاسیکیی دادەنرێت، کە تیایدا ئەدەب لە کایە گشتییەکەیەوە بۆ ئەدەبی نەتەوەیی دەچێت.

٥. ئەدەبی نوێ: ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەن کە لە ئێستادا ئامادەییان هەیەو ڕەنگدانەوەی ئاستی ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتیی نەتەوە یان میللەتێکی دیاریکراون و بەتێڕوانینێکی دنیابینیی فراوانەوە دەنووسرێن.

---

* ئەم لێکدانەوەیە لێکدانەوەیەکی تەواو نییە، چونکە بەپێی کلتوری کۆمەڵگاو جیاکاریی ڕەگەزیی دەگۆڕێت و دەشێ کچانیش لە باوکەوە فێربن، وەك چۆن دەشێ کوڕانیش لە دایکەوە فێربن و بە پێچەوانەیشەوە.

[39] بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ (١٩٧٩: ٨).

[40] بڕوانە: د. کەمال مەعروف (٢٠٠٣: ١٥).

٦.   گۆڕینی ئەدەبیی: بە گۆڕینی بەرهەمێکی ئەدەبیی نەتەوەیەك یان زمانێك دەزانرێت، کە لە بەشە دیالێکتێکییەوە بگۆڕرێتە سەر بەشە دیالێکتێکی تری هەمان زمان.

٧.   وەرگێڕانی ئەدەبیی: ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەن کە لە زمانێکەوە بۆ سەر زمانێکی تر وەردەگێڕرێن و بەشێك لە کلتوری ئەدەبی جیهانیی پێکدەهێنن.

٨.   ئەدەبی منالان: بەبەشێکی تری ئەدەب دەژمێررێت و لەگەڵ جیاوازیی بیروبۆچوونەکان لەسەر ئەژمارکردنی بە بەشێك لە بەشە ئەدەبییەکان، بەڵام توانیویەتی تایبەتمەندیی و شێوەو ناوەڕۆکی خۆی بپارێزێت و هەڵگری خەسڵەتی هونەرییانەی خۆی بێت، بە جۆرێك کە بکرێت وەك بەشێکی ئەدەبیی دابنرێت، ((ئەدەبی منالْ لقێکی نوێ و تازە بابەتی وێژەیە بەبەراورد لەگەڵ ئەدەبی گەورەکاندا))[٤١]، یان دەوترێت: ئەدەبی منالْ بریتییە لە چۆنێتیی دەربڕین و دەرخستنی هەست و سۆزو بیر بەهۆی وشەوە، لە شێوەو وێنەی جیاوازدا، وەك داڕشتن و دواندن و پەخشان و هۆنراوە، بەمەبەستی پێگەیاندن و چێژو خۆشیی بەخشین بە منالْ[٤٢].

## ١/١-٢) لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی

لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی، بە ئەدەبیاتناسیش ناودەبرێت[٤٣]، ((مەبەست پێی ئەوەیە کە کەرەسە بنەڕەتییەکانی تیۆریی زانستیی پیشان بدات، ئەوە دەربخات کە تیۆری زانستیی چۆن تەماشای ئەدەبیات ئەکات و لەگەڵ زانست گونجانیا چۆن دەرئەخات و چۆن ئەو نرخەی کەرەسەکەی ئەدەبیات بە خوێندەواران

---

[41] د. فازل مەجید مەحمود (٢٠٠٤: ٤٣).

[42] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (٤٤).

[43] بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ (١٩٧٩: ٤).

ئەناسێنێ کەلە بەردەستدایە))[٤٤]، یان لێکۆڵینەوە ((ئەو شتانە دەگرێتەوە کەلە ئەدەبی داهێنان دەدوێن، واتە بریتییە لە شیکردنەوەو لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی بەرهەمی داهێنانی ئەدەبیو دۆزینەوەی یاساکانی ئەدەبو پەیوەندی ئەدەب بە ژیانو سەردەمو زانستەکانی ترەوە))[٤٥]، بەڵام ئەوەی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی زیادبکەین ئەوەیە، کە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیش خۆی بۆ خۆی "داهێنانە"و هەر ئەمیشە بەهاو ئاستی داهێنان بە بەرهەمێکی ئەدەبیی دیاریکراو دەبەخشێت، بەڵام ئەم جۆرە لە داهێنان وابەستەی خودی بەرهەمی ئەدەبیی دەبێتو بێ بوونی ئەو هیچ بوونێکی ڕاستەقینەی نابێت، بۆیە دەشێت بە داهێنانێکی وابەستەی داهێنانە ئەدەبییەکان بزانرێت.

لێکۆڵینەوەی ئەدەبیش دابەشدەبێت بەسەر سێ بنەڕەتی جیاوازدا، کە بریتین لە: (تیۆری ئەدەب، ڕەخنەی ئەدەبیی، مێژووی ئەدەب)، ئەم سێ بنەڕەتە لەگەڵ جیاوازییاندا، بەڵام هیچ یەکێکیان بێ ئەوانی تریان ناتوانێت ئەوەی مەبەستە بیهێنێتەکایەوە، چونکە بەپەیوەندییەکی ئۆرگانیی وەها پێکەوە گرێدراون، کە ئاسان نییە یەکێکیان لەوی تریان جودا بکەینەوە، ((تیۆری ئەدەب لە زۆر لە بنەڕەتو لێ کۆڵینەوەکانیدا پشت بە باشترین دەسکەوتی بیری ڕەخنەگریو شتە بەنرخەکانی لێ وردبوونەوەی ڕەخنەگری ئەبەستێ. مێژوی ئەدەب بەبێ تیۆری ئەدەب نابێو تیۆری ئەدەبیش بێ مێژوی ئەدەب نابێ، ئەم دوو پەیڕەوە زانستی یە زۆرتوند بەیەکەوە بەستراون))[٤٦]، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، گەر بمانەوێت لێکۆڵینەوەیەك لە بواری مێژووی ئەدەبی کوردییدا بنووسین، لێکۆڵینەوەکە دەربارەی شیعری کوردیی بێت، پێش هەموو شت دەبێت بزانین شیعر چییە؟ ئەو دەقانەی لەبەر دەستماندان شیعرن، یان پەخشانن،

---

[44] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو.

[45] د. عەزیز گەردی، پێشەکیی کتێبی "جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا"، ئیدریس عەبدوڵڵا(٢٠٠٣: ٣).

[46] د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ (١٩٧٩: ٦).

کەواتە پێویستمان بە زانیاریی هەیە لە بواری تیۆری ئەدەبدا، کاتێکیش دەقەکان هەڵدەسەنگێنین، ئەوا دەبێت بچینە ناو ڕەخنەی ئەدەبییەوە، ((ئەم سێ لقەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی بەجیاجیا دەبینرێن، بەڵام دابڕاونین لەیەکتریو پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە))[٤٧]. بایەخدان بەهەر یەك لەم بنەڕەتانە، بایەخدانە بەوانی تریش، چونکە بەیەکەوە پرۆسەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی تەواودەکەن، جگە لەوەی هەرسێکیان وەکویەکنو تەنها لەدوای هەبوونی کارێکی ئەدەبییەوە نەبێت، نایەنەکایەوە. (رینیه ویلیك) پێی وایە: (( زاراوەی تیۆری ئەدەب بەتەواویی تیۆری ڕەخنەی ئەدەبیی و تیۆری مێژووی ئەدەبییش دەگرێتەوە))[٤٨]. (حەنا عەبود)یش پێی وایە گواستنەوەی کۆمەڵگای مرۆیی لە کۆمەڵگای کشتوکاڵییەوە بۆ کۆمەڵگای پیشەسازیی سەرەتای دەرکەوتنی تیۆرە نوێکانی ئەدەب بوو، چونکە بیری مرۆڤی لە ڕامانەوە بۆ شیکردنەوە گواستەوە[٤٩].

## ٣-١/١) مێژووی ئەدەب

لێکۆڵینەوەیە لە بازنەی مێژوودا، یان لە ڕوانگەی مێژووییەوە لە ئەدەبو دەقی ئەدەبیی دەڕوانێت، وەك پەیوەندیی ئەدیب بە سەردەمەکەیەوە، مێژووی بەرهەمەکان، ڕادەی کاریگەریی ئەدەب لەسەر ئەو قۆناغە مێژووییەی تیایدا سەری هەڵداوە، کاریگەریی قۆناغی مێژوویی لەسەر ئەدیبو بەرهەمەکەی، باسکردن لە ژیاننامەی ئەدیب.

لێرەوە مێژووی ئەدەب دەتوانرێت بە دوو میتۆد لێیبکۆڵرێتەوە[٥٠]:

١. میتۆدی زەمەنیی، کە بەپێی کات لە ئەدەب دەکۆڵێتەوە.
٢. میتۆدی ڕوداو، کە بەپێی ڕوداو لە ئەدەب دەکۆڵێتەوە.

---

[47] د. دلشاد عەلی (٢٠٠٥: وانەکانی خوێندنی باڵا).

[48] د. سالم احمد الحمدانی (١٩٨٩ : ٩).

[49] بڕوانە: حنا عبود (١٩٩٩ : ٢٨).

[50] د. عبدالعزیز عتیق (١٩٧٤ : ١٠).

مێژووی ئەدەبیش بەگشتیی ئەم بوارانە لەخۆی دەگرێت:

١. مێژوونوسینی ئەدەبیاتناسیی.
٢. تێکستۆلۆژیا.
٣. بیبلۆگرافیا.
٤. تیۆرە مێژوییەکان.
٥. میتۆدە مێژووییەکان.

## ١/١-٤) ڕەخنەی ئەدەبیی

هەڵسەنگاندنی دەقێکی ئەدەبیی و دەرخستنی لایەنی چاکەو خراپەی ئەو بەرهەمەیە لەسەر بنەمای ئەو تێڕوانین و بۆچوون و ڕا ڕەخنەییانەی کە تاڕادەیەك چەسپاون و بۆ هەر قۆناغێکی ئەدەبیی، یان بۆ هەر چەشن و جۆرێکی ئەدەبیی سودیان لێدەبینرێت، لە بواری پراکتیکیدا لە بەر ڕۆشناییان دەقی ئەدەبیی شیدەکرێتەوەو ڕاڤەدەکرێت و هەڵدەسەنگێندرێت[٥١].

ڕەخنەی ئەدەبیی، ئەم بوارانە لەخۆ دەگرێت:

١. تیۆرە ڕەخنەییەکان.
٢. میتۆدە ڕەخنەییەکان.
٣. ئەدەبی بەراوردکاریی.
٤. هونەرە ڕەوانبێژییەکان.
٥. کێش و سەروا.
٦. ڕەخنەی پراکتیکیی.
٧. ڕاڤەکردن.

---

[51] بڕوانە: د. دڵشاد عەلی (٢٠٠٥: وانەکانی خوێندنی باڵا).

### ١/١-٥) تیۆری ئەدەب

زانستێکە لە ڕۆڵ و بایەخی کاری هونەرمەندانە دەکۆڵێتەوەو بایەخ بە ئەدەب دەدات وەك چەمك و وەك پێناسەو وەك جۆرەکانی ئەدەب و، تایبەتمەندییەکان و ڕێبازو چەشن و میتۆدە ئەدەبییەکان (( تیۆری ئەدەب زانستێکە دەربارەی جۆرو شێوەی هونەرمەندانەو ڕێگەکانی دەربڕینیان و پێش هەمووشت لە یاسا گشتییەکانی گەشەسەندنی ئەدەبیاتی هونەرمەندانەو خاسیەت و سروشتی کۆمەلایەتی و ئەرکی کۆمەلایەتی و شێوەو پەیوەندیی ئەدەبیات لەگەڵ ژیاندا دەدوێت))[٥٢].

کەواتە تیۆری ئەدەب، کۆمەڵە بیرو بۆچوونێکی بەهێزو ڕێکخراوو قوڵ و پێکەوە گرێدراوە، کە پشتبەستوو بە تیۆرییەك لە بوارێکی زانیاریی، یان فەلسەفیی دیاریکراودا کاردەکات و بایەخ بەتوێژینەوە لە گەشەو سروشت و ئەرکی ئەدەب دەدات[٥٣]:

١. گەشەی ئەدەب: دۆزینەوەی پەیوەندییە لە نێوان ئەدیب و کاری ئەدەبییدا.
٢. سروشتی ئەدەب: دەرخستنی کرۆکی بەرهەمە ئەدەبییەکانە، واتە لێکۆڵینەوەیە لە تایبەتمەندیی و سیماگشتییەکان.
٣. ئەرکی ئەدەب: دەرخستنی پەیوەندییە لە نێوان بەرهەمی ئەدەبیی و خوێنەراندا، واتە دەرخستنی کاریگەریی ئەدەبە لە وەرگرانی ئەو ئەدەبە. (حەنا عەبود) دەربارەی ئەرکی ئەدەب دەڵێت: (( ئەرکی ئەدەب پێشکەشکردنی پرسەو سەرەخۆشیی نییە، هەروەها ئەدەب بۆ ئەوە نەخوڵقاوە تا مانوبون و خواست و سەختییەکانی ژیان لەبیر خەڵك

---

52 د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ (١٩٧٩ : ٤).

53 بڕوانە: د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٥).

بباتەوە، بەڵکو ڕوبەڕوبونەوەیەکی ڕاستەقینەی کێشە مادیی و ڕۆحییەکانی مرۆڤە))[٥٤].

ئەگەر مێژو و ڕەخنەی ئەدەبیی بایەخ بەدەق بدەن بۆ ئەوەی بتوانن حوکمی لە بارەوە بدەن، ئەوا تیۆری ئەدەب لەگەڵ ئەوەدا بایەخ بە فاکتی ئەدەبیش دەدات، لێرەوە تیۆری ئەدەب دابەشدەبێت بۆ:

١. تیۆرە ئەدەبییەکان.
٢. ڕێبازە ئەدەبییەکان.
٣. چەشنە ئەدەبییەکان*.

## ١/١-٦) تیۆرە ئەدەبییەکان

ئەو تیۆرییانەن کە لە ڕێگایانەوە ئەدەب لێکدەدرێتەوە، پێشتر لە زمانە ئەوروپییەکاندا زاراوەی "زانستی ئەدەب – Literaturwissenschaft"یان بۆ بەکاردەهێنا، لە ئێستادا زاراوەی " تیۆری ئەدەب – Literary thory"بۆ بەکاردێنن[٥٥]، بەگشتیی بریتین لە[٥٦]:

**ا. تیۆری لاسایکردنەوە، لە چەرخی چوارەمی پێش زاییندا:**

ئەم تیۆرییە بە یەکەم تیۆری ئەدەب دادەنرێت، بنەماکانی لەلایەن (ئیفلاتۆن)ەوە دانراوەو دواتر (ئەرستۆ) پەرەی پێداوە، "لاسایکردنەوە" بەبنەمای کارەئەدەبییەکان دەزانێت.

ئیفلاتۆن لەم تێزەیدا لە ململانێی نێوان شیعرو فەلسەفەدا ڕووەو فەلسەفە دەڕواتو پشت بە فەلسەفەی نمونەیی(الفلسفة المثالية) دەبەستێتو

---

[54] حنا عبود (١٩٩٧ : ٨).

* لەبەر ئەوەی ئەم بوارەی تیۆری ئەدەب لە کرۆکی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەدایە، بۆیە لە پاری دووەمی ئەم بەشەدا لێیدەکۆڵینەوە.

[55] رينيه ويليك (١٩٨٧: ٨).

[56] بڕوانە: د. شكرى عزيز الماضي (١٩٨٥ : ١٧-٩٦).

لاسایکردنەوە بۆ سێ جیهان دابەشدەکات: ١. جیهانی بالاّ. ٢. جیهانی هەستپێکراو. ٣. جیهانی سێبەر. ئیفلاتۆن لاسایکردنەوە پەسەندناکاتو پێی وایە شاعیر جگە لە لاسایکەرەوەیەکی لاسایکراوەکانی جیهانی بالاّ شتێکی تر نییە.

بەدوایدا ئەرستۆ دێت، کەبە دانەری یەکەم کتێبی تیۆری ئەدەبیی دادەنرێت لە مێژووی مرۆڤایەتییدا کە بەناوی"شیعر"ەوە دایناوە، تیایدا لەگەڵ زۆرێك لە تێڕوانینەکانی ئیفلاتۆندا پێچەوانە دەبێتەوەو ئەم بنەمایانە دیاریدەکات:

١. شیعر جۆرێکە لە لاسایکردنەوەو لاسایکردنەوەش دابەشدەکات بۆ سێ جۆر:

ا. وەکو خۆی.

ب. باشتر لە خۆی.

پ. خراپتر لە خۆی.

ئەرستۆ لاسایکردنەوە پەسەندەکات، تەنها ئەو جۆرەیان نەبێت کە خراپتر لە خۆی لاسایدەکرێتەوە.

٢. بابەتی لاسایکردنەوەکە، لێرەشدا: کۆمیدیاو تراژیدیا، دیاریدەکات.

٣. سروشتی فەلسەفییانەی شیعر، لێرەدا پێی وایە ململانێ لە نێوان شیعرو فەلسەفەدا نییەو شیعر بۆ جۆرێك لە فەلسەفەگەریی دەباتەوە.

٤. گەشەی شیعرو سەرچاوەی چێژەکانی: لێرەدا شیعر بە سروشتی مرۆڤایەتییەوە دەبەستێتەوەو لاسایکردنەوەش بە غەریزەیەکی مرۆیی دەزانێت.

٥. ئەرکی شیعر: ئەرك دەبەخشێتە شیعر کە بریتییە لە پاککردنەوەی دەروون.

٦. شێوەی بالاّی لاسایکردنەوە: واتە بە کام هونەرو جۆری ئەدەبیی لاسایکردنەوەیەکی شیعریی بکرێت؟

**ب. تیۆری گوزارشتکردن**

تیۆری لاسایکردنەوە تا ناوەڕاستی چەرخی هەژدەیەم دەستبەسەر بزوتنەوەی ئەدەبیی ئەوروپادا دەگرێت، بەڵام لێرەوە بەهۆی هاتنەکایەی چینی بۆرژواوە، گۆڕانکاریی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا دێتەکایەوە، بایەخ بە تاکگەرایی دەدرێتو ئەم تیۆرییە دێتە کایەوە کەلە هێزی پەیوەندیی نێوان ئەم بابەتانە دەکۆڵێتەوە:

١. ئەدەبو ژیاننامەی زاتیی.

٢. ئەدەبو سایکۆلۆژیا.

کانت (١٧٢٤-١٨٠٠ان) و هیگڵ (١٧٧٠-١٨٣١) بەدوو بانگەشەکەری فەلسەفەی بۆرژوازییو تاکگەرایی دادەنرێنو کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر ئەدیبو ڕەخنەگرەکانی ئەم قۆناغە هەبووە، بەدوایاندا ولیەم ووردزۆرس (١٧٧٠-١٨٥٠)و سەمۆئیل تیلۆر کۆلیردج (١٧٧٢-١٨٣٤)دێن، کەبەتایبەتیی ئەمەی دواییان بە ڕێگە خۆشکەری بیریی فرۆیدییو دەرکەوتنی فەلسەفەو ئەدەبی بوونگەرایی دادەنرێت.

**پ. تیۆری خوڵقاندن**

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا دەردەکەوێت، پاش ئەوەی هونەر دەکرێتە کاڵایەکی بێزراوی بۆرژوازییەت، ئەم تیۆرییە دێتو بانگەشە بۆ هونەرێکی ڕاستەقینەو بێگەرد دەکات، کە پاککرابێتەوە لە گەندەڵییەکانی ( ئەخلاقو زانستو کۆمەڵگاو...تاد)، " زاتییەتو ئیستاتیکا" بەلای ئەم تیۆرییەوە زۆر گرنگن.

**ت. تیۆری ڕەنگدانەوە**

هەر لە چەرخی نۆزدەیەمدا ئەم تیۆرییە لەگەڵ داهاتنی ئەدەبێکی نوێدا کە بەئەدەبی سروشتگەرایی و ئەدەبی واقیعیی دەناسراو لە ئەنجامی گەشەی کۆمەڵایەتیی و زانستیی و تەکنۆلۆژیی و ئابورییەوە، هاتبوویەکایەوە، دەرکەوتو لە پەیوەندیی نێوان ئەدەبو ژیانی دەکۆڵییەوە.

### ١/١-٧) ڕێبازە ئەدەبییەکان

"ڕێبازی ئەدەبیی" بە تەوژمێکی ئەدەبیی دیاریکراو دەڵێن، کەبەتایبەتمەندیی و خەسڵەتە تایبەتەکانیدا جیادەکرێتەوە، هەڵگری تایبەتێتیی سەردەمێکی دیاریکراو دەبێت و بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان و شێوازی ژیان و ڕووداوە گەورەکان کاریگەرییان بەسەر هاتنەکایەو گەشەسەندن و تەنانەت پوکانەوەشیاندا دەبێت، بنەماکانی لە سەر پایەکانی بیرو هۆش و سۆزو ئەندێشە بنیاتدەنێت، کە بەپێی تایبەتمەندیی هەر ڕێبازێکی ئەدەبیی دیاریکراو یەکێك لەم پایانە بەسەر ئەوانی تردا زاڵدەبێت[٥٧]، یان ڕێبازی ئەدەبیی بریتییە لە کۆمەڵێك تایبەتمەندیی و بنەمای ئیتیکیی و ئیستاتیکیی بیرمەندیی کە لە کۆبەندیاندا ڕێکخستنێکی گونجاو هاتبێتەکایەوە، هەڵقوڵاوی گەلێك لە گەلەکان، یان دەستەیەك لە گەلێکی دیاریکراودا بووە لە کاتێکی دیاریکراودا، هەموو داهێنانە هونەرییەکانیش دەگرێتەوە، وەك: ئەدەب، مۆسیقا، وێنەکێشان، پەیکەرتاشیی، نەخش ونیگارسازیی، جلوبەرگ، تەرزەبیناسازییەکان، کە ئەمانەش لە دیدی فەلسەفیانەی خەڵکەوە بۆ جیهان و مرۆڤ بەرجەستەبوون و لێیانەوە گوزارشتی ئەدەبیی و هونەریی لە هەڵوێست و ئامانج و ئایندەدەکرێت[٥٨]، یان دەوترێت: (( ڕێباز لە بواری ئەدەبیاتدا بریتییە لە کۆمەڵە تیۆرو بۆچوونێکی ئەدەبیی و هونەریی کە لە شارێك، لە وڵاتێکدا سەرهەڵدەدات، نوێنەرەکانیشی بە بەرهەمەکانیان دەیچەسپێنن. زۆربەی جاران وەك چەند بنەمایەك دووبارەدەبێتەوەو سنوری ئەو وڵاتە دەشکێنن و بەناو وڵاتانی دیکەدا بڵاودەبێتەوە))[٥٩]. ئەمانەش دابەشدەبن بۆ[٦٠]:

---

[57] بڕوانە سایتەکانی: www. wikipedia.org / mthahb/wala/htm
www.ward.mahdede.com

[58] بڕوانە: عبدالرزاق الأصفر (١٩٩٩ :٦٣).

[59] د. فەرهاد پیربال (٢٠٠٤ : ٨).

[60] بڕوانە:- د. سالم أحمد الحمدانی (١٩٨٩).
- عبدالرزاق الأصفر (١٩٩٩).
- د. فەرهاد پیربال (٢٠٠٤).

أ. كلاسيزم ( كۆنو نوێ)، له سەدەكانی پێش زايينەوە تاكۆتايی سەدەی هەژدەيەم.

ب. ڕۆمانسيزم له ساڵی ۱۷۹۷ بەدواوە.

پ. ڕياليزم[٦١] له ساڵی ۱۸٤۳ بەدواوە.

ت. پەرناسيی له ساڵی ۱۸۷٦ بەدواوە.

ج. سمبوليزم له ساڵی ۱۸۸٦ بەدواوە.

ح. فوتووريزم له ساڵی ۱۹۰٦ بەدواوە.

خ. دادايزم له ساڵی ۱۹۱٦ بەدواوە.

چ. سورياليزم له ساڵی ۱۹۱۹ بەدواوە.

د. بوونگەرايی له ساڵی ۱۹۳۹ بەدواوە.

---

[61] (ديمين كرانت) پتر له سی جۆری ڕياليزم جيادەكاتەوە، لەوانە: ڕياليزمی ( ڕەخنەگرانە، ئايدياليی، هێورگەرايی، نەتەوەيی، سروشتيی، ئيشتراكيی، دەرونيی، خوديی، ڕۆمانسيی،...تاد)، بڕوانە : د. سالم أحمد الحمدانی (۱۹۸۹ : ۱٥٥).

## ٢/١) چەشنە ئەدەبییەکان

چەشنە ئەدەبییەکان* یان ئەوەی ئەوروپییەکان بە ژانرە ئەدەبییەکانیش باسیدەکەن، لە سەرچاوە کوردییەکاندا بە هونەرەکانی ئەدەب هاتووە[٦٢]، لە ئاست بوارە ئەدەبییەکانی تردا کەمتر لێکۆڵینەوەی لەسەرکراوە، هۆکاری ئەمەش بۆ سەختیی جیاکردنەوەی ژانرەکان‌و ئاوێزانبوونیان بەیەکدی‌و دیارینەکردنی سنوورگەلی وەهان کە بتوانن پاوانی هەریەك لەم ژانرانە جیابکەنەوە، (جەی. ئەی. کیدۆن) ژانر بە چەشن، یان پۆلێکی ئەدەبیی باسدەکات‌و دەڵێت: (( ژانرە سەرەکییە کلاسیکییەکان بریتیبوون لە: داستان، تراژیدیا، لیریك، کۆمیدیا‌و سەتایر، لە ئێستاشدا ڕۆمان‌و کورتەچیرۆکیشیان بۆ زیادکراوە))[٦٣].

ئەرکی سەرەکیی تیۆری چەشنە ئەدەبییەکان، دەرخستنی تایبەتمەندیی هەر ژانرێك‌و دیاریکردنی گەشەکردن‌و بەرەوپێشچوون‌و تێکەڵاوبوونی ژانرەکانە لەگەڵ یەکتردا، ((چەشنە ئەدەبییەکان تەنها لە تیۆری ئەدەبدا گرنگنین، بەڵکو بۆ مێژو و ڕەخنەی ئەدەبیش گرنگن، چونکە چەشنی ئەدەبیی واهەیە بەرەو نەمان چووەو چەشنی ئەدەبیش هەیە لە ئێستادا دەردەکەوێت))[٦٤]، هەر ئەمەش وادەکات کە دواجار لەسەردەمێکی وەك ئێستادا تەنها تیۆری ئەدەب بەو گشتگیرییەی خۆی نەمێنێتەوە، بەڵکو لەڕێی تیۆری چەشنە ئەدەبییەکانەوە، تیۆری شیعر، تیۆری ڕۆمان، تیۆری شانۆ، تیۆری کورتەچیرۆك،...تاد،

---

* چەشنە ئەدەبییەکان، لە (الأنواع الأدبية) یان (الأجناس الأدبية) عەرەبیی‌و (Literary Genres)ی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە، لە زمانی فەرەنسیشدا هەمان شتی پێدەوترێت، بەڵام هەنێکجار لە بەرامبەر "Genres"دا: (Typs, Kinds, Forms)یشی پێدەڵێن. بنچینەی ئەم وشەیە"Genres " لە زمانە ئەوروپییەکاندا بۆ وشەی "Genés" یان "Genos" دەگەڕێتەوە، دوورنییە کە وشەی "جنس"ی عەرەبیش لە هەمان وشەی "گنز"ی یۆنانییەوە وەرگیرابێت، بڕوانە:(د. سیروس شمیسا : ١٩٩٥: ٢٤).

[62] بڕوانە: د. شوکریە رسول: (١٩٨٩)، د.هیمداد حوسێن (١٩٩٨)، نەوزاد عەلی (٢٠٠٤).

[63] J. A. Cuddon (1984 : 285).

[64] د. شکری عزيز الماضي (١٩٨٥ : ٩٧).

بێنەکايەوە، بۆيە دەشێت بوترێت: ((تيۆری چەشنە ئەدەبييەکان، بنەماگەلێکی پەيڕەوبەندەو لەسەر بنەمای بونيات‌و تايبەتمەنديی سيستماتيکيانەی چەشنە ئەدەبييەکان دروستدەبێت))[٦٥]. مێژووی ئەم جياکارييە لە چەشنە ئەدەبييەکاندا بۆ "ئەرستۆ" دەگەڕێتەوە، کاتێك لە کتێبی "شيعر"دا، کۆميدياو تراژيدياو داستان، جيادەکاتەوە[٦٦]، ئەم تێڕوانينانەی ئەرستۆ تا چەرخی نۆزدەيەم درێژەدەکێشن‌و بە کۆڵەکەی بنەڕەتيی کارەکانی "شکسپير"يش دادەنرێن[٦٧]، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێك لە ڕەخنەگران دابەشکردنی ئەدەب بۆ ژانری جياجيا ڕەتدەکەنەوەو تێڕوانينی لەم جۆرانە بە کۆنەپارێزيی‌و گەڕانەوە بۆ چەمکە کلاسيکييەکان باسدەکەن، بۆ نمونە "کرۆچيە" لەگەڵ دابەشکردن‌و پۆلێنکردنی ئەدەبدا نييەو لەم بارەيەوە دەڵێت: (( ئەدەب پێکدێت لە کۆمەڵە قەسيدەو شانۆگەريی‌و ڕۆمانێك کە هەموويان لە ژێر ناوێکدا کۆدەبنەوە کە ئەدەبە))[٦٨].

(هدسۆن) بۆ لێکدانەوەی چەشنە ئەدەبييەکان، لە تێڕوانينە دەرونشيکارييەکان نزيکدەبێتەوەو پێی وايە چەشنە ئەدەبييەکان وەڵامدەرەوەی پێداويستييە دەرونييەکانی مرۆڤن‌و، ئەم دابەشکردنە بۆ جياکردنەوەی چەشنەکان دەخاتەڕوو[٦٩]:

١. خواستمان لە گوزارشتکردنی خود هەبێت (شيعر دەدۆزينەوە).
٢. بايەخ بە خەڵك‌و بەرهەمەکانيان بدەين (شانۆ دەدۆزينەوە).
٣. بايەخ بەو دەورووبەرە بدەين کە تيايدا دەژين‌و بەو جيهانی ئەنديشە ئاميزەشی بدەين کە دەمانەوێت بيگوێزينەوە بۆ بوون‌و واقيع (چيرۆك دەدۆزينەوە).

---

[65] رينيه ويليك و أوستن ارين (١٩٨٤ : ٢٩٦).

[66] بڕوانە: د. سيروس شميسا (١٩٩٥: ٢٦).

[67] د. شکری عزيز الماضي (١٩٨٥ : ٩٩).

[68] رينيه ويليك و اوستن ارين (١٩٨٤ : ٢٩٥).

[69] د. عزالدين إسماعيل (١٩٧٣ : ٢١).

٤. خۆشەویستیمان بۆ وێنەیەك هەبێت لەبەر ئەوەی وێنەیە (ئەدەب وەك کیانێکی دامەزراو لەسەرخۆی دەدۆزینەوە).

دابەشکردنە کۆنەکان تا سەدەی هەژدەیەم وابەستەی دابەشکردنی شیعرن، بەو ئاراستەیەی "ئەدەب" تا ئەو دەمە بە "شیعر" دەناسرا، هەر ئەمەش وادەکات کە پۆلێنکردنی چەشنە ئەدەبییەکان لە ئەرستۆوە تا بە برۆنتییرو هیگڵو ئیلیۆت دەگات، پۆلێنکردنی شیعرە نەك شیعرو پەخشان پێکەوە، کە دواتر باسیاندەکەین.

(برۆنتییر) پێی وایە چەشنی ئەدەبیی وەك چەشنی بایۆلۆژیی وایە، دێتو گەشەدەکاتو لەناودەچێت، بەڵام ئەم لەناوچوونە لەناوچوونی تەواونییە، بەڵکو ڕەگەزەکانی لەگەڵ چەشنی تردا بەردەوامدەبێتو دەمێنێتەوەو گەشەدەکات[٧٠].

(هیگڵ)یش شیعر بۆ دوو جۆری سەرەکیی کە (داستانو لیریکی)ن، دابەشدەکاتو لە لێکدانی ئەم دووانەش جۆری سێیەم دیاریدەکات کە (شیعری درامی)یە، کە بۆ درامای کۆمیدییو تراژیدیی بەشی دەکاتو لە لێکدانی ئەم دوانەشەوە (درامای نوێ) پێکدەهێنێت[٧١]. (ت. س. ئیلیۆت)یش شیعر بۆ لیریکییو داستانو دراما دابەشدەکات[٧٢].

لەگەڵ ئەمانەدا تێڕوانینی تیۆری ڕەنگدانەوە بۆ چەشنە ئەدەبییەکان دێت، کە پێی وایە دەرکەوتن یان لەناوچوونی چەشنە ئەدەبییەکان وابەستەی پێداویستییە ئیستاتیکییە کۆمەڵایەتییەکانە، واتە ئەوە سیستمی کۆمەڵایەتییە کە دەرکەوتنی چەشنێکی ئەدەبیی لەگەڵ پلەی گەشەسەندنی خۆیدا دەسەپێنێت، بۆ نمونە ڕۆمان لە ژینگەیەکی کۆچەرییدا سەرهەڵنادات، بەڵکو پێویستی بە پەیوەندیگەلێکی کۆمەڵایەتیی چڕ هەیە کە خۆی لە شاردا دەبینێتەوەو پێویستی بە چاپخانەو خوێنەرو...هتد، هەیە[٧٣].

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا. ئەوەی ئەمڕۆ گفتوگۆی شێلگیرانەی لەسەر دەکرێت ئەو تایبەتمەندییانەن کە دەتوانن ژانرێکی ئەدەبیی لە یەکێکی تر جیابکەنەوە، ئەم جیاکارییە لەگەڵ ئەوەی سەختە بەهۆی گۆڕانی بەردەوامو تێکەڵاوبوونی لەناکاوی ژانرەکان خۆیانەوە، بەڵام دواجار قاڵب دەگرنو لە چەشنێکی نوێدا خۆیان دەبیننەوە ((چەشنە ئەدەبییەکان، بەبەردەوامیی پاوانەکانی یەکتر دەبڕنو

---

[70] بڕوانە: توماس مونرو (١٩٧١: ٣٥٢).

[71] د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٠-١٠١).

[72] سەرچاوەی پێشوو (١٠١).

[73] بڕوانە: سەرچاوە پێشوو( ١٠٢).

جۆری لێکدراو، یان ئاوێتەی نوێ دەهێننەکایەوە، بەمەش تیۆری چەشنە ئەدەبییەکان لە پۆلبەندکردنی جۆرو هونەرەکانیدا بەردەوام لە گۆڕاندا دەبێت))[٧٤]، یان دەوترێت: کارلێکردنی نێوانی چەشن‌و جۆرە ئەدەبییەکان، تایبەتمەندیی خودی هەریەك لەو چەشن‌و جۆرە ئاوێتەبووانە ناسرێتەوەو لەگەڵ ئەو تێکەڵاوبوونەشدا دەتوانن بەشێکی زۆر لە تایبەتمەندییەکانی خۆیان بهێڵنەوە، یان کە جیاکرانەوە وەکو ئەوە بناسرێنەوە کە هەبوون[٧٥]، ئەگەر بڕوانینە ئەم هێڵکارییەی خوارەوە کە دەربارەی گۆڕانی ژانرەکانە لە سەرچاوەی بنەڕەتیی داستانە شیعرەوە، ئەوا بەڕونیی ئەو ڕاستییە دەدەکەوێت کە بەپێی ڕێبازو سەردەم‌و گەشەی کۆمەڵایەتیی، ژانرەکانیش دەگۆڕێن:

---

[74] رینیە ویلیك (١٩٨٧: ٣٧٦)، رامان سلدن (١٩٩٨ : ٢٣١).

[75] محمد مشبال (٢٠٠١ : ٥٢).

به ئاراستەیەکی ترو لە لێکدانەوەیەکی تری چەشنە ئەدەبییەکاندا، (م. ھ. ئەبرام) لە کتێبی (کورتەیەکی زاراوە ئەدەبییەکان)[٧٦]دا، دەڵێت: ژانر زاراوەیەکە، ئاماژەدەکات بە دووبارەو چەندبارەبوونەوەی جۆرێك لە ئەدەب، یان ئەوەی لە ئێستادا بە "فۆڕمی ئەدەبیی" ناودەبرێت. ئەو ژانرانەی کارە ئەدەبییەکانیان پێ پۆلێنکراوە لە زەمەنە جیاجیاکاندا، ژمارەیان زۆر زۆرەو، ئەو پێوەرانەش کە پۆلێنکردنەکانیان لەسەر بنیاتنراوە زۆر جیاوازو جۆراوجۆرن. یان دەوترێت: (( گەشەکردنی ھەر چەشنێکی ئەدەبیی وابەستەی ھەڵوێستییەتی بە مێژوو و کۆمەڵەوە))[٧٧]، (د. سیرۆس شەمیسا)یش دەربارەی پۆلبەندکردنی چەشنە ئەدەبییەکان دەڵێت: ((پۆلبەندکردنی یەکلاکەرەوەی چەشنە ئەدەبییەکان کارێکی سەختو دژوارە، جگە لە چەند بوارێکدا نەبێت، ئاسان نییە لە ڕووی فۆڕمو ناوەڕۆکەوە ھەر بەرھەمێکی ئەدەبیی لەگەڵ جۆرەکەیدا دیارییبکرێت))[٧٨].

لەگەڵ ھەموو ئەمانەدا، چەشنە ئەدەبییەکان لەگەڵ گەشەکردنی مرۆڤایەتییدا گەشەیانکردووە، ئەم گەشەکردنە لەسەر یەك تەوەری دیاریکراو نەچۆتە پێشەوە، بەڵکو بە جۆرێك لە جۆرەکان گۆڕان بەسەر فۆڕم یان ناوەڕۆك، یان ھەردووکیاندا ھاتووە، دەتوانین گۆڕان لە گەشەی چەشنە ئەدەبییەکاندا دابەشبکەین بۆ:

١. مانەوە وەك خۆی لە فۆڕمی گشتییداو گۆڕان لە ناوەڕۆکدا، وەك لە درامای نوێدا دەردەکەوێت ((دراما یەکێکە لەو چەشنە ئەدەبییانەی گۆڕانی زۆر کەم بەسەر شێوازی گشتییدا ھاتووە، بۆیە زۆرجار بەھونەری گرافیك دەچوێنرێت کە بەتەنھا ڕەنگێك گوزارشتەکانی پیشاندەدات))[٧٩].

---

[76] بڕوانە: M. H. Abrams (1993 : 75).

[77] د. سالم احمد الحمدانی (١٩٨٩: ١٤).

[78] د. سیروس شمیسا (١٩٩٥: ٣٦).

[79] یا. إي. ایلسبورغ (١٩٨٦ : ٧٨).

٢. کۆبوونەوەی چەند چەشنێك لە چەشنێکی نوێدا، وەك لە پەخشانەشیعردا دەردەکەوێت، (د. زاهیر لەتیف) دەڵێت: ((گێڕانەوەگەریی کەلە چیرۆکدا هەیە، هاتۆتە ناو شیعریشەوە...))[٨٠].

٣. گۆڕان لە خودی چەشنێکدا بۆ چەشنێکی دی، بە گۆڕان لە ناوەڕۆك یان ڕوخساردا، وەك ئەوەی (( پارچە شیعرێك پۆستەرەشیعری لێدەبێتەوە))[٨١].

٤. گۆڕان لە ناوەڕۆکداو مانەوەی فۆڕم وەکو خۆی، وەك لە شیعری ئەورووپیی نوێدا دەردەکەوێت[٨٢]، کە زانست ئاوێزانی دەقی ئەدەبیی دەبێت، یان هەواڵە شیعر دێتە ناو بەرهەمە شیعرییەکانەوە.

هەر دەقێکی ئەدەبیی وابەستەی چوار بنەمای سەرەکیی دەبێت، کە بریتین لە:

١. بیر: ئەو بیرە بنەڕەتییەیە، کە نووسەر لەبەردەمی خۆیدا دایدەنێت.

٢. بابەت: ئەو مادە گشتییەیە کە نووسەر وەریدەگرێت.

٣. ناوەڕۆك: هەموو ئەو شتانەیە کە لە ناو کارە ئەدەبییەکەدا هەیە بە بیرو بابەتیشەوە، جگە لە ڕوخسار[٨٣].

٤. ڕوخسار: فۆڕمی گشتیی و بیرێکی بەرجەستەبووە لە بابەتدا کە ئەرکی جوانکاریی و زاخاودانەوەو ڕێکخستنی شێواز دەبینێت.

هەموو ئەمانە بەپێی سەردەمو ڕێبازو لێکدانەوە ئەدەبییەکانو تێڕوانینە ڕەخنەییەکان، بەکارهێنانیان جیاوازە، ئاستی بایەخدارییان بە پێی ئەوانەی وتران دەگۆڕێن، بەڵام یەکتری لە ناونابەنو یەکتر ناسڕنەوە، بەڵکو یەکتری

---

[80] د. زاهیر لەتیف (٢٠٠٦ : چاوپێکەوتن).

[81] سەرچاوەی پێشوو.

[82] بڕوانە: بۆدهۆڵ (٢٠٠١ : ١١٩-١٢٢).

[83] بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

تەواودەکەن‌و لە هەموو دەقێکدا ئامادەییان دەبێت‌و ڕەگەزەکانی تری وەك (سۆزو خەیاڵ‌و دەربڕینی وشەی جوان[٨٤])یش، لەتەك ئەوانەی سەرەوەدا خاڵی هاوبەشی نێوان شیعرو پەخشانی ئەدەبیی دەبێت.

چەشنە ئەدەبییەکان بە ئاراستەی ئەو زاراوە ڕوسییەدا دەچن کە بە ( تەوژمی لەخۆوە Ruslovoi Potok[٨٥]) باسدەکرێت‌و وەك (د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) دەڵێت: (( ئاوێك دێت‌و بەناو لمدا دەڕوات، دەبێ بە دوو، سێ، چوار،...تاد، لە پڕ دووان یەك دەگرنەوە، یەکێ وشکدەکات، یەکێك بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتن))[٨٦]، بەم شێوەیەش چەشنە ئەدەبییەکان کە لە سەرەتادا لە شیعردا کۆبووبوونەوە خۆیان لە ئەدەبی داستان‌و شیعری لیریکیی‌و ئەدەبی دراماییدا دەبینییەوە، بەڵام دواجار بەو میتۆدەی سەرەوە ئەم هەموو جۆرەیان لێبۆتەوە[٨٧] کە لەمەودوا لێیاندەدوێین. کەواتە گەر بە شێوەیەکی گشتیش بێت چەشنە ئەدەبییەکان پۆلێنبەنددەکرێن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تایبەتمەندییانەی کە چەشنێك دەتوانێت پەیکەری تایبەتیی خۆی لەوانی تر پێجیابکاتەوە، بۆیە دوای ئەوەی پەخشان دێتە ناو کایە ئەدەبییەکانەوەو پانتایی شیعرو دەسەڵاتی ئەزموونی شیعریی بەسەر کایە ئەدەبییەکاندا پەرت دەکات، لێرەوە دوو چەشنی سەرەکیی لە ئەدەب جیادەبنەوە، کە بریتین لە:

١. شیعر.
٢. پەخشان.

بە شێوەیەکی گشتیی هەموو ڕەخنەگرو بیرمەندان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەدەب بۆ دوو بەشی گەورە کە شیعرو پەخشانن دابەشدەبێت[٨٨].

---

[84] بڕوانە: د. شوکریە رسول: (١٩٨٩: ٢٧).

[85] یا. إي. ایلسبورغ (١٩٨٠ : ١٠).

[86] د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

[87] یا. إي. ایلسبورغ (١٩٨٠ : ١٠-١١).

[88] بڕوانە: علائەدین سەجادی (١٩٧١ : ٩٠-٩١)، د. محمد غنیمي هلال (١٩٧٣: ٢٢٠,٢٣٥)، د. محمد مندور (١٩٧٤: ٤)، . شوکریە رسول: (١٩٨٧ : ٥)، عەزیز گەردی (١٩٨٧: ١)، د.

## ١/ ٣) شیعر

سەرچاوەکان، کۆنترین دەقی ئەدەبیی بۆ دەقی شیعریی دەبەنەوە، ئەم لە پێشینەییەی شیعر تەنها بۆ کلتوری ئەدەبیی نەتەوەیەکی دیاریکراو ڕاست نییە، بەڵکو مێژوی ئەدەبیی هەر نەتەوەیەك لە دنیادا ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت، کە دەقی بەشیعر نووسراو کۆنترە لە دەقی بەپەخشان نووسراو، ئەمەش ئەوەناگەیەنێت کە ئەم دوو چەشنە یەکتری ڕەتکەنەوە، بەڵکو هاتنەکایەی هەریەکەیان وابەستەی واقیعی کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیریی و ئابوریی خۆیەتی[٨٩]. مەبەست لە پێشکەوتنی شیعر بە سەر پەخشاندا، هەبوونی کۆنترین دەقی نووسراوی شیعریی دەگرێتەوە کە وەك دەقێکی هونەریی تەماشاکرابێت، نەك بۆ هەر دەربڕینێکی وتراو یان دەربڕراو کە نەتوانرابێت تۆماربکرێت.

### ١/٣-١) چەمکی شیعر

شیعر چنراوێکی زمانییە، هێندەی وابەستەی لایەنە ئیستاتیکییەکان دەبێت، ئەوەندە بەلایەنە ڕێزمانییەکانی زمانێکەوە نابەسترێتەوە، کەواتە ئەگەر ئامرازی بنەڕەتیی هەر دەقێکی شیعریی زمان بێت، ئەوا کەرەستەی بنەڕەتیی ئەم چەشنە بریتی دەبێت لە وشە. ئەمە دەمانباتە سەر ئەوەی کە گەشەکردنی زمان دواجار گەشەکردنی شیعری لێدەکەوێتەوە (( سەرهەڵدانی شیعر پەیوەندیی بە قۆناغیٚ لە قۆناغەکانی پێشکەوتنی زمانی مرۆڤەوە هەیە، کاتێك زمان گەیشتە پلەی جوانیی و سوودبەخشین شیعریش سەری هەڵدا))[٩٠]، شیعر دەروازەی تێکەڵاوبوونی ئەدەبە بە هونەرەجوانەکان، بۆیە هەمیشە لە گۆڕان و پێشکەوتن و

---

شوکریە رسول: (١٩٨٩ : ١٢)، جان ماری شیفیر (١٩٩٧ :٥١-٥٨)، دعبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ٦)، عەزیز گەردی (١٩٩٩ : ٦٧)، علائەدین سەجادی (٢٠٠٠ : ٦)، د.محەمەد دلێر ئەمین میسری (٢٠٠٤ :٦١-٦٧).

[89] بڕوانە: د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٢).

[90] د. شوکریە ڕسول: (١٩٨٩ : ١٣).

گەشەکردندایەو ناتوانرێت پێناسەیەکی چەسپاوو جێگیری بۆ دابنرێت، لەم بارەیەوە (د. دڵشاد عەلی) دەڵێت: (( هۆنراوە وەك هونەرێك لە هونەرە جوانەکانو وەك چالاکی یەك لە چالاکی یەکانی مرۆڤ هەمیشە لەگەڵ گۆڕانو بەرەوپێش چوونی مرۆڤدا بە گوێرەی شوێنو سەردەم لە گۆڕاندا بووەو چەمکێکی چەسپاوی نەبووە، هەر ئەمەش بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو بڕوایەی کە پێناسەکردنی هۆنراوە کارێکی ئاسان نی یە))[٩١].

زمانی شیعریی، جیا لە زمانی ئاسایی زمانێکی دیاریکراوەو، وابەستەی توانستە خودییەکانی شاعیر دەبێت، بەو واتایەی ئەوە شاعیرە واتای نوێ لەسەر بونیاتی وشەیەکی فەرهەنگیی باردەکات، بەمەش پرۆسەی تێگەیشتن کە ئامانجێکی سەرەکیی زمانە، لە ئاستێکی سروشتیی ئاساییەوە دەباتە ئاستێکی باڵای دیاریکراوی داهێنەرانە، هەر ئەم شێوازەش لە بەکاربردنی وشەکاندا وێنەی نوێ دەهێنێتەکایەوە، کە دەشێت وێناکردنی لای خەڵکی ئاسایی ئاسان نەبێت. لە مێژەوە شیعر وابەستەی کێشو سەرواکراوە، لەم بارەیەوە (قودامەی کوڕی جەعفەر) شیعر بە: وشەگەلێکی کێشداری سەرواداری واتادار باسدەکات[٩٢]، کەواتە یەکێك لە تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی شیعر بریتی دەبێت لە کێش، ئەم پەیڕەوەش بەپێی قۆناغە جیاجیاکانی گەشەی شیعر گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام تا ئەمڕۆ ئەم بنەمایە وەك پێداویستییەکی دەقی شیعری بە شێوازی جیاجیا ماوەتەوە.

دەشێت تایبەتمەندییەکانی شیعر لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە، بەڵام دواجار خودی تایبەتمەندییەکانیش وەك چەشنە ئەدەبییەکان ئەگەری گۆڕانیان هەیە، بە جۆرێك کە دەشێت لەگەڵ پەخشاندا ئاوێزانی یەك بن، هەر ئەمەش جۆرێکی وەك پەخشانەشیعر لە چەشنی شیعر دێنێتەکایەوە:

---

[91] د. دڵشاد عەلی (١٩٩٨ : ٦).

[92] بڕوانە: سەرچاوە پێشوو( ١١).

١. كێش، (( لایەنێکی بابەتییەو قاڵبێکی ئامادەیە لە بەردەستی شاعیر بۆ ئەوەی هەستو سۆزو خرۆشانی دەروونو بیرو وێنەو ئەندێشەی خۆی تێدا دەربڕێ))[93]، هەروەها دەوترێت: (( کێش نیشانەی سەرەکیی هۆنراوەیە))[94]، کەواتە کێش مەرجی سەرەکیی دەقی شیعرییە، ئەم کێشە لە چ قاڵبو فۆرمێکدا بەکاردێت گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە نەمانی کێش لە دەقدا ، دەقێکی شیعریی دەکاتە دەقێکی ئاسایی، یان دەقێك لەدەرەوەی دەقی شیعرییدا، (( کێش وەك مەرجێکی سەرەکیی قاڵبی شیعری هەموو نەتەوەکان بەکاردێ بەڵام هەریەکەو بەپێی تایبەتێتی خۆیو بەگوێرەی سەردەمی خۆی، تەنانەت ئەو بزوتنەوە شیعرییەی لە سەدەی نۆزدەمدا بەناوی شیعری ئازاد "Free Verse" بڵاوبوەوە، ئەویش لە کێش بێبەری نییە، بەڵام کێشی تایبەت بە خۆی))[95]. کێشیش لە دەقدا بۆ کێشی دەرەوەو کێشی ناوەوە کە بە "ڕیتم" ناودەبرێت، دابەشدەبێت، ئەم دوو خەسڵەتەی کێش لە شیعردا لەگەڵ سەرهەڵدانی شیعردا هاتۆتەکایەوە، دەشێت هەوڵەکانی (پانینی) بۆ دانانی یاسا بۆ زمانی سانسکریتیی تاوەکو دەقە پیرۆزەکانی "ڤێدا" وەکو خۆی بخوێنرێتەوە، یان پەیامە ئایینییەکانو پاراستنیان لە شێوازی گۆکردنیاندا، یاخود بۆنەو ئاهەنگەکانی خەڵك لە ساتەوەختو شوێنو یادەوەرییەکی تایبەت یان دیاریکراودا، چەسپاندنی کێشی بەهەردوو ئاستەکەدا لێکەوتبێتەوە، بەڵام دواجار کێشو ڕیتم لەگەڵ گۆرانییو سەمادا کۆبوونەتەوە، سپنسەر دەڵێت: (( شیعرو مۆسیقاو سەما هەموو لە سەرچاوە، یەك شت بوون پاشان هەریەکە جیابوەوەو

---

[93] عەزیز گەردی (١٩٩٩ : ٦٧).

[94] عەزیز گەردی (١٩٨٧: ١).

[95] عەزیز گەردی (١٩٩٩ : ٦٨).

بووبە هونەرێکی سەربەخۆ))[٩٦]. (د. عەزیز گەردی)یش دەنووسێت: (( ئێستاش ئەم سیانە لە کاتی ڕاپەڕاندنی کاروباری گەلەکۆیی لادێ بەکاردێن (دروێنە، ساوارکوتان، دەستاڕ...) و لای هەندێ هۆزی (هۆڤی-وەحشی) ئێستاش هەر بەیەکەوەن‌و لە یەك جیانەبونەتەوە. سەما لای ئەم هۆڤییانە هەمیشە گۆرانی تاك ئاوازو چەپڵەو تەپڵی لەگەڵدایە. بەم جۆرە جووڵەی ڕێك(موزون)و وشەی ڕێك و ئاوازی ڕێك دەچرژێنە ناو یەك و وەکو یەك کاری بەرجەستەو داڕژاو دەکەونە بەرچاو. پاشان گۆرانی کە لە شیعرو مۆسیقا پێك دێ لە سەما جیابووەوە، بەڵام ئەم دوو ڕەگەزە (شیعرو مۆسیقا) تاماوەیەکی زۆرتر پێکەوە مانەوە. پاشان کە شیعر بوو بە دووبەش: شیعری لیریکی‌و شیعری چیرۆکی، شیعری لیریکی بۆ چڕین‌و شیعری چیرۆکی بۆ گێڕانەوەی چیرۆك و بەسەرهات بەکاردەهات، بەمەش شیعری ڕووتی بێ گۆرانی پەیدابوو بەڵام ڕەگەزی گۆرانی هەر تێدا ما کە لە کێش‌و ڕیتمدا خۆی دەنوێنێ))[٩٧]، ئێستاش کاریگەری ڕیتمی شیعری بە مۆسیقاوە ئاشکرایەو ئێستاش دەتوانین مۆسیقا بە ڕیتمێکی شیعری بێ وشە دابنێین[٩٨]، یان دەوترێت: (( شیعر هونەرێکی جوانەو دۆستایەتییەکی نزیکی لەناو هونەرەجوانەکاندا لەگەڵ مۆسیقادا هەیە))[٩٩]. دەربارەی ڕیتمیش، ڕیتم لە شیعردا دەوڵەمەندو ئاشکراو ڕێکوپێکترەو وابەستەی سیستمی ڕێکخستنی کێشی دەرەوەی شیعر دەبێت (( ڕیتم بریتیە لە جولانەوە یان هەستی جووڵانەوەیەك کە لە ڕێکخستنی برگەی هێزدار و بێهێزی‌و درێژی برگەکانەوە پەیدادەبێ. ڕیتم لە شیعردا پشت بە

---

96 سەرچاوە پێشوو (٦٨-٦٩).

97 عەزیز گەردی (١٩٩٩ : ٦٩).

98 بڕوانە: عبدالغفورالنعمة (١٩٨٨ : ٩١).

99 ابو عبدالرحمن ابن عقيل الظاهري (www.mnaabar.com.showthread).

دەستووری کێش دەبەستێ))[١٠٠]، کێشیش بۆ جۆرەکانی وەك: عەروزی، بڕگەی ئازاد،...تاد، دابەشدەبێت.

٢. سەروا، تایبەتمەندییەکی تری دەقی شیعرییە، هەرچەندە ئەمیش وەك کێش گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام دواجار ئامادەیی سەروایە لە دەقێکی شیعرییدا کە ڕایەڵەکانی پێکەوەبەستنەوەی کێش و ڕیتم و مۆسیقای شیعر بەرجەستەدەکات، (( سەروا مۆسیقای شیعر زیاددەکات، لەبەر ئەوە خۆشیی شیعرەکەش زیاتر دەبێت))[١٠١]. سەروا لە ڕوانگەی جیاجیاوە لێکدراوەتەوە، بەلای (خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی)یەوە: (( سەروا لە پیتی کۆتایی دێڕەوە تا یەکەم پیتی بزواوی پێش دوو پیتی وەستاوە))[١٠٢]، بەلای (ئەخفەش)یشەوە، سەروا (( وشەی کۆتایی دێڕە))[١٠٣]، ئامادەیی سەروا لە هەموو زمانەکاندا وەك یەك نین، لە هەندێ زماندا سەروا هەر نییە وەکو: زمانی گریکیی[١٠٤]، لە هەندێ زمانی تریشدا بە پێویستییەکی شیعریی زانراوە، وەك لە زمانی کوردییدا، (( سەروای هۆنراوە بەگوێرەی هۆنراوەکە دەگۆڕێ))[١٠٥]، ئەمەش وادەکات بەپێی سەروا چەندین جۆری وەك: (سەروای یەکگرتوو، مەسنەوی، سێینە، چوارین، پێنجینە، شەشینە، مووەششەح، موستەزاد، تەرجیع بەند،...تاد) دابەشببێت.

٣. مۆسیقا، پەیدابوونی شیعرو مۆسیقا پێکەوە، وایکردووە ئەوەندە تێکەڵبن، کە دوای جیابوونەوەشیان نەتوانن بەتەواوی دەستبەرداری یەکتربن، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعر ڕەگەزە سەرەکییەکەی

---

[100] عەزیز گەردی (١٩٩٩ : ٧١).

[101] عبدالصمد إسلام طه دۆسکی (٢٠٠١ : ٧١).

[102] سەرچاوەی پێشوو.

[103] د. صفاء الخلوصي (١٩٧٢ : ٢١٣).

[104] بڕوانە: عبدالصمد إسلام طه دۆسکی (٢٠٠١ : ٧٢).

[105] عەزیز گەردی (١٩٨٧: ١).

کێشە، کە لە مۆسیقاوە ئاوێزانی بووە، لەلایەکی تریشەوە پەیوەندییەکی تایبەتیش لە نێوان مۆسیقاو شیعردا هەیە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعر هونەرێکی زمانییەو دەربڕینی بەهۆی دەنگەوەیەو چێژلێوەرگرتنی بەهۆی بیستنەوەیە، ئەمانەش هەموو لە مۆسیقادا جێیاندەبێتەوە، بەتایبەتیی کە دەنگ ئاواز بەرهەمدەهێنێت، لەم بارەیەوە (ئیبن سینا) دەڵێت: (( لەدوو لاوە سەیری کێش دەکرێ، یان بە گشتیی کە دەبێتە زانستی مۆسیقا، یان بە چۆنێتیی بەکارهێنانی لای هەر نەتەوەیەك، کە دەبێتە زانستی عەروز))[١٠٦]، ئەو پەیوەندییەش کە مۆسیقا بە عەروزەوە دەبەستێتەوە، دەنگە. ئەم پەیوەندیی ئۆرگانیی مۆسیقاو شیعرە، بەتێڕوانینی (چان پۆڵ سارتەر) وا لە دەقی شیعریی دەکات کە لە سنوری وابەستەیێتیی هونەریی دەریبکاتو ( شیعر بە هونەرێکی وەك وێنەکێشانو پەیکەرتاشییو مۆسیقا دەزانێت کە هیچ جۆرە ئیلتیزامگەرییەك قبوڵناکات)[١٠٧]، ئاوازی دەق، یان مۆسیقای دەق، یان تۆنی دەق لە شیعردا، جوانییو کاریگەریی دەق بەرجەستە دەکەن، هەر ئەمانەش وەك تاریكو ڕونیی تابلۆیەك وێنەکان پێکدەهێننو جوڵە دەخەنە هەناوییانەوە، مۆسیقا لە شیعردا دەقی شیعریی ڕووەو داهێنانی هونەریی دەبات.

٤. هەستگەرایی شیعریی، یان باری ویژدانیی لە شیعردا، ئەمەش بەلایەنێکی گرنگی تری دەقی شیعریی دادەنرێت، شیعر لە هەستەوە سەرچاوە دەگرێت، هەستێك کە وابەستەی ویژدانی شاعیرە، ویژدانێك کە لە نێوان نەستو هەستی شاعیردا دەیەوێت جۆرێك لە گونجاندنی هونەرییانەی بێ سانسۆرانە گەڵاڵەبکات، واتە درکی شاعیرانە ئەو درکەیە کە لە دەرەوەی یاساو دابونەریتە گشتییەکاندا کاردەکات،

---

[106] عەزیز گەردی (١٩٩٩ : ٧٥).

[107] چان پول سارتر (١٩٩٠ : ٩-١٠).

دەخوازێت ڕێو شوێنی گونجاو بۆ خواستەکانی نەست، هەستیارانە بدۆزێتەوە، هەر ئەمەش وادەکات شیعر زیاتر وابەستەی سۆزو دەرونی وەرگر بێت و بزوێنەری ڕاستەقینەی ئەو هەستو سۆزانەی بەرامبەریشی بێت (( سەرچاوەی یەکەمی شیعر ئەوەیە کە پێیدەڵێن "هەستگەرایی شیعریی" یان باری ویژدانی لە شیعردا، شیعریش ڕاستەوخۆ بە شعورەوە دەبەسترێتەوە، بۆیە زیاتر دەتوانێت هەستەکان بوروژێنێت))[١٠٨]، یان دەوترێت: ئەدەبی هۆنراوە لە ویژدانەوە سەرهەڵدەداو، ویژدانیش لەپێش ژیرییەوەپەیدابووەو دەبێت[١٠٩]، یان هۆنراوە لە ویژدانو سۆزەوە پەیدادەبێت، واتە هۆنراوە زمانی سۆزو ویژدانە[١١٠]، لای هەندێکی وەکو ڕەخنەگری ئەڵمانیی (هردەر) شیعری ڕەسەن ئەوەیە کە دەربڕی هەست بێت[١١١].

٥. زمان، یان بەکارهێنانی زمان لە شیعردا یاخود زمانی شیعریی، لە شیعردا بەکارهێنانی زمان زیاتر ئاڵۆزو هێمابەخشو هەڵگری واتای جیاجیایە، شاعیر ئەو وشانە هەڵدەبژێرێت کە فرەواتان، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو دەربڕراوانەی پێکدەهێنرێن توانستی زیاتریان هەبێت بۆ هێمابەخشین بە ناوەڕۆکە هەڵچوو سۆزدارو هۆشمەندییەکانی (( هەر نووسەرێك تواناو شێوەی تایبەتی خۆی لە هەڵبژاردنو بەکارهێنانی وشەکانی زمان هەیە))[١١٢]، ئەمەش وادەکات شیعر بە گوێگرتن و خوێندنەوە وەربگیرێت لە کاتێکدا شانۆگەریی بەبینینو خوێندنەوە وەردەگیرێت، وشەی هۆنراوە دەبێ جوانو بژاردەبێ، پڕ سێبەرو ئیحا بێ چونکە هۆنراوە بەرەو خەستی و چڕی دەچێ شان بە شانی مانای

---

108 د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٤).

109 بڕوانە: علائەدین سەجادی (٢٠٠٠ : ٦).

110 بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ١).

111 بڕوانە: د. شوکریە رسول: (١٩٨٩ : ٢٣).

112 عبدالصمد إسلام طه دۆسکی (٢٠٠١ : ٨١).

دروست و خوازەیی وشەکان، ئەم وشانە بە زەنگو ئاوازەکەیان شەحەناتی دەروونی..دەگەیەنن و جۆشێك بە خوێنەر دەدەن[١١٣]، یەکێك لەو دیاردە ئاشکرایانەی ئەمڕۆی شیعر ئەو شێوەگەرێتی و تەمومژەیە کە باڵی بەسەریدا کێشاوە شیعر ئەگەر گۆڕان لە وشەکانیدا کرا ئەوا پێکهاتەو واتاکەی لە دەست دەدات[١١٤]، (( هەڵبەست نامێنێ ئەگەر وشەکانی و شێوازی نەمان))[١١٥]، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوازبەندیی شاعیر لە داڕشتنی دەقی شیعرییدا کە ئازادە لە جێگۆڕینی وشەکاندا. زمان لە هەڵبەستدا زمانێکی تێکبەستییە (ترکیبیه) چونکە هەڵبەست لە ئەنجامی هەڵچوونی هەستو سۆزی دەروونی مرۆڤە پێویستی بە چڕیی دەربڕین و کورت بڕیی هەیە[١١٦].

٦. داڕشتنی دەق، بنەمایەکی تری دەقی شیعرییە، هەر شیعرێك خاوەنی داڕشتنێکی تایبەتە، ئەم داڕشتنەش وابەستەی شێوازی تایبەتیی شاعیرە، لە سیستمە گراماتیکییەکانی زمانەوە تابە دروستکردنی وێنەکان دەگات، شاعیر سەربەستانە مامەڵە لەگەڵ هەموویاندا دەکات، واتە لە دەقی شیعرییدا شاعیر زمان دروستدەکات، بۆ نمونە لەم دێڕەدا:

نەمردم من ئەگەر ئەمــــجارە بێ تـــــۆ
نەچم شەرت بێ هەتا ئەو خوارە بێ تۆ

ئەم دێڕە کە ( د. محەمەد مەعروف فەتاح) بە ڕستەی باسمەند[١١٧] ناوی دەبات، زیاتر لە شیعردا بەرجەستە دەبێتو ئەوە شاعیرە کە کرداری ڕستە لە کۆتایی ڕستەوە دەهێنێتە سەرەتای ڕستە، نەك پەیڕەوە باوە گراماتیکییەکانی زمان. (( لە هۆنراوەدا زۆرجار وادەبێ

---

[113] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٢).
[114] بڕوانە:مجید محمود مطلب (١٩٧٨ : ٨).
[115] عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ١٢).
[116] بڕوانە: عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ١٠).
[117] د. محەمەد مەعروف فەتاح (٢٠٠٥: وانەکانی خوێندنی باڵا).

کێش و سەروا شاعیر ناچار دەکا جێگای وشەکان بگۆڕیّ و پاش و پێشیان بکا واتە شاعیر ماوەی دراوە ووشە لە هەر شوێنێك دابنیّ، لە ئەنجامدا وادەبیّ کە دارشتنی ڕستەکە بەجۆرێکی ناسروشتی بیّ))[118]، هۆنراوە جۆرە نووسینێکی تایبەتیی هەیە، لە شیعری کلاسیکییدا هەر دێرێك دەبێتە دوو نیوەدێری بەرامبەر بەیەك و سەرواش بەگوێرەی جۆری هۆنراوەکە دەگۆڕێت[119].

٧. لە شیعردا هونەرە ڕەوانبێژییەکان نەك هەر زۆر بەکاردێن، بەڵکو ئامرازێکی گرنگی پێکهێنانی وێنەی شیعرین، هەر ئەمانەن دەتوانن دیمەنی نویّ و وێنەی نویّ لە هەمان ئەو وشانە سازبکەن و بچنن کە لە فەرهەنگی زمانی نەتەوەیەکدا، واتادیاریکراوو سنوردارن، (( لە هۆنراوەدا هونەرە ڕەوانبێژییەکانی وەك ( لێکچوون، خوازە، خواستن، درکە، جوانیی بایس، دژیەك، ..هتد) زیاتر بەکاردێن))[120]، (هۆراس)یش شیعر بە جۆرێك لە وێنە دادەنێت و دەڵێت: (( ئەگەر وێنەکێشان بریتیی بێت لە بەرجەستەکردنی تابلۆیەکی بێدەنگ، ئەوا شیعر وێنەیەکی قسەکەرە))[121].

٨. خەیاڵ بنەمایەکی تری دەقی شیعرییە، شیعر بەرەو ئەندێشەو بیرکردنەوەو وێناکردنی هەموو ئەو خواست و ئارەزوو بیرانەمان دەبات کە زۆرجار لە دنیای واقیعدا بەدییانناکەین. شیعر لەڕێی خەیاڵەوە بەرەو واقیعی نەستمان دەبات، یان بە شێوەیەکی تر لە ڕێی بنەمای خەیاڵەوە شاعیر بڤەکانی نەست دەخاتە واقیعەوە، بۆیە تەڕیی و پاراویی و زیندویی و سەوزیی هەمیشە لە شیعردا دەدرەوشێنەوەو جۆرێك لە

---

[118] عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٢).

[119] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو: ( ٢).

[120] سەرچاوەی پێشوو: ( ٢).

[121] د. محمد مرتاض (٢٠٠٠ : ٣٣).

نەمریی پێدەبەخشن، بەهرەی خەیاڵ زۆر زوو لە مرۆڤدا دەرکەوتووە، لەو کاتەشەوە خەیاڵی لە دانانی داستاندا بەکاربردووە[122]، یان دەوترێت: (( شیعر بەرهەمی مرۆڤێکی بەهرەداری بەئەندێشەیە، کە بە ترپەو ئاواز تاقیکردنەوەکانی خۆی وەکو مرۆڤێکی ئەندامی ناو کۆمەڵگایەك لە دووتوێی چەند وشەو ڕستەیەکی پڕواتاو خەیاڵێکی فراواندا تۆماردەکات))[123]. (د. محەمەد دلێر ئەمین میسری)، ئەو پێوەرە بۆ خەیاڵ دیاریدەکات کە دەبێت ئەو خەیاڵە خەیاڵێکی داهێنەرانەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت زیندوویی بە دەق ببەخشێت[124].

٩. لاسایکردنەوە، مەبەستمان لە لاسایکردنەوە ئەگەر بەچەمکە یۆنانییە کۆنەکەی ئیفلاتۆنیش نەبێت، ئەوا دواجار لاسایکردنەوە هەر دەبێتە زاراوەیەکی گرنگی دیاریکردنی چەمکی شیعر، بەوەی هەر دەقێك لەسەر شێوازێکی دیاریکراو بنیاتدەنرێت کە خۆی بۆخۆی قاڵبی گرتووە، شاعیر بە پێی قاڵبێك لەوانە بیرو بابەتو ناوەڕۆکی دەقەکەی بەرجەستەدەکات، واتە دواجار گەڕانەوەیە بۆ قاڵببەندکردنی قاڵبێکی پێشتری ئامادەکراو کە دەشێت ئەمەش بەجۆرێك لە لاسایکردنەوە بزانرێت، (( یەکێ لەو زاراوە گرنگانەی کە ڕەخنەی یۆنانی چەمکی هۆنراوەی پێ دیاری کردووە زاراوەی "لاسایکردنەوە"یە))[125].

١٠. تاقیکردنەوە، ئەزموونی شاعیر لەگەڵ دەروبەرو کارتێکردنی ڕووداو لە شاعیرو بەرجەستەکردنی ئەم هاوکێشەیە لە دەقی شیعرییدا، تایبەتمەندییەکی تری شیعرە، بۆیە بەپێی چەمکە هاوچەرخەکانی هۆنراوەی ئەورووپایی شیعر تەنها لە هەستەوە سەرچاوەناگرێت، بەڵکو

---

122 بڕوانە: عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ :٧).

123 د. شوکریە رسول: (١٩٨٩ : ٢٥).

124 د. محەمەد دلێر ئەمین میسری (٢٠٠٦: چاوپێکەوتن).

125 د. دلشاد عەلی (١٩٩٨: ٧).

وابەستەی تاقیکردنەوەو ئەزمونی شاعیر دەبێت، لەم ڕووەوە (ڕیلکە)دەڵێت: هۆنراوە تەنها بریتیی نییە لە هەست وەك خەڵكیی بۆی دەچن، بەڵکو تاقیکردنەوەیە، پێویستە مرۆڤ بۆ نووسینی تاکە بەیتێك شاران‌و خەڵکی جیاوازو شتی جیاواز ببینێت‌و شارەزای گیانلەبەرو پۆلی مەلان بێت‌و توانای ئەوەی هەبێت بیری بەرەو ڕۆژانی منالیی بەرێتەوەو بیر لەو دایك‌و باوکە بکاتەوە کە هەستیانمان بریندار دەکرد...[١٢٦]، هەر لەم بارەیەشەوە چەمکی شیعر لە ڕەخنەی هاوچەرخی عەرەبییدا بە داڕشتنێکی هونەریی تاقیکردنەوەی کەسیی، باسدەکرێت[١٢٧].

هەر لەم تایبەتمەندییانەوە (د. محەمەد مەندور) سێ پێوەر بۆ جیاکردنەوەی شیعر لە پەخشان دیاریدەکات[١٢٨]، کە بریتین لە:

١. مۆسیقا.
٢. شێوازی گوزارشتکردنی شیعریی.
٣. ناوەڕۆکی شیعریی‌و ئەو دواندنە دەروونیانەی کە لەو ناوەڕۆکەوە سەرچاوەدەگرن.

## ٢-٣/١) جۆرەکانی شیعر

( هاربێرت جۆسیف مولەر) دەڵێت: (( ئەدەبیاتی گریك وەکو زۆرێك لە میللەتانی تر بە گۆرانیی دەستپێدەکات، بەڵام کۆنترین بەرهەمێکی نووسراو کە کەوتۆتە بەردەستمان دوو داستانن، کە دەدرێنە پاڵ (هۆمەر)ی شاعیر، ئەوانیش " ئیلیادەو ئۆدیسا"ن، ئیلیادە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەو شەڕو شۆڕەیە کە لە دەشتە پڕ ڕەشەباو زایەڵەکانی شاری تەڕوادەدا ، لە ئەنجامی بێبەزەیێتیی‌و دڵڕەقێتیی"

---

[126] بڕوانە: سی– دی لویس (١٩٨٢ : ٩٧–٩٨)، د. دڵشاد عەلی (١٩٩٨: ١٠).
[127] بڕوانە: د. دڵشاد عەلی (١٩٩٨: ١٢).
[128] بڕوانە: د. محمد مندور (١٩٧٤: ٣١).

ئەسخیلۆس"، پاش ئەوەی "ترۆجان هێکتەر"ی پاڵەوانی کوشت، ڕوویداوە))[١٢٩]، کەواتە کۆنترین جۆری شیعری تۆمارکراو بریتییە لە داستان، ئەرستۆش دابەشکردنەکانی خۆی بۆ شیعر بۆ داستانو لیریکو درامای شیعریی دابەشکردووە[١٣٠]، (گۆتە)یش بەهەمان شێوە داستان و شیعری لیریکیی و دراما بە جۆرە بنەڕەتییەکانی شیعر دادەنێت[١٣١].

لێرەوە دێینە سەر دیاریکردنی جۆرەکانی شیعر:

## ١. داستان

سەردەمی داستان دەگەڕێتەوە بۆ بەرەبەیانی مێژوو(Dawn History)، قۆناغێکە هێشتا ژیانی مەدەنیی لە شارەکاندا ڕێکنەکەوتووە، سەردەمی ئیمپراتۆرییەتەکانەو شەڕە لەسەر دەسکەوت، لەم سەردەمەدا ئەدەب ئاوێزانی ئەفسانە بووە.

داستان بریتییە لە گێڕانەوەی چەند ڕووداوێکی مەزن لە بەرەبەیانی مێژووەوە، کە لە پێناوی پاراستنی غیرەتو شەرەفی نەتەوەییدا بەهۆنراوە وتراون، یان نووسراون. لەم پاڵەوانییانەدا پەیوەست بەسەردەمەکانیانەوە دەستی ئادەمیزاد تێکەڵە لەگەڵ دەستی خواوەندو فریشتەکاندا، لەبەر ئەوە شتێکی ئاساییە کە ڕووداوەکان هەموویان ڕاستەقینەنین، بەڵام بۆ جوڵاندنی چێژی ئادەمیزادو زیادکردنی توانای لە تێگەیشتنی جوانیی پەرستیی بۆ پەرەسەندنی زمانو دروستکردنی ئارامگایەکی ڕۆحیی بۆ مێشك، لە مێژووی پەرەسەندنی هونەردا ڕۆڵێکی گەورەی هەیە[١٣٢]. کەواتە داستان ڕووداوێك دەگێڕێتەوەو تێڕوانینێکی گشتگیرانەشی هەیە، داستاننووس و کەسایەتییەکانی ناو داستانەکەش بەشیان

---

[129] Herbert Joseph Muller (1965 : 37)

[130] بڕوانە : د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

[131] یا. إي. ایلسبورغ (١٩٨٠ : ١١).

[132] بڕوانە: د. ئیحسان فوئاد (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

له گێڕانەوەو ڕووداوەکاندا هەیە[133]، (د. دڵشاد عەلی)ش دەڵێت: (( یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی ئەم چەشنە هۆنراوەیە ئەوەیە کە جۆرێکی چیرۆك ئامێزەو پشت بە شێوازی گێڕانەوە دەبەستێت‌و تیایدا وەسف‌و کەس‌و گفتوگۆو پەندو ئامۆژگارییەکان تێکەڵ بەیەك دەبن‌و لە ژێر ڕوخسارێکی سەرگوزشتەیی یەکگرتووی ڕووندا دەگێڕرێتەوە))[134]، یان دەوترێت: داستان بەواتای دلاوەریی‌و ئازایەتیی دێت، باسکردنی مێژووی ڕۆژگارو ڕووداوەکانە کە لە سەرەتای مێژووی جیهاندا هاتوونەتەکایەوە، بە شیعری میللەتیش دەناسرێت‌و بۆ هەنگاوە بەراییەکانی شەڕی میللەتان دەگەڕێتەوە، تیایدا مێژوو ئەفسانە، خەیاڵ‌و واقیع، تێکەڵدەکرێن‌و شاعیر دەبێتە مێژوونوسی میللەتەکەی[135]، دیمەنەکانی داستان پڕن لە وێنەکانی وەك: (( مردن، ژیان، خۆشەویستیی، فیداکاریی، جیابوونەوە، بەیەکگەیشتن،...تاد))[136]، ئەم جۆرە، شیعری "پاڵەوانێتی Heroic Poem"یشی پێدەوترێت، بە حوکمی ئەوەی پاڵەوانێکی سەرەکیی ڕۆڵی تیادەبینێت و پاڵەوانێتییش پرۆسەی دیاری ناو ڕووداوەکانە کە شاعیر بەگێڕانەوەیەکی دوورو درێژ ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، (( داستان چیرۆکی پاڵەوانێتیی نەتەوەیی دەگێڕێتەوەو لە چەند هەزار بەیتێك پێکدێت))[137]. داستان لە سەردەمێکدا سەریهەڵداوە کە خەڵك، خەیاڵ‌و ڕاستەقینەو، چیرۆك‌و مێژوویان تێکەڵدەکرد، زیاتر بایەخیان بە خەیاڵێکی سەرکەشانە دەدا، باری ژیانی ساکاری ئەو سەردەمانە وابوو کە گونجاندن لە نێوان هۆش‌و ڕۆح‌و جنۆکەو دەستتێوەردانی فریشتەو شەیتاندا بۆ سەر ژیانی خەڵك بکرێت، ڕووداوەکانی ناو ئەلیادەو ئۆدیسای هۆمەریش بەرجەستەبووی ئەو ڕاستییەن لەو سەردەمانەدا.

---

133 بڕوانە: تزفیطان تودروف (٢٠٠٦ : ٦).

134 د. دڵشاد عەلی (١٩٩٨: ١٩).

135 بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ٤٧).

136 سەرچاوەی پێشوو (٤٨).

137 د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٥).

هەندێك سەرچاوە[138] لە ڕووی مێژووییەوە داستان بۆ سێ جۆر دابەشدەکەن:

ا. داستانی ترادیسیۆناڵ، کە بە داستانی بەرایی، یان ئاسایی، یان بناغەی داستان ناودەبرێت و ڕەسەنترین جۆرەکانی داستانە، وەك: ( ئیلیادەو ئۆدیسای گریکیی، مەهابەهاراتاو ڕامایانای هیندیی، شانامەی فیردەوسیی فارسیی،...تاد)[139].

ب. داستانی ناوەندیی، یان داستانی ئەدەبیی کە بەشێوەیەکی وەستایانە لەسەر بنەماکانی داستانی بەرایی دادەڕێژرێت، واتە شاعیر سوود لە داستانە کۆنەکان وەردەگرێت بۆ داهێنانی دەقێکی شیعریی نوێ، وەك داستانی "ئانەئید" کە لەسەر بنیاتی "ئیلیادەو ئۆدیسا" دانراوە.

پ. داستانی سێیەمین، یان داستانی سێیەم، ئەو داستانانەن کە لە دوای داستانی ناوەندییەوە هاتوون و نووسەرەکانیان لەسەر بنیاتی داستانەکانی تر لە زمانێکی دیدا دایانڕێژاون، وەك: "ڕۆستەم و سوهراب" کە شاعیری ئینگلیزیی ( ماتیۆ ئارنۆڵد) لەسەر بنیاتی "ڕۆستەم و سوهرابی شانامە" بنیاتی ناوە.

لە ڕووی بابەتیشەوە داستان دابەشدەکرێت بۆ:

ا. داستانی ئەفسانەیی، بەکۆنترین جۆری داستان دادەنرێت و وابەستەی سەردەمی پێش مێژووەو لەسەر بنەمای ئەفسانە دامەزراوە، وەك داستانی گەلگامێشی سۆمەریی، هەروەها بەشێکی زۆری داستانە ترادیسیۆناڵەکانیش دەچنە خانەی ئەم جۆرەوە.

ب. داستانی پاڵەوانێتیی، ئەو داستانەیە کە ژیانی ئازایەتیی و قارەمانێتیی پاڵەوانێك، با پاڵەوانێکی ئەفسانەیش بێت تیایدا تەوەری سەرەکیی دەبێت، وەك ژیانی ڕۆستەم لە شانامەی فیردەوسییدا.

---

[138] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ٥٢).

[139] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ( ٥٢)، د. دڵشاد عەلی (١٩٩٨: ١٩).

پ. داستانی ئایینیی یان مەزهەبیی، ئەو داستانەیە کە پاڵەوانەکەی کەسێکی ئایینیی یان مەزهەبییەو بەپێی پەیڕەوی ئەو ئایینە ڕەفتاردەکات، وەك: کۆمیدیای ئیلاهیی دانتی.

ت. داستانی عیرفانیی، ئەم جۆرە زیاتر لە ئەدەبی فارسییدا هەیەو پاڵەوانەکەی ئاوێزانی یەکێك لە ڕێبازە سۆفیگەرییەکان دەبێتو ڕێگای چوون بەرەو (فەنا فیللا) دەبێت، وەك: داستانی حەللاج، یان ( منطق الطیر)[١٤٠].

(د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ)یش لە دابەشکردنی داستانی کوردییدا* ئەم دوو جۆرە دیاریدەکات[١٤١]، کە بریتیین لە:

أ. داستانی قارەمانێتیی.

ب. داستانی دڵداریی و ئەڤین.

## ٢. شیعری لیریکیی

بە شیعری گۆرانیش ناونراوەن لەبەر ئەوەی لەسەر ئامێرێکی مۆسیقیی بەکاربراوە**، هەندێکیش بە شیعری ویژدانیی یان خودییش ناوزەندی دەکەن، چونکە زیاتر گوزارشت لە سەرنجو هەڵچوونەکانی شاعیر دەکات، هەندێك سەرچاوەش بە (شیعری عاشقانە[١٤٢])یش ناوی دەبەن.

---

[140] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ٥٢-٥٣).

* دەربارەی داستانی کوردیی، (د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ : ١٩٧٩: ٤٢)، دەڵێت: ((ناتوانین بڵێین لە کوردیدا- شتی وەك بەشە نووسراوەکەی یۆنانو ڕۆمانمان هەیە- هەروەك زۆربەی گەلانی سەرزەمینیش لەو بابەتانەیان نییە، بەڵام لە فۆلکلۆری کوردیدا گەلێك پۆیەمو ئیپۆپیا هەیە کە شەقڵە گشتییەکانی داستانی جیهانیی و داستانی فۆلکلۆرییان تیا بەدی ئەکرێ)).

[141] د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٩: ٤٣-٤٤).

** ئەوروپاییەکان زاراوەی (Lyrique)ی بۆ بەکاردەهێنن، کە لە وشەی (Layer)ەوە وەرگیراوەو بەمانای ئامێری (عود) کە ئامێرێکی مۆسیقییە، لەسەرەتادا ئەم جۆرە شیعرە بە گۆرانیی دەوتراو بەم ئامێرە مۆسیقای بۆ دەژەندرا . بڕوانە: (د. محمد مندور: ١٩٧٤ :٥٦).

[142] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ١٢٠).

یەکێك لە تایبەتییە دیارەکانی ئەم جۆرە شیعرە ئەوەیە کە (( ڕاستەوخۆ تاقیکردنەوەیەکی کەسیی دەردەبڕێ، هەر ئەمەش لە جۆرەکانی تری دادەبڕێ، چونکە جۆرەکانی تری هۆنراوە زیاتر بابەتین‌و ڕاستەوخۆش باس لە موعاناتی شاعیر ناکەن)) [١٤٣] ، لەم جۆرەدا شاعیر چەند گرنگیی بە لایەنی بابەتیی بدات‌و تیایدا بلاوببێتەوە، هێشتا هەر بە شێوەیەکی بەردەوام و ڕاستەوخۆ لەناو موعاناتی کەسیی‌و لە چوارچێوەی تێڕوانینێك لە تێڕوانینەکانی ناوەوەی شاعیردا دەمێنێتەوە[١٤٤]. لە شیعری لیریکییدا شاعیر لەناو بەرهەمە داهێنراوەکانیدا دەتوێتەوە بە جۆرێك کە ئاسان نییە کەسێتیی شاعیر بخرێتە دەرەوەی ناوەڕۆکە شیعرییەکانی شاعیرەوە (( لە شیعری لیریکی دا شاعیر لە بەرهەمەکەی جیاناکرێتەوە، ئەم جۆرە لە شیعر پێویستی بە ئامادەیی بێ چەندو چوونی شاعیر هەیە، چونکە لە بەرهەمەکەدا شاعیر پێویستە کە هەر خۆی خۆی بێت‌و نەگۆڕێت)) [١٤٥] ، (د. سیرۆس شەمیسا)یش دەنووسێت: (( هەست و سۆزە کەسییەکان بنەمای سەرەکیی ئەدەبی لیریکین)) [١٤٦].

(ن. ئەی. دوبرولیۆبۆڤ)یش، دەڵێت: (( شیعری لیریکیی بریتییە لەو ساتەوەختی گوزارشتکردنەی کە ڕەنگدانەوەی ناوەکیی شاعیرە لەسەر هەستەکانی خۆی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ)) [١٤٧] ، یان دەوترێت: شیعر لیریکیی ئەو بەرهەمەیە کەتەنها نووسەر خۆی لە دەقەکەیدا قسەدەکات‌و ئەم جۆرە دەقەش دەقێکی کاریگەرە چونکە لە قوڵایی دەروونی نووسەرەوە دێتە دەرەوە[١٤٨]. دواجار ئەم جۆرە لە شیعر بەتەنها وابەستەی هەست، یان سۆزێکی قوڵ، یان بیرێکی دیاریکراو نابێت، بەڵکو بیرێکی هونەرییانەیە کە لەشێوەی موعاناتێکی

---

[143] د. دلشاد عەلی (١٩٩٨: ٢٢).

[144] سەرچاوەی پێشوو، ڤ. ل. سکڤۆزنیکوڤ (١٩٨٦ : ٢٩).

[145] ڤ. ل. سکڤۆزنیکوڤ (١٩٨٠ : ٤٠٠).

[146] د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ١١٩).

[147] ڤ. ل. سکڤۆزنیکوڤ (١٩٨٠ : ٤٠٠).

[148] بڕوانە: تزفیطان تودروف (٢٠٠٦ : ٦).

ڕاستەوخۆدا پێشکەشدەکرێت و هەموو ئەمانەش لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، ئەم جۆرە شیعرە کە لە سەرەتادا لە شێوەی گۆرانییدا دەردەکەوت، لە ئێستادا بە هونەری قەسیدە شیعرییەکان، دەناسێنرێت[149] و بوارگەلێکی زۆری ژیانی ئەدەبیی و شیعریی لە ئەمڕۆدا داگیرکردووە، پۆلێنکردنی ئەم جۆرە شیعرە وابەستەی بنەماکانی مەبەست و واتا دەبێت و زیاتر پەیوەندیی بەناوڕۆکەوە دەبێت دواتر بە شێوازەوە، ((پۆلێنکردنی شیعری ویژدانی زیاتر پەیوەندی بە ناوەڕۆکەوە بە پلەی یەکەم هەیە ئینجا بە پلەی دووەم شێوە دێت))[150]، بەپێی ئەو دابەشکردنانەی بۆ شیعریی لیریکیی کراون، شیعری لیریکیی* لە ڕووی مەبەستەوە بۆ ئەم جۆرانە دابەشدەبێت[151]:

ا. شانازی (پیاهەڵدان):

١. شانازیی کەسیی.

٢. شانازیکردن بەنەتەوەوە.

ب. ستایش:

١. ستایشی خودیی.

٢. ستایشکردنی کەسێکی بەناوبانگ.

٣. ستایشکردنی گەل و نیشتمان.

پ. دڵداری:

١. دڵداریی ئاسایی.

٢. دڵداریی پاک و ئاشکرا.

ت. داشۆرین.

---

[149] بڕوانە: د. محمد مندور (١٩٧٤ :٥٧).

[150] نەوزاد عەلی (٢٠٠٥ : ١٩٤).

* ئەم جۆرە شیعرە نمونەی لە ئەدەبیی کوردییدا زۆرەو دەتوانین بڵێین بەشی هەرە زۆری شیعری کوردیی بەم جۆرە شیعرە نووسراون، بڕوانە: (د.دڵشاد عەلی: ١٩٩٨: ٢٣).

[151] بڕوانە: د. شوکریە رسول: (١٩٨٩ : ٢٩)، نەوزاد عەلی (٢٠٠٥ : ١٩٤).

ج. دلێری.

ح. وەسف:

١. وەسفی سروشت.

٢. وەسفی ژن.

٣. وەسفی ڕووداو.

خ. لاواندنەوە:

١. تایبەتی.

٢. گشتی.

چ. مەینۆشیی.

د. نیشتمانیی.

ر. سیاسی.

ز. کۆمەڵایەتی.

ژ. پەندو ئامۆژگاری.

س. شین.

ش. ئایینی.

## ٣. شیعری درامی

بەشیعری شانۆگەریش ناودەبرێت، ئەو جۆرە شیعرەیە کە لەسەر تەختەی شانۆ پێشکەشدەکرێت[١٥٢]،کەسایەتییەکانی ناو دراماکە دەبنە بەرجەستەکەری دەقە درامییەکەو لە بەرهەمەکاندا تەنها کارەکتەرەکان قسەدەکەن‌و جۆرێك لە نیگەرانیی لای بینەر دروستدەکەن[١٥٣]، لەم جۆرە هۆنراوەیەدا توخمە بابەتییەکە بەتەواویی دەبێتە بنەمای جیاکەرەوەی چونکە دیمەن‌و ڕووداوەکان بەچاودەبینرێن‌و کەسەکانیش بە بەرچاومانەوە دێن‌و دەچن‌و لە کاتی

[152] بڕوانە: د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٥).

[153] بڕوانە: تزفیطان تودروف (٢٠٠٦ : ٦).

هەڵسوکەوتکردن و قسەکردنیاندا دەیانبینین...، ئەو ڕووداوانەش کە لەسەر شانۆ پێکەشدەکرێن لە ژیانی مرۆڤایەتییەوە بەدەستدەهێنرێن و مرۆڤ بۆخۆی تەنها مەبەستی سەرەکییە لە شانۆگەرییەکەدا[154].

"دراما" لە کرداری (Drao)ی یۆنانییەوە وەرگیراوەو بەمانای کارکردن یان جوڵەو بزاوتن دێت، بۆیە لەهەندێك سەرچاوەدا بە شیعری بزاوتنیش ناودەبرێت[155]، کە جوڵەکەی بۆ جوڵەی سەرشانۆ دەگەڕێتەوە، ئەم جۆرەش لە یۆنانی کۆندا بۆ دووجۆری تراژیدیاو کۆمیدیا دابەشکرابوو*، لە ئێستادا (درامای نوێ[156])یش هاتۆتەکایەوە کە مەبەست پێی درامایەکی جدییە، بە درامایەکی پێکەنیناویی بەزمەساتانەش دەوترێت (شانۆگەریی پێکەنیناویی)[157]، بۆیە ئەمرۆ تراژیدیا لە چەمکی دراما‌دا ونبووەو درامای نوێش بەو تایبەتمەندییە هونەرییە کۆنانەی خۆیەوە نەماوەتەوە.

تراژیدیا وەك هونەرێکی شانۆگەریی بە کۆتایی هاتنی چەرخی کلاسیکیی واتە بەکۆتایی سەدەی حەڤدەیەم کۆتایی پێهات، لەسەدەی هەژدەیەمدا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لە غیابی تراژیدیادا هاتەکایەوە هەوڵی داهێنانی جۆری نوێ بۆ شانۆگەریی درا، وەك: کۆمیدیای فرمێسکاویی کە بەشیعر دەنووسرا، لەگەڵ درامای بۆرژوازیی کە فەیلەسوفی فەرەنسیی (دیدرۆ) بانگەشەی بۆ دەکردو بە پەخشان دەنووسرا، بەڵام ئەم جۆرانە بە بەرپابوونی

---

154 بڕوانە: د. دڵشاد عەلی (١٩٩٨: ٢٠).

155 بڕوانە: د. محمد مندور (١٩٧٤: ٦٥).

* دراما: وشەیەکی گریکیی کۆنەو وشەکە لە بنچینەدا (Dromena)بووە، بەواتای (شت کارکردن)، ئەم وشەیە لە ژێر باری ڕۆژگاردا سواوەو بووە بە (Drama– کارکردن)، لەو ڕۆژەوە شانۆ سەری هەڵداوە تا ئەمرۆ ئەم وشەیە بووە بە ناونیشانی ئەو کارە هونەرییەی کە نووسەرێك بەرهەمی دەهێنێت و دەرهێنەرێك لەسەر شانۆ بە هۆی ئەکتەرەوە نمایشیدەکات بۆ کۆمەڵە خەڵکێك. بڕوانە: (حەمەکەریم هەورامی :٢٠٠١ :٩).

156 جان ماري شيفير (١٩٩٧ : ٣٨).

157 د. محمد مندور (١٩٧٤ :٦٦).

شۆڕشی فەرەنسا لە ١٧٨٩دا کۆتاییان پێهات. لە چەرخی نۆزدەیەمدا هەردوو ڕێبازی ڕۆمانسیزمیی و ڕیالیزمیی کۆنترۆڵی بوارەکانی ئەدەبیان کرد، ئەوەی زانراوە ڕۆمانسیزم وەك ڕێبازێکی خودیی سۆزگەریی ڕووەو دراما نەچوو، بەڵکو زیاتر بایەخی بە شیعری لیریکیی دا، بەڵام دواتر لە ڕێبازی ڕیالیزمدا بایەخێکی بابەتییانە بە هونەرەکانی چیرۆك و دراما دران و ئەم ڕێبازە توانی ئەو بۆشاییەی لە سەدەی حەڤدەیەمەوە هاتبووەکایەوە لە بواری درامای تراژیدییدا پڕبکاتەوەو ئەمەش هەر ناوی لێنرا (درامای نوێ) کە درامانووسانی وەك (ئیپسنی نەرویژیی و بەرناردشۆو چیخۆفی ڕوسیی) بناغەکەیان دانا[158]. لەسەدەی بیستەمیشدا دراما لە ڕیالیزمەوە بەرەو سایکۆلۆژییەت چوو، لێرەوە چەندین ڕێبازی وەك (پێشڕەوگەریی، بێهودەیی، ئەزمونگەریی،...تاد) پەیدابوون[159]، بەڵام کۆمیدیا لەگەڵ ئەو گۆڕانانەشدا کەلە ناوەڕۆك و شێوازییدا هاتۆتەکایەوە، بەڵام تائەمڕۆش ماوەتەوە.

گفتوگۆو دواندن لە بنەمایەکی دیاری ئەم جۆرە شیعرەیە، دەقی درامیی لە کۆندا بەشیعر دەنووسراو لەسەر شانۆ نمایشدەکرا*، تایبەتمەندییەکی تری بریتییە لەوەی لە درامادا هەمیشە کێشەیەك هەیە، (د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) دەڵێت: (( دراما بابەتێکە لەسەر کێشە و ململانێ دامەزراوە، ململانێ لە نێوان خێرو شەڕ، شەوو ڕۆژ،...تاددا))[160]، (د.ئیحسان فوئاد)یش دەڵێت: (( لەگەڵ ئەوەی کە ئەم جۆرە شانۆگەرییانە حاڵەتێکی میتافیزیکییان تێدایەو بەستراونەتەوە بە خواوەندو فریشتەو هێزەگەورەکانەوە، بەڵام زەمینەیەکی زۆر بەهێزیشیان تێدایە بۆ ڕوونکردنەوەی سروشتی ئادەمیزادو شیکردنەوەی ناکۆکیی و وەسفکردنێکی

---

158 بڕوانە: د. محمد مندور (١٩٧٤ :١٢٨-١٢٩).

159 بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٩٧).

* دەربارەی هۆنراوەی شانۆگەریی لە ئەدەبی کوردییدا (ڕفیق حلمی) ئەوە ڕووندەکاتەوە کە هۆنراوەکەی (سەلام) ی شاعیر کە بەناونیشانی (مەکتەبی کوردستان)ە، یەکەمین شیعری شانۆگەرییە بە زمانی کوردی عیراق. بڕوانە: (د. دڵشاد عەلی:١٩٩٨: ٢١).

160 د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

زۆر وردو تێکەڵکردنی ڕووداوەکان بە شێوەیەك کە بەرگی ئەدەبیی هونەریی پۆشیوە))[١٦١].
ئەوەی وا لە دراما دەکات لە ئەدەبی کۆندا جێی بایەخێکی زۆربێت ئەوەیە کە دراما جۆرێکی دابڕاونییە لە جۆرە ئەدەبیی و هونەرییەکانی تر، بەڵکو پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بەبوارەکانی تریشەوە هەیە، وەك دەق، ڕۆڵی ئەکتەرەکان، بیری دەرهێنەر، پێکهاتەی شانۆ، جوڵە،...تاد[١٦٢]، هەر ئەمەشە دواجار وا لە دراما دەکات لە چوارچێوەی شیعر بێتە دەرەوەو لە ئەمڕۆدا درامای شیعریی زۆر کەمیکردووەو زۆرتر ڕووەو پەخشان هەنگاوی ناوە[١٦٣].
بەگشتیی ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی دراما[١٦٤] بریتیی دەبن لە:

- تەکنیك یان چنین.
- کەسانی ناو دراما.
- کەسێتیی کەسانی ناو دراما.
- مەغزای دراما.
- دیالۆگ.
- ژینگەو دەوروبەر.
- گرێ.
- ململانێ.
- کات*.

هەندێك سەرچاوەی تریش بنەماکانی ( دیالۆگ، کارکتەر، هۆنینەوەی شانۆیی) بە سەرەکیترینی ئەم بنەمایانە دادەنێن[١٦٥].

---

161 د. ئیحسان فوئاد (٢٠٠٥ : وانەکانی خوێندنی باڵا).

162 بڕوانە: م. س. گورگینیان (١٩٨٠ : ٥٦٥).

163 بڕوانە: د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٥).

164 بڕوانە: حەمەکەریم هەورامی (٢٠٠١ : ٢٢–٤٥).

* ئەم ڕەگەزە، لە ڕەگەزبەندییەکەی حەمەکەریم هەورامی (٢٠٠١)دا نییە، بەڵام لەبەربایەخی زەمەن لەهەر کارێکی هونەرییدا بەپێویستمان زانی زیادی بکەین.

خودی دراما بۆ ئەم جۆرانە دابەشدەبێت:

ا. تراژیدیا: پیشاندانی کاری گرنگو جدییە کە لە کۆتاییدا بە زیانی پاڵەوانی سەرەکیی دراماکە تەواودەبێت[١٦٦].

ب. کۆمیدیا: زیاتر دەقێکە پێکهێنراوە بۆ ڕەخنەگرتن لە باری کۆمەڵایەتیی، بە ئومێدی چارەسەرکردن، بەشێوەیەکی تەنزئامێز یان شێوازێکی سەرگەرمکەرانەی خۆشیبەخش، بە ئاراستەیەك کە بابەتێکی جدیی لە ژێر پەردەیەکی گاڵتەجاڕییانەدا پیشانبدات[١٦٧].

توێژەرو ڕەخنەگرە فەرەنساییەکان، کۆمیدیا بۆ چوار جۆر دابەشدەکەن:

- کۆمیدیای ڕۆمانتیکیی، ڕووداو بابەتەکان بابەتی عەشقو عاشقانەی نێوان ژنو پیاون.
- کۆمیدیای تەنزئامێز، پیشاندانی ئەو کەسانەیە کە دابونەریتو یاسا گشتییە ئەخلاقییو کۆمەڵایەتییەکان ڕەچاوناکەنو بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتیی ڕەخنەیان لێدەگرێت.
- کۆمیدیای ڕەفتاری، خووڕەوشتی ناشیرینی گەورەکان پیشاندەدات.
- کۆمیدیای فارس (Farce)، وشەیەکی فەرەنسییە بە شانۆگەریی هەزەلییانە دەوترێت، کەتەنها بۆ پێکەنین و هیچ ئامانجێکی کۆمەڵایەتیی یان ئاکاریی لە پشتەوە نییە[١٦٨].

( د. عەزیز گەردی)یش کۆمیدیا لای یۆنانییەکان[١٦٩] بەم شێوەیە دابەشدەکات:

- کۆمیدیای کۆن (کۆمیدیای ڕەخنە).
- کۆمیدیای ناوەڕاست (کۆمیدیای کۆمەڵایەتیی).

---

[165] بڕوانە: دانا عەلی سەعید (٢٠٠٣ : ٢٢).

[166] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ١٣٣).

[167] سەرچاوەی پێشوو: (١٤٤).

[168] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ :١٤٤- ١٤٥)، د. محمد مندور (١٩٧٤ :١٢٩).

[169] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٩٣).

- کۆمیدیای نوێ (کۆمیدیای کەسەکان).

پ. میلۆدراما: تێکەڵاوکردنی هەردوو جۆری تراژیدیاو کۆمیدیایە، لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمەوە هاتە کایەوە، بە تایبەتیی لە بەرهەمەکانی (ڕینی چارلس ١٧٧٣-١٨٤٤)ی فەرەنساییدا دەرکەوت، دواجار ئەم جۆرە لە دراما بەرەو درامای نوێ هەنگاوی نا، کە کارەکتەرەکانی تەنها بەکەسانی پایەبڵندو چاکو بەرێزەوە نانیشنەوەو ڕووداوەکان هەموو ڕووداوی دڵتەزێن، یان خۆشیهێن نین، بەڵکو تێکەڵاوییەکی گونجاو لە نێوانیاندا پێکهێنراوە[١٧٠].

## ٤. شیعری فێرکاری

ئەو شیعرانەن کە ئامانجیان فێرکردنە، بۆیە لە دووتوێیاندا پەندو ئامۆژگاریی و هەواڵو زانیاریی بەدیدەکرێن[١٧١]، لەم جۆرەدا لەڕێی ڕەگەزە گرنگەکانی شیعرەوە کە کێشو سەروان پرۆسەی لەبەرکردنو زانیاریی وەرگرتن ئاساندەکرێنو (( بەهۆیەکی فێرکردنی ڕاستەقینەکان دەزانرێت))[١٧٢]، هەوڵدانێکە بۆ خستنەڕووی بابەتە ئەخلاقییو ئایینییو مەزهەبییو زانستییو فەلسەفییەکان لە چوارچێوەی ئەدەبدا*، نمونەی ئەم جۆرە لە ئەدەبی جیهانییدا، لە بەرهەمی (لەبەردەرگای سروشتدا De Rerum Natura)ی (لۆکرتیۆس)ی شاعیرو فەیلەسوفی ڕۆمییە، کەلە چەرخی یەکەمی پێش زاییندا دایناوە، دواتریش بیروباوەڕەکانی فەیلەسوفی یۆنانیی (ئەپیکور) و لەعەرەبیشدا ئەلفییەی (ئیبن مالیك) دەبنە نمونەی ئەم جۆرە شیعرە[١٧٣].

---

[170] بڕوانە: حەمەکەریم هەورامی (٢٠٠١ : ٧٠).

[171] بڕوانە: د. دڵشاد عەلی (١٩٩٨: ٢١).

[172] د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٥).

* لەئەدەبی کوردییشدا ئەم هونەرە لەسەر دەستی (ئەحمەدی خانیو شێخ مارفی نۆدێ) دا بە ئەدەبی کوردیی ئاشنا بووە. بڕوانە: (د. دڵشاد عەلی :١٩٩٨: ٢١).

[173] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ :٢٤٧).

له مێژووی ئەدەبی ئەورووپیدا وای بۆ دەچوون کە شۆڕشی ڕۆمانسیزم کۆتایی بە شیعری فێرکاری هێناوە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەم جۆرە تێڕوانینە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ( بۆدلێر)، کە دەڵێت: (( شیعر ناتوانێ لاسایی زانست بکاتەوە، ئەگەر ئەمەبکا، خۆی فەرمانی مەرگ بۆ خۆی دەردەکا، شیعر سەر بە حەقیقەت نییەو شتێکی لەم جۆرەشی هەڵنەگرتووە، شیعر تەنیا سەربەخۆیەتی))[١٧٤]، بەڵام ئەم تێزو بۆچوونانەش زیاتر لە تێڕوانینێکی کەسییدا ماونەتەوەو نەیانتوانیوە کۆتایی بەم جۆرە لە شیعرو ئەدەبیات بێنن، بە تایبەتیش لە ئێستادا فێرکردن و پەروەردەکاریی سنوری شیعریشیان بڕیوەو لە چیرۆك و دراماو سینەمادا بایەخگەلێکی زۆریان پێدراوە.

## ٥. شیعری ساتیرا

لە بنەڕەتدا وشەیەکی لاتینییە کە بە (Satira) ناودەبرێت[١٧٥] و شێوازێکی کۆمیدییانەیە و لە پیشاندانی مەبەستەکانیدا خۆی وابەستەی یاساو بەهاکۆمەڵایەتییەکان ناکات، شێوەیەکە لەشێوەکانی ڕەخنەی ئەدەبییانە کە تیایدا ڕەخنە کۆمەڵایەتییەکان بەرجەستەدەبن، زۆرێك لە سەرچاوەکان ئەم جۆرە ناخەنە ناو ڕیزبەندیی جۆرەکانی شیعر یان ئەدەبەوە، بە بەڵگەی ئەوەی ساتیرا ناتوانێت تایبەتمەندیی جیاکەرەوەی خۆی لە جۆرەکانی تر بسەلمێنێت و لێکەوتەی یەکێك یان چەند دانەیەك لە جۆرە شیعریی یان ئەدەبییەکانی ترە، بۆیە وەك جۆرێکی ئەدەبیی سەربەخۆ ئەژمارناکەن[١٧٦]. بەڵام ئەمجۆرە لەگەڵ تازەیی داهاتنیدا زیاتر لە بواری ڕۆژنامەگەرییدا بەکاردەهێنرێت وەك شێوازێك بۆ ڕەخنەی داپۆشراو یان تەنزی ئاراستەکراوی ئامانجدار، ئەمە لەکاتێکدا کە ناتوانین لە ڕووی مەبەستەوە ئەو دەقانە بە ساتیرا نەزانین کە بە شێوەیەکی

---

[174] د. موحسین ئەحمەد عومەر (٢٠٠٥ : ٨٦).

[175] بڕوانە: یا. إي. ایلسبوغ (١٩٨٠ :١١).

[176] بڕوانە: یا. إي. ایلسبوغ (١٩٨٠ :١١)، یا. إي. ایلسبوغ (١٩٨٦ :٩)،

ڕەخنەگرانەی ئامانجدارانەی ڕاستەقینانە دەنوسرێن‌و نمونەشیان لە ئەدەبی فۆلکلۆریی‌و میللیی‌و کلاسیکیی‌و ڕیالیزمیشدا زۆرە، هەندێکیان بەشێکی دیاری شیعری داشۆرین پێکدەهێنن.

## ٦. پەخشانە شیعر

لە پرۆسەی گەشەکردنی بەردەوامی چەشنەئەدەبییەکان‌و ئاوێزانبوونی هونەرەکانی ئەدەبدا بەیەکترو لەو تەوژمە لەخۆوەی لێوەی دەدوان‌و لە تێکئالانی پەخشان بە شیعرەوە، هونەرێکی نوێ هاتەکایەوە کە ئەویش "پەخشانە شیعر"ە، واتە پەخشانێکی بە شیعر نووسراو، هەرچەندە ڕەگی ئەم جۆرە هونەرە لە چیرۆکە شیعری سەردەمی درامای یۆنانییەوە ڕیشەداردەبێت، بەڵام دواجار وەك هونەرێکی سەربەخۆ دێتەکایەوە. (سۆزان بێرنار) دەڵێت: (( پەخشانە شیعر پەیوەندیی بەدۆزینەوەی زمانێك و ملکەچکردنی وشە ئاساییەکان بۆ مەبەستی زۆر تازەو نووسین لە پێناوی ئەفراندنی جیهانێکی نوێوە هەیە...))[١٧٧]،فەرهەنگی یاریدەدەری –ئۆکسفۆرد– دەنووسیت: پەخشانە شیعر ((پەخشانێکە شێوازو ئەدگارەکانی شیعری هەیە))[١٧٨]، فەرهەنگی ویبستەریش دەنووسێت: (( پەخشانێکە چەند سیمایەکی هونەریی‌و ئەدەبیی شیعری هەیە، وەك ڕیتمی ڕێکخراوو داڕشتنی نمونەیی‌و گەرمیی سۆزو ئەندێشە))[١٧٩]. ئەوەی بەم پێناسانەدا دەردەکەوێت ئەوەیە کە تا ئەمڕۆش پەخشانە شیعر وەك جۆرێکی سەربەخۆی ئەدەبیی پۆلبەندنەکراوەو زیاتریش دەبرێتەوە سەر خانەی شیعر، ( د. زاهیر لەتیف)یش دەڵێت: (( پەخشانە شیعر سەر بە شیعرە نەك پەخشان))[١٨٠]. ئەمەش یەکێکی تر دەبێت لەو جۆرە نوێیانەی گەشەی ئەدەبیی دەیانهێننەکایەوە

---

177 د. محەمەد بەکر (٢٠٠٤: ٣٠).

178 د. عبدالستار جواد (١٩٩٠ : ٤٧).

179 د. محەمەد بەکر (٢٠٠٤: ٣١).

180 د. زاهیر لەتیف (٢٠٠٦ : چاوپێکەوتن).

، بەڵام ئەوەی خاڵی بایەخدارە بۆ گەڵاڵەبوونی پەخشانە شیعر وەك جۆر، ئەوەیە کە ژوانی تێکەڵاوبوونی دوو چەشنی سەرەکیی ئەدەبە کە شیعرو پەخشانن، بەمەش نووسەر لەلایەك لە سیستەمو پێوانە شیعرییەکان دەربازیدەبێت و دواجاریش پەخشان لە بونیاتێکی بێگیانەوە دەکاتە جەستەیەکی زیندوو، ئەفراندنی نووسەر لێرەوە دەروازەیەکی فراوانی داهێنانی لە بەردەمدا دەکرێتەوە.

پەخشانە شیعر بایەخێکی ئەوتۆ بە کێش نادات، (( ئەگەرچی کێش شتێکی چەسپاو نییە، بەڵام شیعر هەمیشە کێشی هەیە، ئەوە پەخشانە شیعرە کە کێشی تێدا ڕەچاو ناکرێت))[181]، بەڵام لە ڕیتمی ناوەوەی ئاوازەکێشێکی مۆسیقیی بەرجەستە دەکات و لە ڕێی سەرواوە زۆرجار دەتوانێت بەرهەمەکە لە قسەیەکی سادەوە بکاتە داهێنانێکی هونەریی.

## ٤/١) پەخشان

هەندێك لە سەرچاوەکان مێژووی پەخشان بۆ پێش مێژووی شیعر دەبەنەوە، بەو بەڵگەیەی کە مرۆڤ بەرلەوەی لایەنە جوانکارییەکانی ئاخاوتن فێربووبێت، بە پەخشان لەگەڵ دەوروبەرو بەرامبەرەکانیدا دواوە، بەڵام مەبەستی لێکۆڵینەوەکەمان لەم ڕیزبەندییەدا بوارەکانی ئاخاوتن نییە، بەڵکو کارکردنە لەسەر ئەو بەڵگە دەستنووس یان چاپکراوانەی کە لە مێژووی دێرینەوە بۆ مرۆڤایەتیی ماونەتەوە، لەمەشدا پەخشان کەوتۆتە دوای شیعرەوە، هۆکانی ئەم دواکەوتنەش زۆرن، لەوانە ئەگەر شیعر بەرهەمی کۆمەڵگا بەرایی و کشتوکاڵییەکان بێت، ئەوا پەخشان بەرهەمی کۆمەڵگای بازرگانیی، یان پیشەسازیی، یان کۆمەڵگای زانینگەراییە. هەروەها شیعر بەهۆی مۆسیقاو

---

[181] فوزي كريم ( ٢٠٠٣ : ١٢٨).

کێش و سەرواوە دەتوانێت لەبەربکرێت، بەڵام پەخشان توانای ئاسان لەبەرکردن و هەڵگرتنی ئاوەزییانەی نەبووە[182].

## ۱/٤-۱) چەمکی پەخشان

پەخشان* بریتیی دەبێت لە دەرخستنی ئامانجێکی دیاریکراو بە هۆی ڕستەی چەسپاوو دەربڕینی ساکارەوە بە جۆرێك کە داڕشتنی ڕستەکان پشت بەواتای ئاشکراو دیار ببەستن و پەخشان وابەستەی توخمی (بیر) دەبێت و لە ناو توخمەکانی بیرو سۆزو ئەندێشەو دەستەواژەکاندا، بیر ئاستی یەکەمی بایەخی پەخشان داگیردەکات[183].

لە ڕووی پێناسەی گشتیی ئەدەبەوە، پەخشان بە قسەیەکی زۆری هونەریی ڕێکنەخراو دەوترێت کە شیعر نەبێت[184]، (ئیبن خەلدون)یش دەڵێت: (( پەخشان قسەیەکی بێ کێشە))[185]. لە پەخشاندا ئەو وابەستەیی و قاڵبەندییەی شیعر بەدیناکرێت، بۆیە ئەم هونەرە ڕووبەرێکی کراوەترە لەبەردەم کەسانی دەرەوەی بازنە ئەدەبیی و هونەرییەکانیشدا، هەر ئەمەش وای لە پەخشان کرد کە لەگەڵ داهاتنیدا بەخێرایی بڵاوبێتەوە و بێتە شێوازی نووسینی سەردەم لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیانی مرۆڤایەتییدا، دیارە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە پەخشان بەدەربێت لە لایەنی جوانکاریی و پەیڕەوەهونەرییەکان، بە پێچەوانەوە لە

---

[182] بڕوانە: عەزیز گەردی (۱۹۸۷: ٤-٥).

* پەخشان لە زمانی کوردییدا، (( بە شتێك وتراوە و ئەوترێ کە بڵاوبکرێتەوە، واتە: شتەکەی پەخشان پەخشان کردووە وەیا ئەڵێ: "پەخش و بڵاوکردەوە"، ئەم وشەیە چاوگی ئەلفییەو وێنەی زۆرە لە زمانی کوردیدا وەکوو" پێچ، پێچان. بێژ. بێژان. پەخش، پەخشان")) بڕوانە: (عەلائەدین سەجادی : ۲۰۰۰ :۱۹).

[183] بڕوانە: د. شکریە رسول (۱۹۸۹ : ۱۲۲-۱۲۳).

[184] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (۱۲٥).

[185] سەرچاوەی پێشوو .

پەخشانیشدا ئەم لایەنانە پەیڕەودەکرێن و زیاتریش وابەستەبوون بە سیستمی گراماتیکیی زمانەوە بەدیدەکرێت (( پەخشانیش وەك شیعر هونەرکاریی تیادا دەکرێت و بە هونەرێکی وردیش ململانێی لەگەڵ ڕەوتەکانی داهێناندا کردووە))[١٨٦].

( هیگل) پێی وایە: ژیان لە گۆڕاندایە، لە ناهۆشمەندییەوە بۆ هۆشمەندیی، لە هۆشمەندییەوە بۆ هۆشمەندییەکی زیاتر تا ئەو کاتەی هۆش هەموو خود داگیردەکات، لەم قۆناغەدا مرۆڤایەتیی لە شیعرەوە بۆ پەخشان دەپەڕێتەوە[١٨٧].

ڕۆڵی ڕۆژنامەگەریی و داهاتنی چاپ و کردنەوەی قوتابخانەکان و بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیریی و کتێب بڵاوکردنەوەو ئاسان بوونی کۆمۆنیکەیشن و ئاڵوگۆڕە نێومرۆیی و نێودەوڵەتییەکان، ڕۆڵێکی بایەخداریان لە گەشەسەندنی پەخشاندا بینی، لەدەرکەوتنی ڕۆژنامەوە پەخشان زیندووانەتر دەرکەوت و بووە هاوسەنگێکی تری شیعر[١٨٨]، ( د. کەمال فوئاد)یش دەڵێت: ((تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم کورد تەنیا زمانی شیعربووە نەك نووسین، لەبەر ئەوە دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستان لە ساڵی ١٨٩٨دا بایەخێکی تایبەتی ی هەیە لە مێژوی زمان و ئەدەبی نەتەوەکەماندا))[١٨٩]، ئەمە نەك هەر لای کورد بەڵکو لای هەموو نەتەوەکانی تریش، ڕۆژنامە مینبەری بڵاوکردنەوەی پەخشانەو پەخشان زادەو زەخیرەی ڕۆژنامەیە، هەمیشە ئەو کاتە پەخشان گەشاوەتەوە کە ڕۆژنامە کەوتۆتە جوڵەو چالاکیی[١٩٠].

لێرەوە چەند تایبەتمەندییەکی پەخشان دەخەینە ڕوو، کە لێکۆڵینەوەو ڕیزبەندکردنیان وابەستەی هەمان ئەو تایبەتمەندییانەیە کە لە لاپەڕە (٣٩-٤٧)ی ئەم نامەیەدا دەربارەی شیعر کردومانن:

---

[186] نەوزاد عەلی (٢٠٠٥ : ٢٠٥).

[187] بڕوانە: حنا عبود (٢٠٠٢ : ٧).

[188] بڕوانە: د. شکریە رسول (١٩٨٧ : ٣٧).

[189] د. کەمال فوئاد (١٩٧٢ : پێشەکی).

[190] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٩).

١. كێش لە پەخشاندا ڕەگەزی سەرەكیی نییە (( پەخشان كێشی نییە، یان كێشی دیارو تایبەتی نییە))[١٩١]، ئەوەی هەیە زیاتر ڕیتمی ناوەوەیە، (( پەخشانیش جۆرە ئاوازێكی تێدایە لە بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی دەنگ لە كاتی قسەكردن‌و دووبارە بوونەوەی سەروای سەجعدا هەستی پێ دەكرێ، ئەمە هەمووی مۆسیقایە بەڵام نەخراوەتە قاڵبی ڕێك‌و یاسای پێك هاتنی نییە))[١٩٢].

٢. سەروا لە پەخشاندا بە جۆرێكی جیا لە شیعر دەردەكەوێت، ئەمەش هەموو جۆرەكانی پەخشان ناگرێتەوە، بەڵكو تەنها لەو جۆرەیاندا هەیە كە بە پەخشانی سەروادار* ناودەبرێت، سەروا جوانیی و جۆرێك لە مۆسیقاو ڕیتمی ناوەوەش دەداتە پەرەگرافەكان‌و كاریگەریی بۆ سەر وەرگر زیاتردەكات، (( سەروا جۆرە جوانییەك بە پەخشانەكە دەداو كاریگەری زیاد دەكا))[١٩٣]، كەواتە سەروا لە پەخشاندا بۆ لایەنی جوانییە (( لە پەخشاندا سەروا شتێكی وا پێویست نییە، ئەگەر هەشبێ بۆ جوانییە))[١٩٤].

٣. مۆسیقا دیسانەوە پایەیەكی سەرەكیی پەخشان نییە، ئاوازی دەق‌و مۆسیقای دەق پەیكەری دەقێكی بە پەخشاننووسراو پێكناهێنێت، پەخشان دەیەوێت دەق زیاتر بەرەو ڕووە زانستییەپەتییەكەی بەرێت نەك هونەر.

---

191 سەرچاوەی پێشوو (١).

192 عەزیز گەردی (١٩٩٩: ٦٧).

* پەخشانی سەروادار ئەو پەخشانەیە كە هەڵوێستەكانی سەروایان هەیە، وادەبێت دوو هەڵوێست، یان سێ هەڵوێست یان چوار هەڵوێست سەروایان هەبێت. بڕوانە: (عەزیز گەردی:١٩٨٧: ٥).

193 عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٥).

194 سەرچاوەی پێشوو (١).

٤. پەخشان وابەستەی زەین‌و بیرە، بیرمەندانە دەنووسرێت‌و کاریش لە بیری بەرامبەر دەکات، ((پەخشان لە ژیریی ئەقڵەوە پەیدا ئەبێ))[١٩٥]، بابەتییانە دەجولێت‌و دەیەوێت لایەنی هەستگەرایی سۆزدارانە ڕووەو ئاراستەیەکی هەستگەرایی بابەتییانە بەرێت‌و هۆشمەندانە مامەڵە لەگەڵ پێکهاتەکانیدا دەکات (( پەخشان لە ئەقڵ‌و ئاوەزەوە دێ، واتە: پەخشان زمانی ئەقڵ‌و ژیرییە))[١٩٦].

٥. زمانی پەخشان، زمانێکە دور لە ئاڵۆزیی، ئەرکی شیکردنەوەو ڕاڤەکردن‌و دەرخستن‌و ناساندنی زاراوەو بیرو چەمکەکانی هەیە، پەخشاننووس دەخوازێت ئەو وشانەی بەکاریان دەبات هەڵگری واتای زۆرو لێکدانەوەی جیاوازنەبن لانی کەم لە دەقەکەدا، بۆ ئەوەی تێگەیشتن دروست ببێت، چونکە بەشێکی زۆری جۆرەکانی پەخشان لە ڕێی خوێندنەوەوە وەردەگیرێن، بۆیە دەشێت دەق توانای واتابەخشینی تەواوی بۆ خوێنەر هەبێت، ((پەخشان زیاتر پێویستی بە لۆژیك‌و ڕونیی‌و ڕیزبەندیی هەیە))[١٩٧]، ئەو خەستکردنەوەو چڕییەی لە شیعردا هەیە لە پەخشاندا نییە[١٩٨]، ((زمان لە پەخشاندا زمانی شیکردنەوەیە ( تحلیلی)یە، پەخشان کە بیرکردنەوەیە بیرکردنەوەش پێویستی بە شیکردنەوە هەیە))[١٩٩]، لەلایەکی ترەوە ئەگەر وشەکانی دەقێکی بە پەخشاننوسراو بگۆڕین، یان شوێنیان بگۆڕین، دەتوانین هەمان واتای مەبەستدار بگەیەنین، چونکە دواجار وابەستەی لایەنە زمانەوانییەکانی زمانێکی دیاریکراو دەبێت، کە پەیڕەوبەندانە کاری تێدادەکرێت، (( لە

---

[195] عەلائەدین سەجادی (٢٠٠٠ :٦).

[196] عەزیز گەردی (١٩٨٧: ١).

[197] د. شکری عزیز الماضي (١٩٨٥ : ١٠٤).

[198] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٢).

[199] عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ١٠).

پەخشاندا ئەگەر وشەکانیشی نەمانو هی تریان هاتەجێ ماناکەی هەر دەمێنێ)) [٢٠٠].

٦. دارِشتنی دەق لە پەخشاندا، وابەستەی سیستمە گراماتیکییەکانی هەر زمانێکی دیاریکراوە، پەخشاننووس ناتوانێت پەیرەوە رِێزمانییەکان لەخۆوە بگۆرِێت، بە تایبەتییش لە پێکهێنانی رِستەسازییانەی رِستەکاندا وابەستەی دەستوورو یاسا رِێزمانییەکان دەبێت (( رِستە دەبێ رِێچکەی تایبەتی خۆی بگریْ، ئەو گۆرِان و پاشو پێشکردنەی لە هۆنراوەدا هەیە لە پەخشاندا رِێی نەدراوە)) [٢٠١].

٧. هونەرە رِەوانبێژییەکان لە پەخشاندا کەمتر بەکاردێنو ئەگەر بەکاریش هاتن بۆ رِونکردنەوەی مەبەستو دواندنی هۆشو لۆژیکن [٢٠٢].

٨. خەیالْ لە پەخشاندا سنوردارە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرِێتەوە کە لە پەخشاندا کار لەسەر بنەما هەستییەکان دەکرێت بۆ ئەوەی وێنەی چەسپاو لە هزرماندا بەرجەستە بکات، ئەگەر خەیاڵیش هەبێت نووسەری پەخشان دەیەوێت ئەو خەیاڵەمان لە تاك رِەهەندیی خەیاڵی وێناکراوی خۆیدا کۆبکاتەوە.

٩. لاسایکردنەوە لە پەخشاندا خۆی بە قاڵبێکی دیاریکراوەوە نابەستێتەوە، هەر ئەمەش وادەکات دەیان جۆر وتارو بابەتی نووسراوی تر لە پەخشان بکەونەوە بێئەوەی پێوانەیەکی دیاریکراوی پێوانەییان بۆ دیاریکرابێت.

١٠. تاقیکردنەوەو ئەزمونی تاکەکەسیی وەك چۆن لە شیعردا گرنگن، لە پەخشانیشدا گرنگن، بەڵام ئەوەی هەیە لە پەخشاندا نووسەر دەتوانێت بێ هەبوونی ئەو ئەزمونگەلە خودییەی خۆی دەق بەرهەمبهێنێت، واتە

---

[200] سەرچاوەی پێشوو (١٢).

[201] عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٢).

[202] بروانە: سەرچاوەی پێشوو.

له نووسینی پەخشاندا تاقیکردنەوە بۆ پێکهێنانی دەقێکی داهێنەرانە، مەرجی بنەڕەتیی نابێت.

دەربارەی دابەشکارییەکانی پەخشانیش، چەند جۆرێك دابەشکردن هاتونەتەکایەوە، یەکێك لەو دابەشکردنانەش لەڕووی شێوازەوەیە[٢٠٣] کە بۆ ئەم جۆرانە دابەشیدەکات:

١. شێوازی ئامانجدار، یان بڕوادروستکردن (ئیقناع)، ئەو شێوازەیە کە ڕامیارو پارێزەران بۆ هێنانە سەرباری گوێگرەکانیان پەیڕەویدەکەن، شێوەی ڕێکخستنی بابەتەکان بە شێوەیەکی زانستیی بابەتانە دەبێت.
٢. شێوازی خستنەڕووی ڕاستەوخۆ، وەك ئەو شێوازەی لە وانەبێژیی و وتاردانو بابەتە زانستییە جۆراوجۆرەکاندا پەیڕەو دەکرێت، ئیتر گرنگ نییە ئەو بابەتانە بابەتی هۆشمەندانەبن یان پەسنکەرانەبن.
٣. شێوازی ئامۆژگاریی، ئەو شێوازەیە کە لە کۆنەوە مامۆستاو زانا ئایینیی و مەزهەبییەکان لەبەرامبەر پەیڕەوکەرانی خۆیاندا بەکاریدەبەن.
٤. شێوازی باو، ئەو شێوازەیە کە لە گێڕانەوەی سەرپێییانەی ڕووداوەکانی ڕۆژدا پەیڕەودەکرێت و تیایدا بایەخ بە گێڕانەوەی ڕووداو یان کەس یان کات دەدرێت، بێئەوەی گوێ بەلایەنە جوانکاریی و چەشەبەخشەکان بدرێت.
٥. شێوازی مۆرکراو، ئەو شێوازەیە کە خۆی لە دوو جۆر بواردا دەبینێتەوە: بواری وتاری ڕەسمیی، لەگەڵ بواری بۆنەخێزانیی و گشتییەکاندا، لە ئێستادا ئەم جۆرە بۆ شێوازی بابەتیی پەرەیسەندووە، ئەو شێوەیەیە کە نووسراوی ڕەسمیی یان نامەی تایبەتیی پێدەنووسرێت و بە سڵاو دەستپێدەکات و بە ئیمزا یان مۆرێك کۆتایی دێت.

---

[203] بڕوانە: د. عصام الخطیب (١٩٨٦ : ١٤-١٦).

ئەم شێوازانە دەشێت یەکێکیان یان هەموویان لە پەخشانێکی هونەرییدا یان لە پەخشانێکی زانستییدا پەیڕەوبکرێن، واتە مەبەست لێیان ئەو شێوازی مامەڵەکردن و خستنەڕووی بابەتانەیە کە پەخشانبەندانە دەنوسرێن.

( عەلائەدین سەجادی[٢٠٤] )یش لە ڕووی ڕوخسارەوە، پەخشان بەم جۆرە دابەشدەکات:

١. پەخشانی سادەو ساکار، کە دوورە لە هەموو شێوەیەکی ڕەوانبێژیی مەبەستدارانە، وەك گفتوگۆی نێوان دوو کەس، یان گێڕانەوەی سەرگوزشتەیەك، یان وتارێکی ساکار دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو، یان ڕاڤەکردنی بابەتێکی بیرکاریی یان جوگرافیی، یان هەر زانستێکی تر.

٢. پەخشانی هونەریی، ئەوەیە کە هەموو لایەنە هونەرییەکانی تێدایەو شێوەیەکی ئەدەبیی لە خۆدەگرێت، بە پەخشانی ئەدەبیش ناودەبرێت، ئەمیش دەبێت بە دوو بەشەوە:

أ. پەخشانی مرجز، ئەو جۆرە پەخشانەیە کە کێشی هەیەو سەروای نییە.

ب. پەخشانی سەروادار، ئەم جۆرەیان بە پێی تایبەتمەنیی جۆرەکانی کێش و سەروای هەیە، کە دەشێت بە (شیعرە پەخشان)یش ناویببەین و بۆ سێ جۆر دابەشدەبێت:

- هاوڕوو (متوازي)، دوو ڕستەی بە دوایەکیدا هاوسەروان.
- هاوسەر (مطرف)، دوو ڕستە یان زیاتری بەدوایەکیدا هاوسەروان.
- هاوکێش (متوازن)، دوو ڕستە یان زیاتری بەدوایەکیدا هاوکێش و هاوسەروان.

دابەشکردنێکی تری پەخشانیش[٢٠٥] بەمجۆرەیە:

---

[204] بڕوانە: عەلائەدین سەجادی (٢٠٠٠ :٢٠-٢١).

[205] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٤-٥).

١. پەخشانی زارگوتن، ئەوەیە کە هێشتا تۆمارنەکراوەو خەڵك دەماودەم بۆ یەکتری دەگێڕنەوە.
٢. پەخشانی نووسراو، ئەوەیە کە نووسرابێتەوەو ئەمیش دوو جۆرە:
أ. پەخشانی فۆلکلۆریی، کە بۆ ئەم بەشانە دابەشدەبێت[٢٠٦]:
- ئەفسانە، وێنەی کێشەی نێوان دێو درنجو ئادەمیزاد دەکات بە نیشانەی ئەو کیشەیەی لە زۆر کۆنەوە لە کۆمەڵی ئادەمیزاددا و لە نێوان هێزی چاکەو خراپەدا یان هێزی خێرخواو هێزی خراپەو بەددا بەرپابووە.
- چیرۆك، سەرگوزشتەی فۆلکلۆرییو حیکایەتیشی پێدەڵێن، بەرەو پێشچوونێکی مێژوویی ئەفسانەیە، لە ڕووی فۆڕمو دارشتنەوە لەو دەچێت، هەرچەندە لە ڕووی کەرەسەو ناوەڕۆکەوە هەندێك جیاوازییان هەیە، کەرەستەی چیرۆك لە ژیانەوە وەردەگیرێتو سێ شێوەی هەیە: ١. کەرەستەکە خودی مرۆڤە. ٢. کەرەستەکە ئاژەڵو گیانلەبەرانی ترن، چیرۆك یان داستان یان ئەفسانەیەکی بچکۆلەیە، بەڵام کەسایەتییەکان لە گیاندارو ڕووەك پێکدێنو لە شێوەی ئادەمیزاددا دەدوێنو هەمیشە ڕووخسارێکی ئەخلاقییان هەیە بۆ مرۆڤ[٢٠٧]. ٣. کەرەستەکە مرۆڤەو لە سەر زاری گیانلەبەرانی ترەوە شتەکان دەگێڕێتەوە[٢٠٨].
- داستان، بە جۆرە ئەدەبێکی هونەرمەندانە دەڵێن کەکەرەسەی ڕاستەو ڕاستی شتێکی بابەتیی بێت، ڕاستیی ژیان لە دەروونی خاوەن بەرهەمەکەوە دەهێنێتە دەرەوە. داستان بەرهەمێکی

[206] بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٩)
[207] بڕوانە: د. موحسین ئەحمەد عومەر (٢٠٠٥ : ١٧).
[208] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ٢٤٩-٢٥٠).

چیرۆکئامێزە، لە فۆڕمی وێنەدا، باری ژیان‌و بوونی گەل‌و پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی‌و نەخشەی بەرەوپێشچوونی مێژوو دەردەخات[٢٠٩].

- پەندی پێشینان‌و قسەی نەستەق، پەندی پێشینان خۆی لە خۆیدا ئەنجامێکە کە ژیریی گەل لە سەر بناغەی دنیادیدەیی‌و ئەزمونێکی دەوڵەمەند گەیشتویەتێ، لە ناوەڕۆکدا پەندی پێشینان لە قسەی نەستەقەوە نزیکە، بەڵام هیچیان جێی ئەوی تریان ناگرنەوە، قسەی نەستەق کەمتر مەبەست دەدات بە دەستەوە، واتە مەبەستەکە لە قسەکە خۆیدا دەرناکەوێت، ئەم دوو شێوەیە ڕستەو وتەی کورتن‌و مانای فراوان‌و قوڵیان تێدایە[٢١٠]. شێخ محەمەدی خاڵ دەڵێت: ((پەندی پێشینان ووتارێکی کورتی ڕێك‌وپێکی جوانی بەتامی بەتەوژمی بەتینی کاری گەرە کە لە دڵ‌و دەروونێکی بێداری ئاوەدانی ئاگاداری پێشینانەوە هاتبێتە دەرەوە، لە پاش بەراوردو تاقی کردنەوەیەکی زۆرو دوورو درێژ...، زادەی بیرو باوەڕی گەلە، وە دەست کردی کۆمەڵەیە، بێ ئەمەی کە بزانرێ خاوەنەکەی کێیە))[٢١١].

- گاڵتەو گەپ، بەشێکی بەنرخی سامانی نەتەوەیی‌و ئەدەبیی سەرزاری خەڵکەو یەکێکە لەو جۆرە ئەدەبانەی کە شەقڵی شوێن‌و کات‌و سەردەم‌و سەدەی خۆی پێوەیە، چیرۆکێکی

---

[209] بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٩: ٣٢)

[210] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (١٠٣-١٠٤).

[211] شێخ محەمەدی خاڵ (١٩٧١ : ٤).

کورتە بە جۆرێکی گاڵتەئامێز داڕێژراوەو گیانی پێکەنینی کراوە بەبەردا[212].

- مەتەڵ، سنور بۆ دانانێکی کورتی ڕوداوێك یان کەرەسە یان مادەیەکە، کە خەڵکی ئەم سنوربۆدانانە بە ئەنقەست لە شێوەی نادیار یان تەماوییدا دەردەخەن، ڕاستیی وتنی قسەکە دەخەنە شێوەیەکەوە کە بەرامبەر بیلێت یان بیدۆزێتەوە[213].

ب. پەخشانی نووسەران، ئەوەیە کە نووسەری بەرهەمەکە دیاربێت و بەگشتیی دەکرێت بەسێ بەشەوە:

١. پەخشانی هونەریی، ئەو جۆرەیە کە تیایدا بایەخ بەدەربڕینی هەست و سۆز دەدرێت و هەوڵدەدرێت بەشێوازێکی ئەدەبیی بەرز ئەو هەست و سۆزە دەرببڕێت، ئەمیش دوو جۆرە:

أ. پەخشانی سەروادار*، ئەو پەخشانەیە کە هەڵوێستەکانی سەروایان هەبێت.

ب. پەخشانی ئاسایی، ئەوەیە کە سەروایان نەبێت.

---

[212] بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٩: ١٦١).

[213] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (٢١٠).

* عبدالرزاق بیماریش پەخشان لە ڕووی شێوازەوە، بۆ پەخشانی سەروادارو پەخشانی ڕەوان دابەشدەکات، پەخشانی ڕەوان بەو پەخشانە دەڵێت کە تیایدا گوێ بەسەروا نادرێت و بە زنجیرە بیرو لێکدانەوەکانی بەشێوازێکی سادەو ڕەوان تێدا دەردەخرێت، مەرجەکانی بریتین لە: ژیرییەکی پێگەیشتوو، خەیاڵ و بۆچوونێکی فراوان، بەکارهێنانی بیر بۆ بەدەستخستنی چاکترین شێوازو وتەو مانا. لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە پەخشان دابەشدەکات بۆ: ١. پەخشانی هونەریی، ٢. پەخشانی زانستیی کە پێکدێن لە: (پەخشانی داڕشتن و پەخشانی وسفیی یان بابەتیی). بڕوانە:(عبدالرزاق بیمار : ١٩٩٨ : ١٥-١٦).

٢. پەخشانی زانیاریی، ئەو جۆرە پەخشانەیە کە ڕاستەقینەیەکی زانستیی پێدەردەبڕڕێت، هەموو زانستەکان و دەستوورو یاساکانیشی پێدەنوسرێتەوە[٢١٤].

٣. پەخشانی کرداریی، ئەو جۆرە پەخشانەیە کە ئەمڕۆ لە میدیاکاندا بەکاردەهێنرێت بۆ دەربڕین و نووسینەوەی بابەتە ڕۆژنامەگەرییە جیاجیاکان و تێکەڵەیەکە لە پەخشانی هونەریی و پەخشانی زانستیی و بەپێی ئەو جۆر یان هونەرە ڕۆژنامەگەرییەی پێی دەنوسرێتەوە پشکی هەریەك لەو دوو جۆرە پەخشانە دیاریدەکرێت.

لە ئەنجامی ئەم دابەشکارییانەدا، پەخشان بۆ سێ بواری سەرەکیی دابەشدەکەین کە بریتیین لە:

١. پەخشانی ئەدەبی.
٢. پەخشانی زانستی.
٣. پەخشانی کرداری.

هەریەك لەم بوارانەش لە پراکتیزەکردنی پەخشاندا، چەند مۆدێلێك دەهێننەکایەوەو بەپێی تایبەتمەندییان، هونەرەکانی پەخشان پێکدەهێنن.

---

[214] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٥).

## ١/٤-٢) هونەرەکانی پەخشان

### ١. شانۆگەری (Drama)

دەقێکی ئامادەکراوە بۆ نواندن لە شانۆدا، دەربارەی دراما، بڕوانە لاپەڕە (٥٤)ی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

### ٢. چیرۆك (Novelette)

بریتییە لە گێڕانەوەی چەند ڕووداوێکی یەك لە دوای یەك، کە بەسەر چەند کەسێکی جیاوازدا دێن و تێدەپەڕن لە شوێنێکی دیاریکراودا[٢١٥]، یان بریتییە لە گێڕانەوەی ڕووداوێك یان کۆمەڵە ڕووداوێکی ژیان یان سروشت کە بە شێوەیەکی هونەرییانە دادەڕێژرێت و دەبێتە جێی سەرنج و بزواندنی هەستی جوانیی و پەرەپێدانی لێکدانەوەکانی وەرگر لە بەرامبەر ژیاندا[٢١٦]، (د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) دەڵێت: ((چیرۆك بەرهەمی گەورەبوون و لە خەم ڕەخسینی مرۆڤایەتییە، دیمەنی کێشەی ئادەمیزاد لەگەڵ سروشتداو، ئادەمیزاد لەناو خۆیاندا، لە پێناوی ژیانا پیشان ئەدات))[٢١٧]، یان دەوترێت: چیرۆك وێنەکێشانی لایەنێکی ژیانە[٢١٨]. (د. محەمەد دلێر ئەمین میسری)یش دەنووسێت: (( چیرۆك بە واتای ئێستای هەرچەندە درەنگ سەری هەڵداوە، بەڵام ڕەگ و ڕیشەیەکی قووڵی لە ناو حیکایەت و داستان و سەرگوزشتەی فۆلکلۆریدا هەیە))[٢١٩]، چیرۆکی نوێ لە ئەورووپاوە بە نەتەوەکانی تر گەیشتووە[٢٢٠]، پەیدابوونی لەگەڵ گەشەکردن و

---

215 بڕوانە: د. شکریە رسول (١٩٨٩ : ١٥٠).

216 بڕوانە: عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ٢٦١).

217 د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٩: ٢٥).

218 بڕوانە: د. شکریە رسول (١٩٨٩ : ١٥٠).

219 د.محەمەد دلێر ئەمین محەمەد (٢٠٠٤ : ٧٤).

220 د. محمد غنیمي هلال (١٩٧٣: ٤٦٢).

بەهێزبوونی چینی ناوەندی کۆمەڵی ئەوروپا بووەو بۆ دەربڕینی ئاوات و بیرو ڕاکانی خۆی بایەخیان بەتاك و ئاوات و بیرو ڕاکانی تاك داو کردیانە نمونەی چاککردنی باری کۆمەڵ، داوای ڕزگارکردنی تاکیان دەکرد لە زۆرو ستەمی کۆمەڵ و کۆت و زنجیرە نارەواکانی[٢٢١]، چیرۆکی هونەریش بە هەموو جۆرەکانییەوە بەندە بەگەشەی شارستانێتیی و زانستیی و ئاستی ڕوناکبیریی کۆمەڵەوە[٢٢٢]، چیرۆکی نوێ بەیەکێك لەو هونەرانە دەژمێررێت کە بە ئاراستەیەك ڕۆژنامەگەریی ڕۆڵی گەورەی لە گەشەسەندنیدا هەبووە[٢٢٣]، بە ئاراستەی دووەمیش چیرۆك ڕۆڵی لە پەرەپێدانی پەخشاندا بینیوە، کە دواجار خزمەت بووە بە بواری ڕۆژنامەگەریی (( هەر لە هاتنە ناوەوەی چیرۆکی هونەرییەوە لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بوونە ژینگەو زەمینەی لەبار بۆ ناساندن و خستنەڕوی ئەم هونەرە نوێیەی پەخشان))[٢٢٤].

چیرۆك وەك هەریەك لە چەشن و جۆرە ئەدەبییەکانی تر لە گەشەو گۆڕاندا بووە، چ وەك ناوەرۆك، چ وەك تەکنیك و شێوە، بۆیە لەگەڵ درێژەدان بە ڕەوتی خودی چیرۆك خۆی هونەری تری وەك کورتە چیرۆك و نۆڤلێت و ڕۆمانیشی لێکەوتۆتەوە. هەندێك سەرچاوە چیرۆك و دراما بە ئەدەبی بابەتیی ناودەبەن و پێیان وایە لەم دوو هونەرەدا پەیامێکی مرۆیی مەزن هەیە بۆ دەوڵەمەندکردنی هۆشیاریی و قوڵکردنەوەی ئاگایی لای خەڵك[٢٢٥].

لە سەردەمی ئێستادا چیرۆك خۆی لە بابەتە نادیارو غەیبییەکان دەربازکردووەو بەرەو چارەسەرکردنی مرۆڤ و کاروبارەکانی مرۆڤ چووە، هەروەها (( خۆی لەو بابەتانە دورخستۆتەوە کە بنەماکانیان ئەندێشەیەکی ڕوتن و بەرەو

---

221 بڕوانە: عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ٢٦٦).

222 بڕوانە: حسین عارف (١٩٧٧: ١٢).

223 بڕوانە: د. شکریە رسول (١٩٨٧ :٤١).

224 د.محەمەد دلێر ئەمین میسری (٢٠٠٤ :١٦١).

225 بڕوانە: د. محمد غنیمي هلال (١٩٧٥: ٨).

چارەسەرسازیی واقیعی مرۆیی و دەروونیی و کۆمەڵایەتیی ڕۆیشتووە))[٢٢٦]، چیرۆکیش وەك شانۆگەریی "ڕوداو" ئامادەیی دیاری هەیە تیایدا، بەڵام لە چیرۆکدا زیاتر بایەخ بە وەسف دەدرێت، ئەم وەسفەش بریتییە لە (( وەسفی ژیان و کەسەکان و بواری ڕووداوەکان))[٢٢٧]. چیرۆك بە واتای نوێ بایەخگەلێکی هەنوکەییە، تەنانەت ئەگەر باس لە ڕابردووش بکات، لە ڕابردوویەك دەدوێت کە ئامادەیی ئێستایی هەبێت، چیرۆکی واقیعیی و ئەوانەی کە زیاتر بایەخ بە دەرونشیکاریی کەسەکان و هەڵوێستەکان دەدەن بە فراوانترین بوارەکانی ئەدەبی جیهانیی دەزانرێن (( چیرۆك هونەرێکی کاریگەرترە لە زۆرێك لە هونەرە ئەدەبییەکانی تر، چونکە بواری چەشەو خۆشیی و بەرچاوڕونیی دەداتە خوێنەرەکانی))[٢٢٨].

چیرۆك وەك بەرهەم بۆ دوو جۆر دابەشدەکرێت[٢٢٩]:

أ. چیرۆکی وەرگیراو لە میللەتانی ترەوە.

ب. چیرۆکی خۆماڵیی، کە ئەمیش بۆ چیرۆکی(فۆلکلۆریی و میلليی و هونەریی داهێنەرانە) دابەشدەبێت.

ڕەگەزەکانی چیرۆکیش بریتی دەبن لە (ئەزمون، گفتوگۆ، ڕوداو، گێڕانەوە، گۆشەنیگا، گرێ، کارەکتەر، دەوروبەر، فەزا، ئاواز، نمونە)[٢٣٠]. لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە چیرۆك بۆ ئەم جۆرانە دابەشدەبێت:

أ. چیرۆکی ئەدەبیی، وابەستەی بیری داهێنەرانەی چیرۆکنووسەو هەر ئەویش شێوازو ناوەڕۆکەکەی دیاریدەکات.

ب. چیرۆکی پۆلیسیی، لە نێوان خێرو شەڕدا، لە نێوان تاوان و سزادا، لە نێوان سەرکەشیی و یاسادا، لە نێوان ئاڵۆزیی و چارەسەرسازییدا،

---

[226] د. محمد غنيمي هلال (١٩٧٣: ٤٩٣).

[227] سەرچاوەی پێشوو.

[228] لين اولتبنيرند (١٩٨٣ : ٥).

[229] بڕوانە: د. محمد غنيمي هلال (١٩٧٣: ٥٢٦).

[230] بڕوانە: د. سيروس شميسا (١٩٩٥ :١٦٠-١٦٥).

زانست یان دیدی زانستیانەی نووسەر چیرۆکێك بەرهەمدەهێنێت، کە زۆرجار خوێنەر وا هەستدەکات چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە، ڕووداوەکانی لە ڕوداوە پۆلیسییەکانەوە سەرچاوە دەگرن و کاتێك دز، یان بکوژ، یان تاوانکەرێك سەرەتای پرۆسەی چیرۆکەکە دەستپێدەکات، تەریب بە هەنگاوەکانی ئەو، پۆلیس، یان پارێزەر، یان دادگا بە دوای دەرخستن و دۆزینەوەی ڕێگا و دەروازە شاراوەکانییەوەیە، تا ئەوەی خوێنەر لە کۆتاییدا چاوەڕوانی ڕێگەچارەو دۆزینەوەو تۆڵەسەندنەوە دەکات[231].

پ. چیرۆکی ڕاستەقینە، لە چیرۆکێکی گێڕانەوەئامێزدا چیرۆکنووس کەس و شوێن و کات و ڕوداوەکان لە ڕوداوێکی ڕاستەقینەوە وەردەگرێت و لە چوارچێوەی چیرۆکێکی ڕاستەقینەدا دایدەڕێژێتەوە، بەڵام تیایدا توانستی هونەرمەندانەو جوانکارییانەو خەیاڵگەلی چیرۆکنووسیانەی خۆی ئاوێزانی ڕوداوەکە دەکات و خۆی بۆخۆی ناو لە هەموو ئەو بەشە پێکهاتانە دەنێت کە چیرۆکەکە پێکدەهێنن[232].

ت. چیرۆکی ڕۆژنامەوانیی، ڕوداوێکی ڕاستەقینەیە، بەکەس و کات و شوێن و ڕوداوەکانییەوە، ڕۆژنامەوانێك کەتوانایەکی ئەدەبیی باڵای هەیە دەینوسێت و لە ڕۆژنامەکاندا بڵاویدەکاتەوە، تێکەڵکردنی زانیارییەکانی رووداوە بە سۆزو ئەندێشەو جوانکاریی و، هونەرێکی بایەخداری پرۆسەی ڕۆژنامەگەرییە[233].

ج. چیرۆکی ئەندێشەگەلی زانستیی، ئەو چیرۆکەیە کە بەڕێگەیەکی ئەندێشەئامێز هەموو خواستەکانی مرۆڤ لە ڕێی زانست و تەکنۆلۆژیاوە چارەسەردەکات، ئەم هونەرە جیاوازە لە هونەری فەنتازیا، چونکە لەم جۆرە چیرۆکەدا تەنها خەیاڵ کارناکات، بەڵکو خەیاڵ بەرەو

---

231 بڕوانە: د. محمد غنیمي هلال (١٩٧٣: ٥٢٣).

232 بڕوانە: د. محمد فرید محمود عزت (٢٠٠٢ : ٤٩٤).

233 بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو(٥٣٨).

دوادەسکەوتەکانی لۆژیك دەچێتو دەیانخاتەڕوو، واتە تێکەڵاوکردنی ئەندێشەیە بە زانستو تەکنولۆژیا و بەزاندنی سنوری زەوی و چوونە ناو هەسارەکانو دەرخستنی توانستە زانستییەکانی مرۆڤ لە بابەتگەلێکی وادا کە سەرسوڕهێنەرانە ڕوداوەکان دەخولقێنێت[٢٣٤].

## ٣. ڕۆمان (Novel)

وەك هونەرێکی ئەدەبیی باڵا، پێگەی خۆی لە ئەدەبی کۆنداو بە تایبەتیش لە داستانو حیکایەتو بەسەرهاتە میللەیەکاندا، داکوتاوە. بونیاتی ڕۆمان لە چیرۆکەوە سەرچاوە دەگرێت، تا ئەوەی هەندێك لە لێکۆڵەرەوان "ڕۆمان" بە چیرۆکێکی درێژ ناوزەنددەکەن[٢٣٥].

مێژوی ڕۆمانو سەرەتاکانی دەرکەوتنی ڕۆمان تا ئێستا یەکلایی نەکراوەتەوە، زۆر لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ سەختیی و ئاڵۆزیی دیاریکردنی مێژوی ڕۆمان دەکەن، ئەویش بەهۆی ئەو هەموو ئەگەرە زۆرەی لە دەوری لێکدانەوەیەکی وادا کۆدەبنەوە، بەهۆی نەبوونی تۆمارو نووسینیشەوە ناتوانرێت بە ئاسانیی ساغبکرێنەوە، بەڵام بۆ ئەوەی لێکدانەوەی ڕۆمانی نوێ لەو مێژووە نادیارەی جیابکرێتەوە، لێکۆڵینەوەکان چەمکی ڕۆمانی کۆنیان بۆ ئەو قۆناغە بەراییەی ڕۆمان دیاریکردووە[٢٣٦]. لە هەمانکاتیشدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ڕۆمانی نوێ هیچ پەیوەندییەکی بەڕۆمانی کۆنەوە نەبێت، بە پێچەوانەوە شتگەلێکی زۆر هەن کە هاوبەشن لە نێوان هەردوو قۆناغی کۆنو نوێی ڕۆماندا. لێکۆڵەرەوان لەسەر نەشو نمای ڕۆمانی نوێ جیاوازن، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە ڕۆمانی نوێ لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا دەستیپێکردووە، ڕۆمان لەو سەردەمەدا هەژمونی تەواوی بەسەر خوێندەوارانداا

---

[234] بڕوانە: رؤوف وصفي (١٩٩٠: ١١).

[235] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ :١٥٣).

[236] بڕوانە: حنا عبود (٢٠٠٢ : ٥).

هەبووەو لەو كاتەشەوە تا ئەمڕۆ زۆرترینی ئەو ئەدیبانەی خەلاتی نۆبلیان وەرگرتووە، ڕۆماننووسەكان بوون[٢٣٧].

ڕۆمانی نوێ زیاتر لە داستانەوە سەرچاوە دەگرێت، كاتێك هۆشیاریی و ئاگایی دەگەنە بارێكی بالاو بەرفراوان لە دنیادا چیدی تەنها بە شیعرو بە داستانەكان ناتوانرێت ئەوەی زاخاوی ئەم هۆشە ئاگایە دەداتەوە كاربكات، بۆیە پێویستبوونی هونەرێكی بەهاداری وەك ڕۆمان دەهێنێتەكایەوە، خودهۆشیاریی تاك تەنها سۆز ناتوانێت لە ناو ئەندێشەیەكی دروستكراودا بیهەژێنێت، بۆیە پێویستی بە میكانیزمی ترە تا لێیەوە بتوانێت وابەستەیی خۆی بەدەق و بە هونەرەكانەوە بهێلێتەوە. ( فیلدنگ و دیفۆو ریچاردسۆن) بە ڕابەرانی ڕۆمانی نوێ دادەنرێن، هەندێك سەرچاوە دەڵێن ئەوە ئەوانە نەبوون كە ڕۆمانیان داهێنا، بەڵكو هۆشگەرایی و حەتمییەتی مێژوو بوو كە ڕۆمانی لەسەر دەستی ئەوان هێنایەكایەوە[٢٣٨]. (جۆرج لۆكاش)، ڕۆمان بە داستانی بۆرژوازیی ناودەبات، كە لە ئەنجامی ڕێنسانسی ئەوروپاوە سەرچاوەی گرتووەو بەدیاریكراویش لەدوای شۆڕشی پیشەسازییەوە چەسپاوە[٢٣٩]، (باختین)یش پێی وایە: (( ڕۆمان لە مێژودا جۆرێكی ئەدەبیی نەبووە و تایبەتمەندیی دیاری خۆی نەبووە، لە ئێستادا ڕۆمان هەمیشە لە داهێنانی نوێدایەو پرۆژەیەكی كراوەیە بۆ گەشەپێدان))، ڕۆمان جیهانی گۆڕینی كەسایەتییەكانە، زمانی ئەم هونەرە مەرج نییە وەكو داستان زمانێكی بالابێت، كەسایەتییەكانی زۆربەی لە كەسانی خوار ئاستی ناوەندی كۆمەڵگاوە سەرچاوەیان گرتووەو فۆلكلۆریش ماكێكی زیندوی ڕۆمانی نوێیە[٢٤٠].

---

[237] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (٦).

[238] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (٧).

[239] حنا عبود (٢٠٠٢ : ٨).

[240] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (١١).

له نێوان داستانو ڕۆمانی نوێدا* "ڕۆمانسه Romance" هەیە، که شێوەیەکی پێشکەوتوی داستان بووه له چاخەکانی ناوەڕاستدا، بەڵام سەرچاوه نوێکان لەبری ڕۆمانسه " ڕۆمانی کۆن" بەکاردەبەن[٢٤١]، بەڵام جیاوازی دیاری نێوان ڕۆمانی کۆنو ڕۆمانسەش بریتی دەبێت لەوەی ڕۆمانسه کارتێکراوه به فریادڕەسیی مەسیح، هەندێك پێیان وایه (دۆنکیشۆت)ی ( میخائیل سێرڤانتس ١٥٤٧-١٦١٦) که له نێوان سالانی(١٦٠٥-١٦١٥)دا نوسیویەتی، نمونەی هەره باڵای ڕۆمانسەیە، ئەگەرچی هەندێکیش دۆنکیشۆت به ڕۆمان باسدەکەن[٢٤٢].

( دایاناداو بتغایر)دەڵێت: (( ڕۆمان چرۆکێکه دەربارەی خەڵکی، ڕۆماننووس کەسەکانی بۆ دروست دەکاتو به ئارەزوی خۆی کارێکی درامییان پێدەسپێرێت، بۆ ئەوەی بابەتێك ڕونبکاتەوه که خۆی مەبەستیەتی))[٢٤٣]، (ڤ. ڤ. کۆژینۆڤ) دەڵێت: (( ڕۆمان کتێبێکی ڕۆمانتیکییه، وەك بابەتێك بۆ خوێندنەوه دەخرێته ڕوو، سروشتی ژیانی کەسیی، پەیوەندیی نوێی وابەستەبوونی پاڵەوان به جیهانو بزاوتی هەمەلایەنەی وێنه وردەکانی ژیانەو سیستمێکی تەواوکارییانەی تایبەتمەندییه بابەتییەکانیشه))[٢٤٤]، (نەجیب مەحفوز)یش دەنووسێت: (( ڕۆمان ئەو هونەرەیه که گونجاندن له نێوان خواستی مرۆڤی نوێ به ڕاستییەکانو خۆشەویستیی بەردەوامی بۆ ئەندێشەکان، له نێوان دەوڵەمەندیی ڕاستەقینەو سەرکەشیی خەیاڵدا، پێکدەهێنێت))[٢٤٥]، یان دەوترێت ڕۆمان وێستگەی کۆکردنەوەی هەموو هونەرەکانه له هونەرێکی کامڵی

---

* هەندێك سەرچاوه ڕۆمانی نوێ به (داستانی سەردەمی نوێ)یش ناودەبەن، ئەم ڕایەش له (جۆرج لۆکاش)ەوه سەرچاوەی گرتووه، بڕوانه : (ڤ. ڤ. کوژینوڤ: ١٩٨٠ :٢١٢)، هەندێکیش به (ڕەوتی هۆشمەندیی) ناویدەبەن، بڕوانه: (د. ماجد حمود: ٢٠٠٠ :٣٥).

241 بڕوانه: سەرچاوەی پێشوو (١٧).

242 سیامەند هادی (٢٠٠٤ : ١٨).

243 دایاناداو بتغایر (١٩٨٢ : ٢٩).

244 ڤ. ڤ. کوژینوڤ (١٩٨٠ :٢٤١ ، ٢٠٣).

245 د.عادل فریجات (٢٠٠٠ : تمهید).

دەوڵەمەندندا، هونەرێکە خاڵی بەیەکگەیشتنی دەنگە لێك دورو لێکدابڕاوو هاودەنگەکانە بەمەبەستی پێکهێنانی ڕیتمی ئەم سەردەمەمان[٢٤٦]، ڕۆماننووس بەدوو پرۆسەی یەکتەواوکاری یەکدا کە جیاکردنەوەو هەڵبژاردن، یان لابراوو چەسپاون، گێڕانەوە لە ڕۆماندا بەرجەستەدەکات، ئەویش بە هەڵبژاردنی ڕوداوەکانو جیاکردنەوەی ئەو بەشانە لەو ڕوداوە هەڵبژێردراوانە کە لەگەڵ گیانی دەقەکەدا بگونجێنو هێماش لە ڕۆماندا دەبێتە ڕەگەزێکی بنەڕەتیی و بە هۆیەوە کەس لەگەڵ ڕوداوەکاندا کۆدەکرێتەوە[٢٤٧].

ڕۆمان بەر لە وڵاتانی تر لە بەریتانیاوە داهاتو وابەستەی کۆمەڵێك مەرجگەلی کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و فیکریی بوو، چەند هۆکارێکی گرنگیش بوونە مایەی داهاتنو گەشەکردنی[٢٤٨]، لەوانە:

١. زیادبوونی ژمارەی ئەوانەی توانای خوێندنەوەو نووسینیان هەیەو زیادبوونی قوتابخانە نوێکانی خوێندن.
٢. دەرکەوتنی چاپو بڵاوبوونەوەی چاپەمەنیی.
٣. بڵاوبوونەوەی ئابوریی بازاڕ.
٤. باڵابوونی خواستەکانی تاکگەرایی و عەلمانیەت.
٥. هاتنەکایەی لێکدانەوەو مامەڵەکردنی نوێ لەگەڵ ( کەسێتیی ژن، خۆشەویستیی، ئەزمونیی کەسیی)دا.
٦. هاتنەکایەی ڕەوتی ڕیالیزمیی لە ئەوروپاداو گەڕانەوە بۆ واقیعی کۆمەڵایەتیی[٢٤٩].

بەگشتیی "ڕۆمان" هونەرێکی ئەدەبییەو بەردەوام لە گۆڕاندایە، هەمیشە لەگەڵ نائارامیی و دوودڵیدا دەژی، بەجۆرێك کە بەخێرایی جێگیرنابێت، بە

---

[246] د. جابر عصفور (١٩٩٩ :٥٣).

[247] بڕوانە: د.عادل فريجات (٢٠٠٠ : تمهيد).

[248] د. جهاد عطا نعيسة (٢٠٠١ : ١٣).

[249] بڕوانە: حسين پاينده (٢٠٠٣ : ٧).

چیرۆکگەلێکی پەخشانیی واقیعیی دەوترێت کە تەواوو کامڵو خاوەنی درێژییەکی دیاریکراوە، کەسایەتییەکانی نزیکن لە کەسێتیی کەسە ڕاستەقینەکان، کاتو شوێنیش لە ڕۆماندا پێکەوەلکاون‌و وەك ڕاپۆرتێکی دەرخستنی ڕاستییەکان دەردەکەوێت کە پشت بە ئەزمونگەلی ڕاستەقینەی خەڵك دەبەستێت[250]، ڕۆمان وەك بەرهەمێکی هونەریی خۆرئاوایی سەرەتا لەڕێی وەرگێڕانەوە[251] گەیشتە وڵاتانی تری دنیا، بەتایبەتیی وڵاتانی خۆرهەڵاتو بووە یەکێك لە هونەرە باڵا گەشەسەندووەکانی کایە ئەدەبییەکانی جیهان.

ڕۆمان لە ڕووی پێکهاتەوە دابەشدەبێت[252] بۆ:

١. ڕۆمانی ڕوداوەکان، ئەم جۆرە لەسەر ڕوداو دامەزراوە، لەسەرەتاوە تا کۆتایی بە ڕوداوگەلێکی زنجیرەیی واقیعیدا دەڕوات.

٢. ڕۆمانی کەسێتیی، باس لە کەسێتیی پاڵەوان دەکاتو لەو ئەنجامە دەدوێت کە تیایدا چارەنوسی پاڵەوان ڕوندەکاتەوە.

٣. ڕۆمانی نامەیی، ڕۆمانێکە بە نامە لە نێوان دوو کەسدا دێتەکایەوەو ڕوداوەکان لەسەر ئەم بنەمایە بنیاتدەنرێن.

٤. ڕۆمانی ئایدیایی، ئەو ڕۆمانەیە کە لە سەر بنەمای ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو بنیاتدەنرێت.

٥. ڕۆمانی پۆلیسیی[253]، تاوان‌و توندوتیژیی بنەمای سەرەکیی ئەم جۆرە ڕۆمانە پێکدێنن.

---

[250] بڕوانە: روجر الن (١٩٩٧ : ١١)، ارنولد کیتل (١٩٧٧ : ٣٥)، د. جهاد عطا نعیسة (٢٠٠١ : ١٣-١٤).

[251] بڕوانە: د. محمد ریاض وتار (٢٠٠٢ : ٩).

[252] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ :١٥٥-١٥٦).

[253] بڕوانە: د. عبدالقادر شرشار (٢٠٠٣ : ١١).

## ٤. کورتە چیرۆك (Novelise)

کورتە چیرۆك وەك هونەرێکی خاوەن واتاو شێوازو دارشتنی نوێ، لە سەدەی نۆزدەیەمەوە قاڵبی گرتووە[254]، بەڵام وەك بوارێکی گێرانەوەگەریی و دەربڕینی کەسیی لە خواستی تێکەڵاوبوونی بەکەسانی ترو گێرانەوەی بەسەرهاتەکانی خۆیو بەشدارییپێکردنی کەسانی تر لە رووداوەکانی رۆژگاری خۆیدا بۆ بەر لە سەردەمی سۆمەرییەکانیش دەگەرێتەوە واتە پێش سێ هەزار ساڵ بەر لە زایین[255]. (د. سیرۆس شمیسا) کورتە چیرۆك بە چیرۆکێکی تەواو لە گێرانەوەیەکی کورتدا دەناسێنێت[256]، کاتێك لەدوای شۆرشی پیشەسازییو داهێنانی تەکنۆلۆژییو کۆچی بەلێشاوی مرۆڤەکان لە گوندەوە بۆشارو لەشاردا پێکهاتنی شارەگەورەکان (میترۆپۆلیتان) دەهێنێتەکایەوەو مرۆڤ وەك هێزێکی بەرهەمهێن تێکەڵ بە ئامێرگەلی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەبێتو، ژیان بەرەو سەختبوون دەچێت، کات لەبەردەم تاکدا بەجۆرێك کەمدەبێتەوە کە ئاساننەبێت دەستی بەهەموو بوارەکانی ژیاندا بگات، بەڵام سروشتی مرۆڤ وەهایە کە ناتوانێت پشت بکاتە خۆشییو پشوو خواستو غەریزەکانی خۆی، لێرەوە کورتەچیرۆك دەبێتە هونەرێکی ئەڵتەرناتیڤی بەهادار کە لە ماوەی کەمی تاکی سەردەمی تەکنۆلۆژیادا دەتوانێت بەخێرایی خۆشییو زانیارییو ئاسودەیی بگەیەنێتە خوێنەرەکانی خۆی.

لە کورتەچیرۆکدا گرتەیەکی دیاریکراو، یان هەڵوێستێکی کورت، یان چرکە ساتێکی ژیان، هەڵدەبژێررێتو بیری نووسەری تێدا ئاوێزاندەکرێت، لەوێوە ئەم گرتەیە تێکەڵ بەهەستو ئەندێشەو سۆزو رەگەزەکانی بزواندن دەبێت، بەجۆرێك کە نووسەر دیمەنێکی رێکخراومان پیشانبدات، دەوترێت کورتەچیرۆك (( ئەرکی پیشاندانە نەك بریاردان، بەرجەستەکردنە نەك داماڵینو بەشێوەیەکی

---

[254] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٤٧).

[255] بڕوانە: د. عادل الفریجات (٢٠٠٢ : ٨).

[256] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥: ١٥٣).

ڕاستەوخۆی ڕاشکاوانە دەخرێتەڕوو))[٢٥٧]، (ئەمبرت) دەڵێت: ((کورتەچیرۆك بریتییە لە گێڕانەوەیەکی پەخشانیانەی کورت کە پشت بە ئەندێشەی تاك دەبەستێت و گرێبەندیی لە ڕوداوێکدا دروستدەکات))[٢٥٨]. (د. عەزیز گەردی) دەڵێت: ((کورتەچیرۆك وەك تیشك وایە لە ساتێکی کورتدا دەخرێتەسەر یەك کەس یان یەك ڕوداوی بچوكو بەوردیو قوڵی پیشانی دەدا))[٢٥٩]، یان کورتەچیرۆك بریتییە لە جەختکردنەسەر یەك کەسایەتیی، لە یەك هەڵوێستو یەك چرکەساتی دیاریکراودا[٢٦٠].

بەگشتیی کورتەچیرۆك* خۆی لەم شێوانەدا دەبینێتەوە[٢٦١]:

١. دابونەریتگەریی، لە نێوان سۆسیۆلۆژیاو ئەندێشەدا کاردەکات، تابلۆیەکمان پیشان دەدات کە دیمەنەکانی لە ژیانی ڕاستەقینەوە وەرگرتووە.
٢. مۆراڵگەریی، لە نێوان سایکۆلۆژیاو ئەندێشەدا خۆی ڕێکدەخات، دەیەوێت ئاکاری سەربازێك یان شاعیرێك یان هەر مرۆڤێکمان پیشانبدات.
٣. هەواڵگەریی، لە نێوان ڕۆژنامەگەرییو ئەندێشەدا کاردەکات، ڕوداوێکمان بۆ وێنا دەکات کە ڕوداوێکی نائاسایی ناو کاروانی ژیانی ڕۆژانەمانە.
٤. خورافەگەریی، لە نێوان ئایینو ئەندێشەدایە، ڕاڤەکردنی بنەڕەتیی گەردوونە بەهاوبەشیی لەگەڵ کائیناتە نادیارو تەمومژاوییەکاندا.

---

[257] د. عادل الفريجات (٢٠٠٢ : ٨ ).

[258] لانريكي اندرسون امبرت (٢٠٠٠ : ٥٢).

[259] عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٤٨).

[260] خالد فراج (www.geocities.com/farraj17/a4.htm).

* لە ئەدەبی جیهانییدا (ئەدگار ئالان پۆی ئەمریکاییو گی دی موپاسانی فەرەنسییو چیخۆڤی ڕوسیی) بە دامەزرێنەرانی ئەم هونەرە دادەنرێن.

[261] بڕوانە: د. عادل الفريجات (٢٠٠٢ : ٩).

٥. ئەفسانەگەریی، لە نێوان مێژوو ئەندێشەدایە، چیرۆکی ڕاستەقینەنین و، چارەسەری کاروباری ناباوو نەگەنجاو لەگەڵ یاساگشتییەکاندا دەکەن.
٦. نمونەگەریی، لە نێوان فێرکردن و ئەندێشەدایە، هێنانەوەی نمونەیەکە بۆ پەندلێوەرگرتن و پەند دروستکردن لە چیرۆکدا.
٧. سەرسوڕمان، هێنانی ڕوداوێکی دەرەکییە، بۆ ئەوەی کەسایەتیی پاڵەوان و پاڵپێوەنەرە دەروونییەکانی شیبکاتەوە، ئەندێشە تیایدا ڕەگەزی زاڵدەبێت.
٨. بوارگەریی، هێنانی هەڵوێستێکی لەناکاو یان کەرتێکی دیاریکراوی ژیانە، وەك: مردن، بێبەختی،...تاد.

ڕەگەزە گشتییەکانی کورتەچیرۆکیش بریتی دەبن لە: ( پاڵەوان، کات، شوێن، ڕوداو، چۆنێتیی، ئەنجام).

## ٥. وتار (Essay)

بریتییە لە پارچە نووسینێکی ئەدەبیی بەپەخشاننوسراوو بەزمانێکی ڕەوان دادەڕێژرێت، دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو دەنووسرێت و وابەستەی تەکنیك و شێوازی تایبەتی نووسەرەکەی دەبێت[٢٦٢]، لەسەر سێ بنەماش بنیاتدەنرێت[٢٦٣] کە بریتین لە:

- سەرنجدان لە ژیان.
- وردبوونەوە لە دیاردەکانی ژیان.
- ڕامان لە ماناکانی ژیان.

بەگشتیی هەر وتارێك بۆ (سەرەتاو ناوەڕۆك و کۆتایی) دابەشدەبێت و نووسەر بیرەکانی خۆی بەپێی میتۆدێکی دیاریکراو ڕیزبەنددەکات و دەخاتەڕوو بەمەبەستی دروستکردنی بڕواو متمانە لای خوێنەر. هەندێك سەرچاوەش وتار بە

262 بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥: ٢٥٨).
263 بڕوانە: عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ١٩).

باسێکی سەربەخۆی بەپەخشانوسراوی کورتی چەند پەرەگرافیی دەناسێنن، کە هەر پەرەگرافێکی بیرێك دەگەیەنێتو بەکۆی پەرەگرافەکان بیری سەرەکیی بابەتەکە بەرجەستەدەبێتو هەڵگری ناونیشانێك دەبێت کە گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتەکە دەکات[٢٦٤].

وتار شێوەیەکی گەشەسەندووی وتەیە، بەڵام پشت بەجوانکاریی و دەربڕینی پتەوو ڕیزبەندیی و جدییەت دەبەستێتو لایەنە هونەرییەکانی نووسین ڕەچاودەکات[٢٦٥]. (عەلائەدین سەجادی) دەڵێت: (( نووسەر باسێکی زانیاری یا ئابوری، یا کۆمەڵایەتی یا شتێکی تر دێنێ و لەسەری ئەڕواو شەرحی ئەکا، بە بەڵگەوە بە خەڵکی ئەسەلمێنێ و ئەیباتە دڵیانەوە))[٢٦٦]، وتار بە هونەرێکی سەردەمیانەی باڵا دەناسرێتو توانستی گوزارشتکردنیشی هەیە لە هەر شتێك کە نووسەرەکەی بخوازێت لە بارەیەوە بنووسێت، یان وتار بە نووسینێکی کورت لەسەر بابەتێکی دیاریکراو یان بیرێکی سەرەکیی دادەنرێت کە بەپەخشان دەنووسرێتو شێوازی فیکریی یان ڕاڤەکاریی لەزۆربەردا زاڵدەبێت بەسەریاندا[٢٦٧]، (( تێرمی مەقالە سەرنجمان بۆ چەشنە نووسینێك ڕادەکێشێ کە بە پەخشان دەنووسرێ، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر جۆراوجۆرەو لە چوارچێوەیەکی ئازاددا خۆی نیشان دەدا، بەو مانایەی دەست نیشان کردنی پێوەرو ڕێنماو ڕێساکانی سەختە و دەوەستێتە سەر هەڵوێستو ڕوانینی فیکریی و خەیاڵی نووسەر، مەقالە ئیشارەیە ئیشارەیە بۆ کۆمەڵێك تێکستی فۆرمی جۆراوجۆر کە بەستیلی جۆراوجۆر دەنوسرێ))[٢٦٨]، بەگشتیی وتار بۆ دوو جۆر دابەشدەبێت[٢٦٩]:

---

[264] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٣٥-٣٦).

[265] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ :٢٥٨).

[266] عەلائەدین سەجادی (١٩٦٧ : ١٣٩-١٤٠).

[267] بڕوانە: خالد فراج (www.geocities.com/farraj17/a4.htm).

[268] د. موحسین ئەحمەد عومەر (٢٠٠٥ : ٣١).

[269] بڕوانە: عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٣٢).

أ. وتاری خودیی، ئەم جۆرە گوزارشت لە خودی نووسەرەکەی دەکاتو کەسێتیی نووسەر دەردەخاتو نووسەر دەیەوێت لەگەڵ گەیاندنی بیرەکەیدا خوێنەر ببزوێنێتو بەشێوەیەکی ناسكو بەپێزو هەستو سۆزێکی زۆرەوە دەریببڕێت.

ب. وتاری بابەتیی، زۆرتر ڕاستەقینەی زانیاریی دەردەبڕێتو لایەنی بابەتیبوون زاڵدەبێت بەسەریدا.

ئەم دوو جۆرە* لە ئەمڕۆدا زۆرجار تێکەڵدەکرێنو بەپێی تەکنیکی نووسەر پشکی هەریەکەیان لە وتارێکدا بەرجەستەدەبێت.

جۆرەکانی وتار لە ڕووی مەبەستو ناوەڕۆکەوە، هێندەی بوارەکانی ژیان زۆرن، بۆیە دیاریکردنی جۆرەکانیان بۆ چەند مەبەستێکی دیاریکراو نامانگەیەنێتە پۆلبەندکردنێکی زانستییانەو دەشێت لە ڕوی پراکتیکییەوە باشتر بتوانرێت وتارێکی دیاریکراو بخرێتە پۆلێکی دیاریکراوو جۆرێکی دیاریکراوەوە نەك بە تیۆریی، لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێك سەرچاوە وتاری ئەدەبیی دابەشدەکەن بۆ وتاری : (کۆمەلایەتیی، وەسفیی، ڕەخنەیی، فەلسەفیی، کەسێتیی)[٢٧٠]، بەلام بەگشتیی کار بە ئەم بنەمایانە بۆ دیاریکردنی جۆرەکانی وتار لە ڕوی شێوازەوە دەکرێن[٢٧١]:

١. سەرچاوە یان ئەو چاوگەی وتارنووس سودی لێدەبینێت بۆ نووسینی وتارەکەی.
٢. ئاستو جۆری ئەو سۆزو هەستەی کە لە دەقەکەدا پەخش دەبن.

---

* هەندێك سەرچاوەی تریش وتار بۆ ئەم جۆرانە دابەشدەکات: (١. وتاری ڕەسمیی: وتارەکە بەشێوەیەکی جوانو هونەریی دادەڕێژرێت. ٢. وتاری نارەسمیی: بەزمانێکی ئاسایی خەڵكو سەرپێییانە دەنووسرێت. ٣. وتارێك کە خەلاتی وەرگرتووە. ٤. وتاری ڕامانگەریی) بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ :٢٥٨).

[270] بڕوانە: د. شکریە رسول (١٩٨٩: ١٧).

[271] بڕوانە: خالد فراج (www.geocities.com/farraj17/a4.htm).
(www.fingersfollies.com/books/adab/003).

٣. جۆری ئەو كۆتەیشن‌و ناوەڕۆكانەی دەهێنرێنە ناو وتارەكەوە.
٤. جۆری وێنەی بەكارهاتوو لەگەڵ وتارەكەدا.
٥. ئاستی دووبارەبوونەی بیر، یان ئایدۆلۆژیای نووسەر لە وتارەكەدا.
٦. شێوازی نووسینەكەی چۆنە، ئایا ئەدەبییە، زانستییە، كردارییە، یان تێكەڵاوە؟
٧. نووسەر چۆن مامەڵەی لەگەڵ بەڵگەو دۆكۆمێنت، یان قسەی نەستەق‌و پەندو ئایەت‌و فەرمودەدا كردووەو تاچەند لە وتارەكەیدا بەكاریهێناون.
٨. شێوازی پیشاندانی وتارەكە چۆنە، ئایا گێڕانەوەیە،یان گفتوگۆیە، یان ڕیزبەندكردنی بیرەكانە.
٩. زمانی بەكارهاتوو لە وتارەكەدا چۆنە، ئایا زمانێكی هاوچەرخانەیە، یان زمانێكی كۆنە، زمانێكی ڕاستەوخۆیە، یان ناڕاستەوخۆ، زمانێكی سادەو ڕون‌و ساكارە، یان قورس‌و تەمومژاوییە؟
١٠. لە وتارەكەدا تاچەند جەختكردنەوەو دووپاتكردنەوەو دووبارەبوونەوە هەیە؟
١١. ئایا نووسەر ڕاستەقینەی بیروڕاكانی تری خستۆتە ڕوو؟
١٢. نووسەر تا چەند هاوواتاو دژواتاكانی بەكاربردووە؟
١٣. ئایا كۆتەیشنەكان لەگەڵ ناوەڕۆك‌و چێوەی باسەكەدا دەگونجێن، یان نا؟
١٤. ئایا نووسەر لە وتارەكەیدا ڕازاندنەوەی وەهای بەكارهێناوە پێویست بە شیكردنەوەو ڕونكردنەوە بكات؟
١٥. ئایا تێگەیشتن بە ئاسانیی لەسەر بابەتەكە دروستدەبێت؟

لە ڕووی ناوەڕۆكیشەوە:

١. وتارەكە بە پێشەكییەك دەستی پێكردووە، یان ڕاستەوخۆ هاتۆتە ناو بابەتەكەوە؟.
٢. ئایا لە گشتییەوە گواستراوەتەوە بۆ تایبەت، یان بە پێچەوانەوە؟

٣. دیاریکردنی ئامانجی وتارەکە.

٤. وتارەکە کۆتاییەکی دیاری هەیە، یان بەکراوەیی بەجێهێڵراوە؟

٥. ئامادەیی نووسەر لە وتارەکەیدا چۆنە؟ ئایا بەردەوام ئامادەیی هەیە، یان نا؟

٦. نووسەر لە وتارەکەیدا هەڵچووە، یان هێمنە؟

٧. وتارنووس تا چەند ژینگەی شوێن‌و کاتی بۆ بابەتی وتارەکە دیاریکردووە؟

٨. لە وتارەکەدا ناونیشانی لاوەکیی هەیە یان نا؟

٩. وتارنووس تا چەند ئاماژەی بەو سەرچاوانە کردووە کە زانیاریی لێوەرگرتوون؟

١٠. جۆری ئەو بەڵگانە چین کە وتارنووس پشتی پێبەستوون؟

١١. لە وتارەکەدا چەند تەوەر هەیە؟ ئایا تاک ڕەهەندە، یان فرە ڕەهەند، گشتگیرە، یان دیاریکراو؟

١٢. وتارنووس لە بابەتەکەیدا چۆن دەردەکەوێت، وەك توێژەر، یان وتاربێژ، یان ڕەخنەگر، یان ئامۆژگاریکەر، ...تاد؟

١٣. تاچەند گونجاندن لە نێوان زانیارییەکانی ناو وتارەکەدا هەیە؟

١٤. وتارنووس لە وتارەکەیدا توانیویەتی پەیوەندیی لە نێوان سەرەتاو کۆتاییدا دروستبکات؟

١٥. وتارنووس تا چەند بە ئەمانەتەوە ڕای خەڵکانی تری گواستۆتەوە ناو وتارەکەی، ئایا گۆڕانی لەوانەدا کردووە کە دژی ڕاکانی ئەمن؟

١٦. ناونیشانەکەی تاچەند لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا گونجاوە؟

١٧. وتارنووس چۆن لە بیری سەرەکیی وتارەکەوە چۆتە بیرە ناوەندیی و لاوەکییەکانەوە؟

ئەوەی جێی سەرنجە، بەشێکی زۆری ئەم تایبەتمەندییانەی شێوازو ناوەڕۆکی وتاری ئەدەبیی لە وتارە زانستیی و کرداریی و تێکەڵاوەکانیشدا دووبارەدەبنەوە.

## ٦. وتاردان

بریتییە لە هونەری قسەکردن لە پێناوی قایلکردنو کارتێکردندا[٢٧٢]، وتاردان بە یەکێك لەو هونەرە ئەدەبییانە دادەنرێت کە دەتوانێت پەیوەندیی لەگەڵ جەماوەردا دروستبکاتو ئاراستەیان بکات، سەرەتای دەرکەوتنی بۆ یۆنانی کۆن دەگەڕێتەوە کە ئاوێزانی هونەرگەلێکی جیاجیای دەربڕینو قسەکردن بووە[٢٧٣]، کاتێکیش ئەرستۆ کتێبی ڕەوانبێژیی (ڕیتۆریکا) دەنووسێت، کاریگەریی گەورەی لەسەر هونەری وتاربێژیی دەبێت بەوەی کە چەمکی وتاربێژیی تێکەڵ بە چەمکی ڕەوانبێژییو ئامڕازەکانی دەبێت، ئەمەش وایکرد هونەرێکی نوێی وتاربێژیی بێتەکایەوە بە شێوەیەك کە گونجاوترو بابەتییانەتر بێت لەهەر جۆرە هونەرێکی وتاربێژیی تری یۆنانی کۆن، وەك: وتاربێژیی دادوەریی، وتاربێژیی سیاسیی، وتاربێژیی سۆفستاییەکان[٢٧٤]، کە ئەمەی دواییان پێی وابوو وتاربێژێکی قسەزان دەتوانێت چۆن هەق سەردەخات ئاواش ناهەق سەربخات لە ڕێگای بەهێزیی بەڵگەو لێهاتوویی لە لێدوانو بالادەستیی لە دەربڕیندا[٢٧٥].

لە بناغەدا وتاردان وتەیەکی سەرزاریی مرۆڤە، یاخود نووسراوێکە کە لە ئاهەنگو بۆنەکاندا دەخوێندرێتەوە، لە کۆندا کۆڕو کۆبوونەوەو ئاهەنگو سروتە ئایینیی و نەتەوەیی و میللییەکانو لە سەردەمی نوێشدا ئێزگەو تەلەڤیزیۆن ڕۆڵی دیاریان لە گەشەسەندنی وتاربێژییدا بینیوە[٢٧٦]. لە زۆرباردا موژدەبەرو بانگکەرانی ئایینو مەزهەبە جیاجیاکانو تا بە کادیرو سیاسییەکانیش دەگات، بە شێکی دیاری پرۆسەی وتاربێژیی بەکاردەبەن، ئەمانە ئەو کەسانەن کە هەوڵی

---

[272] بڕوانە: د. شكريه رسول (١٩٨٩: ١٤٦).

[273] بڕوانە: د. محمد مندور (١٩٧٤: ١٦٤).

[274] بڕوانە: أرسطو( ١٩٨٠ : ٣٦).

[275] بڕوانە: د. محمد مندور (١٩٧٤: ١٦٦).

[276] بڕوانە: د. شكريه رسول (١٩٨٧: ١٣).

بانگکردنی خەڵك دەدەن بۆ شوێنکەوتنی ئایینێك، یان ڕێبازێك، یان بۆچوونێك‌و بەشێوەیەکی لێزانانە کارەکانیان بەڕێوەدەبەن‌و کاردەکەنە سەر خەڵکیی[277].

## ٧. ژیاننامە (Autobiography)

نووسین‌و پیشاندانی ژیانی مرۆڤێکە لە چوارچێوەی خستنەڕووی وێنەیەکی ڕاستگۆو پرشنگداری ژیانی خۆی‌و کۆمەڵەکەی[278]، یان مێژوویەکی تایبەتە بەژیانی کەسێکەوە و بەیاداشت، یان گەشتی ژیان، یان سەرگوزشتەش ناودەبرێت و لەبەرامبەر زاراوەی (ئۆتۆبیۆگرافیی Autobiography)[279]دا دێت‌و ئەم جۆرانەدەگرێتەوە[280]:

ا. نووسەرێك، ژیان و سەرگوزشتەی یەکێکی تر دەنووسێتەوەو هەڵیدەسەنگێنێت.

ب. نووسەرێك، ژیان و سەرگوزشتەی یەکێکی تر وەکو خۆی بێهەڵسەنگاندن دەنوسێتەوە.

پ. کەسێك، ژیاننامەی تایبەتیی خۆی لە گۆشەنیگای خۆی بۆ بەسەرهات‌و ڕووداوەکانی ژیانی خۆیەوە دەنووسێتەوە.

بابەتی ژیاننامەی کەسێتیی کەسێکەو هەموولایەنە جەستەیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ژیریی‌و سۆزداریی‌و مێژوویی‌و...تادییەکانی، ئەو کەسە دەگرێتەوە[281]. ژیاننامە هونەرێکی ترە لەو هونەرە ئەدەبییانەی کە لە ئاوێزانبوونی چیرۆك‌و ڕۆمان‌و کورتەچیرۆك‌و وتارەوە سەرچاوەدەگرێت‌و کەس یان تاکەکەس ڕەگەزی زاڵەو هەموو بابەتەکان لە دەوری ئەودا دەخولێنەوە تائەوەی نووسەرێکی وەك (جۆرج

---

277 بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧: ٢٩).

278 بڕوانە: علی بو ملحم (١٩٧٠: ١٦١).

279 بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥: ٢٥٩).

280 بڕوانە: د. شکریە رسول (١٩٨٧: ١١).

281 بڕوانە: د. شکریە رسول (١٩٨٩: ١٤٢).

مای) ژیاننامەی ئەدەبیی بە "ژیاننامەی ڕۆمانگەریی" ناودەبات‌و پێی وایە، سەرچاوەی بابەت‌و بەرهەمی ئەدەبیی زۆرێك لە ڕۆماننووسەکان، ژیانی زاتیی خۆیانە[282]، (فیلیپ لۆجۆن)یش نووسەری فەرەنسایی دەڵێت: ((گێڕانەوەیەکی پەخشان ئامێزە، کەسێکی واقیعبین دەربارەی بوونی خودیی خۆی دەنووسێت‌و جەخت لەسەر ژیان‌و مێژووی کەسیی خۆی دەکاتەوە))[283]، لە زۆرباردا ژیاننامە پانۆرامایەکی ژیانی کەسێکە کە لە تێگەیشتن یان خواست‌و حەزی خۆی بۆ ڕووداوەکانی ژیان دێت‌و سەرگوزشتە یان قۆناغەکانی ژیانی بوارێکی تایبەتیی یان گشتیی خۆی دەنووسێتەوە.

## ٨. گەشتنامە* (Travelogs)

مەبەست پێی ئەو نوسراوانەیە کە زۆرجار ئەو کەسانە نووسیویانن کە چوونەتە ناوچەیەکی دەرەوەی ناوچەکەی خۆیان، وەك: گەڕیدەو گەشتیارو خۆرهەڵاتناس‌و مژدەبەرو ئەفسەرو نووسەرو دبلۆمات‌و کەشتیوان‌و...تاد، لە پرۆسەی گەڕان‌و گەشتیاریی‌و هاتوچۆکردنیان بۆ شوێنێك یان بۆ چەند شوێنێك، نووسیویانەتەوە، (ت. س. ئیلیۆت) دەڵێت: (( بگەڕێن،...بجولێن ئەی گەڕیدەکان، بەدڵنیاییەوە کاتێك دێنەوە ئێوە ئەو کەسانە نابن کە پێشتر ڕۆیشتوون))[284]، یان ((هونەرێکە زۆرێك لە خەڵکی بەناوبانگ، یان پرۆفێشناڵ، یان نووسەرێك کە هەموو کاتی خۆی بۆ ئەم بابەتە تەرخانکردووە، دەینووسێت کە خوازیاری ڕوداوی سەیروسەمەرەو سەرکەشانەو گەڕان‌و دۆزینەوەیە))[285]، مەبەست لەمەش ئەوەیە، لەڕێی ئەم پرۆسەیەوە هەریەك لەوانە زانیاریی زۆر لەسەر ژیان‌و کەلتورو

---

[282] بڕوانە: جورج مای (١٩٩٢ : ١٨٤-١٨٥).

[283] کمال الریاحي (٢٠٠٤ : ٦)

* لە هەندێك سەرچاوەدا (Travel book)یشی پێدەڵێن. هەندێك سەرچاوەش بەیەکێك لە جۆرەکانی ژیاننامەی باسدەکەن. بڕوانە: (د. سیروس شمیسا :١٩٩٥ :٢٥٩).

[284] بڕوانە: د. حسین محمد فهیم (١٩٨٩ : ٧).

[285] J. A. Cuddon (1984: 715).

مێژو و جوگرافیاو فۆلکلۆرو...تاد، هەموو بوارەکانی تری ژیانی میللەتانی ترو دابونەریتو خووڕەوشتو ئایینو زمانو پێکهاتەی کۆمەڵایەتییو باری دەروونیان، کۆدەکەنەوە، (( نووسەر کە گەشتنامە دەنووسێ چ هی خۆی و چ هی کەسانی دی، لەگەڵ خۆیو ئەو کەسەدا وێنەی سەردەمو جێوڕێو ڕوداوو باری ژیان وێنەدەکێشێ...، ئەوەی تۆماری دەکات دەبێتە موڵکی مێژوو جوگرافیاو کۆمەڵناسییو لە بواری ئەدەبیشدا دەبێتە نمونەی پەخشانی ئەو وەختەو ئاوێنەی ڕێگەو شێوازی هونەرییانەی پەخشان نووسین))[٢٨٦].

گەشتنامە بە پلەی یەکەم کۆکردنەوەیە لە نێوان بابەتە ئەتنۆگرافییو کارە کلتورییەکاندا، کە لە خودی ئەو کۆمەڵگایەی کۆدەکاتەوەو دواجار بە تێڕوانینی خۆی و بەپشتبەستن بە دیمەنە بینراوو بیستراوو درکپێکراوەکان دەیانووسێتەوە، هەر ئەمەش وا لە گەشتنامە دەکات کە (( سەرچاوەیەکی ئەتنۆگرافیی بەهاداربێت))[٢٨٧]، ئەم جۆرە هونەرە لە زۆرباردا سودێکی گەورەی بۆ مێژووی نەتەوەکان خۆیشیان دەبێت، وەك ئەوەی ئەمڕۆ کورد بەشێکی زۆری مێژووی خۆی لە گەشتنامەو نووسراوو کتێبی خۆرهەڵاتناسو مژدەبەرەکانەوە کۆدەکاتەوە.

گەشتنامە بەگشتیی پشت بە دوو بنەما دەبەستێت:

أ. تۆمارکردنی بینینو بیستنو بەڵگەنامە کۆکردنەوە.

ب. وەسفکردنو داڕشتنی ئەدەبییانە.

جۆرەکانی گەشتنامەش دابەشدەبن بۆ:

- شێوازی تۆمارکردنی ڕۆژانە.
- نامەناردن.
- بەپێی شوێنی جوگرافیی.
- بەپێی زنجیربەندیی کات.
- بەپێی بابەت.

---

[286] عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ١٨١)،

[287] د. حسین محمد فهیم (١٩٨٩ : ٨٦).

## ٩. یاداشتنامە

نووسینەوەی ڕووداوە تیاژیاوەکانی کەسێکە بەپێی مەزەندەی عەقڵی خۆی و بەو تێڕوانینانەی ئەو کەسە بۆ ڕوداوەکانی هەیە. یادەوەریی، یان یاداشتنامە، یان بیرەوەریی بەشێوەیەکی ژیاننامە دەزانرێت[288] بەو تێڕوانینەی کە هونەرێکە ناتوانرێت لە ژیاننامە جیابکرێتەوە، بەڵام ئەوەی دەتوانێت ببێتە هێڵی جیاکەرەوەی لە ژیاننامە ئەوە دەبێت کە لە یاداشتنامەدا تەنها نووسەر باس لە ژیانی خۆی ناکاتو زیاتر لە دەوروبەرو ژینگەو ڕوداوەکانی دەوروبەری دەدوێتو بە بابەتیتر لە ژیاننامە سەیردەکرێتو سەرچاوەیەکی مێژوویی گرنگ دەبێت بۆ ڕوداوەکان.

دەربارەی ئەم هونەرە دەوترێت: یاداشتنامە بەقەد ئەوەی جۆرێك یان فۆڕمێکی ئەدەبییە، بەهەمان شێوە بریتییە لە کردەیەکی کۆمەڵایەتیی، چونکە ئەو (من)ەی بەهۆی ئەم جۆرە نووسینەوە خۆی بە خوێنەرانی دەناسێنێت، بوونەوەرێکی خەیاڵیی نییە، بەڵکو حەقیقەتەو بە چەشنێك لە چەشنەکان دەیەوێت ڕاستیی بگێڕێتەوە[289].

---

[288] بڕوانە: د. سیروس شمیسا (١٩٩٥: ٢٥٩).

[289] بڕوانە: د. موحسین ئەحمەد عومەر (٢٠٠٥ : ١٢).

## ١٠. نامە* (Treatise)

بریتییە لەو ڕاسپاردە زارەکیی، یان بابەتە نووسراوەی کە کەسێك بۆ کەسێکی تر، یان کەسێك بۆ کەسانی تری دەنێرێتو بۆ دوو جۆر دابەشدەبێت[٢٩٠]:

أ. تایبەتیی، کە نووسەر بۆ گەیاندنی نیازی خۆی بە یەکێك یان بە کەسانێك، دەینێرێت.

ب. گشتیی، کە بریتییە لە نامەی میریی و کاربەدەستانی دەوڵەت، یان نامەی ئیش وکار، یان نامەی کراوە.

نامەی نووسراویش چ تایبەتیی بێت یان گشتیی، لە ڕووی پەخشانەکەیەوە ((سەیری جۆری داڕشتن و ڕەوانیی و وردەکاری یەکەی دەکرێتو بەر هەڵسەنگاندنی ئەدەبیی دەکەوێت))[٢٩١]، لە فەرهەنگی زاراوە ئەدەبییەکانیشدا هاتووە: (( نامە، بەرهەمێکە پەیڕەوبەندیی تیاپەیڕەو دەکرێتو دەربارەی بابەتێکی دیاریکراوەو بنەماکانی ئەو بابەتە لەلایەن کەسێکەوە دەنووسرێت))[٢٩٢]، نامە بە ڕەنگدانەوەی لایەنە سایکۆلۆژیی و کەسێتییەکانی نامەنووس دادەنرێت، بۆیە زۆرجار بۆ لێکدانەوەی کەسێتیی نووسەرێك یان هەر کەسێکی تر سودی لێوەردەگیرێت، تا ئەوەی (( لە ئەوروپاو وڵاتاندا نامەی شاعیرو نووسەرو هونەرمەندان کۆدەکەنەوەو وەکو بەرهەمێکی ئەدەبیی چاپ و بڵاوی دەکەنەوە...، لە ڕاستیشدا ئەم کتێبانە بۆ توێژەرەوەو مێژوونووسانی ئەدەب نرخی تەواو نابێت))[٢٩٣].

---

* هەرچەندە نامە لە هەندێك زماندا بە کتێبیش دێت، یان ئاماژەیە بۆ نامەیەکی زانستیی وەك ماستەرنامە، یان دکتۆرانامە، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە نامەی نێردراوی کەسێکە بۆ نامەوەرگرێکی بەرامبەر چ تاك بێت یان کۆ.

[290] بڕوانە: عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ٢٣٢).

[291] عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ٢٣٣).

[292] J. A. Cuddon (1984: 715).

[293] عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨ : ٢٣٧).

## ١١. دانان

دانان، یان نووسینی بەرهەمێکی کامڵ و هەمەگیرو تەواوە لە بوارێکی تایبەتیی و دیاریکراودا، زیاتر بۆ کتێب و نامیلکەنووسین بەکاردێت، نووسەری کتێب لە دانانی بەرهەمەکەیدا، هەموو توانستەکانی خۆی بەگەڕدەخات، بەجۆرێك کە دەبێتە بەشێك لە کەسێتیی خاوەنەکەی. کتێب و نامیلکەش دوو بەرهەمی تۆمارکراوی گرنگی مرۆڤن، کە تەکانێکی گەورەیان بە بواری کەلتوریی و ڕۆشنبیریی لە دنیادا داوە، (( کتێب تەنها لە بابەتێك دەدوێت. سەرچاوەیەکە کە هەمیشە دەتوانیت بچیتەوە سەری))[٢٩٤].

کتێب هەر وەك لە ڕابردوودا سەرچاوەیەکی زانیاریی و مێژوویی گەورە بووەو ناتوانرێت فەرامۆش بکرێت، لەم چەرخەشدا چاپکردنی کتێب، گەشەیەکی زۆری کردووەو بەهۆی تەکنۆلۆژیای نوێیشەوە لە ئەمڕۆدا کتێبی ئەلکترۆنیی هاتۆتەکایەوە. کتێب بەشێوەیەکی گەشەسەندووی نامە دەزانرێت، بەڵام نامەیەك کە زیاتر لایەنی بابەتیی زاڵبێت بەسەر لایەنی خودییدا، لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کتێب جێی وتاربێژیشی گرتۆتەوەو دەتوانێت سەرچاوەیەکی بەنرخی زانیارییەکانی تاك و کۆمەڵیش بێت[٢٩٥]، داهاتن و گەشەسەندنی کتێب، ڕۆڵی ئەدەبی گرنگتر کرد، بەوەی دەقەکان لە سەرزارییەوە پەڕینەوە بۆ دۆسییە تۆمارکراوەکان و دواتر لە چێوەی بەرهەم و دیوان و کتێبی ئەدەبیی جۆراوجۆردا بڵاوبوونەوەو هەموو ئەو سامانە مرۆییە بەنرخانەی لە فەوتان و لەناوچوون پاراست.

---

[294] هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧: ٣٠).

[295] د. عبداللطيف حمزة (١٩٦٥ : ١٩).

## ١٢. لێکۆڵینەوە

لێکۆڵینەوە بەگشتیی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی بەتایبەتیی، هونەرێکی زانستییانەی پەخشانە، ئەو ڕێگەیەیە کە لێیەوە ئەدەب دەتوانێت لە خۆی بدوێت و ڕەخنەو شیکردنەوەو ڕاڤەکردن و هەڵسەنگاندن لە سەر خۆی بکات و میتۆدو تیۆری نوێی بۆ دابڕێژێت.

لێکۆڵینەوە مێژوویەکی دێرینی هەیەو تەریبە بەبوونی مرۆڤایەتیی لە سەر زەوی، بەڵام ئەوەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، ئامڕازو ئامێرو کەرەستەو ڕێگاکانین، کە لە رووی چۆنێتیی و چەندێتییانەوە لەگەڵ گەشەی مەعریفییدا گەشەیانکردووەو گۆڕاون، ئەو ڕێگایانەش کە پێیدا تێپەڕیوە بریتین لە[296]:

ا. ڕێکەوت.

ب. هەوڵدان و هەڵەکردن.

پ. دەسەڵات و لاسایکردنەوە.

ت. لێزانیی و شارەزایی.

ج. هەڵێنجان و خوێندنەوە.

ح. ڕێگای زانستیی لە لێکۆڵینەوەدا (میتۆدی لێکۆڵینەوەی زانستی).

(ئۆگست کۆنت) دامەزرێنەری زانستیی کۆمەڵناسیی نوێ، دەڵێت: بیری مرۆڤایەتیی بەم سێ قۆناغەدا ڕۆیشتووە[297]:

ا. قۆناغی هەستگەرایی، بە قۆناغی وەسفیش دەناسرێت کە تیایدا پشتی بە هەستەوەرەکان بەستووە.

ب. قۆناغی لێکۆڵینەوە، بە قۆناغی بیرکردنەوەی ڕامانگەریی فەلسەفیانەش ناودەبرێت، لێکۆڵینەوەیە لە ماک و هۆکاری زۆرێك لە دیاردەکانی وەك مردن و ژیان و...تاد.

پ. قۆناغی ئەزمونگەریی زانستیی، بە قۆناغی شیکردنەوەش دەناسرێت.

---

[296] بڕوانە: محفوظ جودة (١٩٩٧: ١٢)، د. محمد ازهر سعيد السماك (١٩٨٦ : ١٢).

[297] ذوقان عبيدات (١٩٩٢ :٣٣).

هەندێکی تر پێیان وایە بیری مرۆڤایەتیی لەم پرۆسەیەدا، بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە[٢٩٨]:

ا. قۆناغی ئەندێشەگەریی ( قۆناغی ڕاڤەکردنی خەیاڵ).

ب. قۆناغی ئایینیی ( قۆناغی ڕاڤەکردنی غەیبیی).

پ. قۆناغی زانستیی ( ڕێگای زانستیی لە لێکۆڵینەوەدا)، کە پشت بە ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان دەبەستێت.

بەگشتیی، لێکۆڵینەوە، هەوڵدانێکی وردو ڕێکخراوو سیستماتیکیانەیە بۆ گەیشتن بەچارەسەری کێشەکان، یان دۆزینەوەی ڕێگای نوێ بۆ دۆزینەوەی زانیاریی نوێ یان ڕاستەقینەکان[٢٩٩].

## ١٣. بیبلۆگرافیا (Bibliography)

ڕیزبەندکردنی بابەتەکانی کتێب، یان هەر بڵاوکراوەیەکی ترە، بەپێی ڕیزبەندکردنی ژمارە دەرچووەکانیو وابەستەی مێژووی دەرچوونو ناوی نووسەرو لاپەڕەو بابەتە بڵاوکراوەکان دەبێت، ( د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) بیبلۆگرافیا بە (تەرجومەی حاڵ) دەناسێنێت[٣٠٠]، یان هونەری وەسفکردنی کتێب، یان دەستنووسو ناساندنیەتی لە ڕێی گێڕانەوەیەکی ڕەخنەئامێزانە بەو کتێبانەی کە پەیوەندییان بە بابەت، یان سەردەمەکەی، یان نووسەرەکەیەوە هەیە، یاخود خستنەڕوی دانراوەکانی نووسەرێك، یان چاپکراوەکانی خانەیەکی بڵاوکردنەوەیە[٣٠١]، هەندێك سەرچاوەش بیبلۆگرافیا بەوە دەناسێنێت کە (( لێکۆڵینەوەیە لە کتێبێك بە جۆرێك کە پەیوەندیی بە فۆڕمەکەیەوە هەبێت نەك بە

[298] محفوظ جودة (١٩٩٧: ١٤).

[299] د. يعقوب حسين نشوان (٢٠٠٤ : ٦).

[300] بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٠ : ٢)

[301] بڕوانە: د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ٩٣).

ناوەڕۆکەکەیەوە، وەك ژمارەی دەستنووسەکانی کتێبێك، مێژووەکەی، جیاوازیی نێوان چاپی کتێبێك‌و چاپێکی تری هەمان کتێب، یاخود جێگیرکردنی ناونیشانەکانی کتێبگەلێکەو ڕیزبەندکردنیانە لەسەر بنەمای ناوی نووسەرەکانیان، یان ناونیشانیان، یان شوێنی دەرچوونیان، یان کاتی دەرچوونیان،...تاد))[٣٠٢].

## ١٤. وەرگێڕان ( Translation)

پرۆسەی گۆڕینی بابەتێکە لە زمانی بەکارهاتووی نووسینی بابەتەکەوە بۆ سەر زمانێکی تر، بەجۆرێك کە بتوانێت تا ڕادەیەکی نزیك ناوەڕۆك‌و واتاو مەبەستی بەرهەمە وەرگێراوەکە بۆ زمانە بۆوەرگێڕاوەکە ڕەچاوبکات. سروشتی هەر وەرگێڕانێکیش وادەکات کە بە ڕاستەوخۆبێت یان ناڕاستەوخۆ، دواجار دەقە بنەڕەتییەکە هەرچۆنێك بێت بە جۆرێك لە پەخشان وەربگێڕدرێتە سەر زمانی دووەم، ئەم پرۆسەیە کە هەمیشە ناتوانێت پرۆسەیەکی تەواوکارییانەی بەرهەمێك بێت، وەك (ڕەسوڵ حەمزەتۆف) دەڵێت: لەگەڵ ئەوەی باشترین وەرگێڕان ڕووی دووەمی فەرشێکە نە زیاتر، بەڵام بایەخێکی گرنگی لە پەرەپێدانی بوارە مرۆیی‌و ئەدەبییە جیاجیاکاندا هەبووەو ئەو پردەشە کە کەلتورو ڕۆشنبیریی گەلان بەیەکتری دەناسێنێت.

وەرگێڕان تەنها گۆڕینی وشەیەك نییە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، یان ڕستەیەك بۆ ڕستەیەکی تر، بەڵکو گوێزانەوەی وێنەو ڕووداوەکانە بە هەموو دۆخ‌و واتاو ئاماژەو ڕوکارو ئەگەرەکانییەوە، بەجۆرێك ئەو وێنەیە بەرجەستە بکات، کە لە زمانە بنەڕەتییەکەدا کێشراوە.

وەرگێڕان بۆ دوو جۆر* دابەشدەبێت[٣٠٣]:

---

[302] د. محمد فرید محمود عزت (٢٠٠٢ : ٨٠).

* هەر بەم پەیڕەوە دابەشکردنە (جورج ستاینەر) لە کتێبەکەیدا بەناوی (After Babel)دا، لێکدانەوەیەکی تر دەکات بەوەی:

ا. وەرگێڕانی ئاسۆیی، ئەو وەرگێڕانەیە کە وەرگێڕ هەوڵدەدات بە پانتایی بابەتەکەدا بڕوات تا ئەوەی نزیکترین واتا بۆ گۆڕینی بابەتێك بۆ بابەتێکی تر ڕەچاوبکات، وەك وەرگێڕانی چوارینەکانی خیام، یان وەرگێڕانی هەر دەقێکی ئەدەبیی تر.

ب. وەرگێڕانی ستوونیی، گۆڕینی واتای گشتیی بابەتێکە بۆ زمانێکی تر بەجۆرێك مەرج نییە هەموو بڕگەو پەرەگرافەکان وەکو خۆیان بمێننەوە یان وەربگێڕدرێنن، وەك وەرگێڕانی ڕاستەوخۆ، یان وەرگێڕانی هەواڵێك.

یان دەوترێت وەرگێڕان (( پرۆسەی گواستنەوەی وێنەیەکی زەینیی یان بابەتێکە بە هەموو واتاو ئاماژەو ڕوکارەکانییەوە، بەجۆرێك کە بتوانێت گوزارشتکەرێکی تەواوبێت لە تێکستە بنەڕەتییەکە))[٣٠٤]. ئەوەی گرنگە لە وەرگێڕاندا، دەشێت وەرگێڕ زمانی دەقە بنەڕەتییەکەو زمانی دەقە بۆوەرگێڕدراوەکە بەتەواویی بزانێتو شارەزای زاراوەو وشەگەلی ئەو بوارە تایبەتە بێت کە وەرگێڕانەکەی تێدا دەکات[٣٠٥]، (حاجی قادری کۆیی)یش دەڵێت:

(( بێگانە بە تەرجومەی زوبانی ئەسراری کتێبی خەڵقی زانی))[٣٠٦]

هەندێك سەرچاوەش وەرگێڕان تەنها بە وەرگێڕانی دەقێکی تەواو بۆ زمانێکی تر نازانن، بەڵکو ئەو وەرگرتنانەی لە قورئانو شیعرو بابەتی زمانێکی تریشەوە

---

١. وەرگێڕانی ئاسۆیی: بریتییە لە تێگەیشتنی مرۆڤ لە زارە جۆربەجۆرەکانی ناو زمانەکەی، وەکو زاری هەژارەکان، زاری چینەبەرزەکان، زاری منالان،...تاد.لێرەدا تێگەیشتن دەبەسترێتەوە بە جوگرافیا، یان سۆسیۆلۆژیا، یان نەژادەوە.

٢. وەرگێڕانی ستونیی: تێگەیشتنی هەر دەقێکی نووسراوی پێش ئەو چەرخەیە کە خوێنەرەکەی تێدادەژیو بەستراوەتەوە بە لێکدانەوە هۆشەگییەکانەوە، چونکە زمان لەگەڵ گۆڕانی کاتدا دەگۆڕێت. بڕوانە: (د. یۆئیل یوسف عزیز :١٩٨٤ : ١٨-١٩).

[303] بڕوانە: د. محمد فرید محمود عزت (٢٠٠٢ : ٥٧٦).

[304] د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٩٧٢).

[305] بڕوانە: واثق الدايني (٢٠٠١ : ٣).

[306] بڕوانە: د. فەرهاد پیربال (٢٠٠٢ : ٧).

وەردەگێڕێن، بە وەرگێڕان دەزانن، وەك ئەو شێوانەی لە چوار خشتەكیی و پێنج خشتەكییدا دەكرێت و ((دێڕە شیعرێك یان چەند دێڕەشیعرێكی شاعیرێكی فارس، یا عەرەب یا توركیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی و تێهەڵكێشی شیعرەكەی خۆیانیان كردووە))[٣٠٧]، یاخود وەرگێڕانی وشەی زمانێكە بۆ زمانێكی تر، واتە وشە بەرامبەر بە وشە، وەك ئەوەی لە فەرهەنگەكاندا پەیڕەودەكرێت و بە گشتییش وەرگێڕان لە نێوان دوو دیالێكتی جیاوازدا دێتەكایەوە.

## ١٥. گۆڕین

بریتییە لە گۆڕینی بەرهەمێكی ئەدەبیی لە بەشە دیالێكتێكی زمانێكەوە بۆ بەشە دیالێكتێكی تری هەمان زمان بە بەكارهێنانی ئەو پەیڕەوو یاسایانەی ڕێ بەم پرۆسەیە دەدەن لە هەریەكەیاندا. ئەم هونەرە ئاوێزانبوون و تێكەڵاوبوون و پەرەپێدانی فەرهەنگی نەتەوەیی زمانێكی دیاریكراو فەراهەمدەكات و بەرهەمی نەتەوەیی پێ دەوڵەمەند دەبێت.

## ١٦. ڕۆژنامەنووسی

بوارێكی دەوڵەمەندو كارای پەخشان پێكدەهێنێت، پەخشان هونەرە ڕۆژنامەنووسییەكانی پێدەنووسرێت و ڕۆژنامەنووسییش پەخشان دەوڵەمەنددەكات، لەبەشی دووەمی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا، وەك چەشنێكی بەرفراوانی نووسینی كرداریی لە ڕۆژنامەنووسیی دەكۆڵینەوە.

---

[307] د. فەرهاد پیربال (٢٠٠٢ : ١٧).

## ١/٢) چەمکی ڕۆژنامەنوسی

ڕۆژنامەنوسیی وەك هەر چەمك‌و زاراوەیەکی تری ناو زانستەمرۆڤایەتییەکان، تاکە لێکدانەوەو پێناسەیەکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو بەچەندین جۆر ناسێنراوەو هەر بوارێکی مرۆڤایەتیی لە گۆشەنیگای خۆیەوە ئەم زاراوەیەی لێکداوەتەوە، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی کە پێکهاتەو ناوەڕۆك‌و تایبەتمەندیی ڕۆژنامەنوسیی ونبکات، بەڵکو بایەخ‌و ڕۆڵی لە ناوخۆی‌و لە ناو زانستەکانی تریشدا زیاددەکات.

لێکدانەوەکانی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەو ڕوانگەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە خودی ڕۆژنامەنوسییە، ڕۆژنامەنوسییەك کە لە هەناوی کایە ئەدەبییەکانەوە لەدایکبووە، بەجۆرێك کە تائەمڕۆش ناتوانرێت پشکی ئەدەب لە ڕۆژنامەگەرییدا وەلاوەبنرێت. ڕۆژنامەنوسیی‌و دواتریش ڕۆژنامەگەریی ئاوێزانی تەواوی بوارەکانی ژیان بوون‌و تائەوەی بونەتە کەسێك یان ئەندامێك لە ئەندامەکانی هەر خێزانێك‌و ئامادەییەکی دیاریان لە ژیانی ڕۆژانەماندا هەیە، (( ڕۆژنامەنوسیی دڵی کۆمەڵگاو هۆش‌و هەستەکانییەتی، ئەو ئاوێنەیەیە کە ئەو شتانەی لە دەوروبەرماندا دەگوزەرێن، پیشانمان دەدات، نەك هەر ئەوانە بەڵکو ئەوانەشی کە لە پشتی پەردەوە ڕودەدەن‌و پێیان نازانین، ڕۆژنامەنوسیی دێت‌و بۆمان ئاشکرادەکات))[٣٠٨].

ڕۆژنامەنوسیی لە لاتینیدا بە Journalism دێت، کە لە وشەی Journal وە وەرگیراوە، ئەویش لە وشەی Jour ی فەرەنسییەوە وەرگیراوە کە بەمانای" ڕۆژ" دێت، Journal لە فەرەنسییدا بەمانی ڕۆژانە دێت. (فەرهەنگی ئۆکسفۆرد)

---

[308] د. إسماعيل إبراهيم ( ١٩٩٨ : ٧).

* تا سەردەمانێکی زۆر تەنها ڕۆژنامەی چاپکراو هەبووە، بۆیە زاراوەی ڕۆژنامەنوسیی لە بەرامبەر جۆرنالیزم و پرێسیشدا هاتووە، بەڵام لە دوای داهاتنی کەناڵە میدیاییەکانی ترو پەرەسەندنی تەکنیکەوە، لە ئێستادا لە بەرامبەریاندا ڕۆژنامەگەریی دێت‌و ڕۆژنامەنوسییش بەبەشێکی سەرەکیی پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی هاوچەرخ دەژمێررێت.

زاراوەی (Press) بە واتای ڕۆژنامەنوسیی * بەکاردەبات و مەبەست پێی شتێکە کە پەیوەندیی بە چاپ و بڵاوکردنەوەو زانیاریی و هەواڵەکانەوە هەبێت[309]. لە زمانی عەرەبیدا زاراوەی (الصحافة) ی بۆبەکاردێنن کە بە پیشەی ئەو کەسە دەزانرێت کە هەواڵەکان کۆدەکاتەوەو لە ڕۆژنامە یان گۆڤارێکدا بڵاویاندەکاتەوە[310]. یەکەم کەسێك لە زمانی عەرەبییدا کە ئەم زاراوەیەی بەمانای ئێستای بەکارهێناوە "نجیب الحداد"ی دامەزرێنەری ڕۆژنامەی "لسان العرب" بووە لە ئەسکەندەرییە لە میسر[311]. بەگشتیی ئەم دوو زاراوەیە "جۆرنالیزم و پرێس" کە بەواتای

---

[309] بڕوانە: OXFORD ADVANCED LEARNER`S DICTIONARY: (1989 : 981).

[310] بڕوانە: د.أدیب خضور (٢٠٠٠ : ٩).

[311] بڕوانە: (حیدر حسون الفزع : ٢٠٠٥: ٨).

* "ڕۆژنامە" لە زمانی ئینگلیزییدا زاراوەی Newspaperی بۆ بەکاردێنن، کە لە لێکدانی هەردوو وشەی news هەواڵەکان و paper کاغەز یان پەڕەوە وەرگیراوە، بەواتای پەڕەی هەواڵەکان، لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمدا ئەم زاراوەیە لە زمانی ئینگلیزییدا چەسپا. بڕوانە: ( سلێمان حەیدەر پور دەعوا یسرا :٢٠٠١: ٧٢).

لە زمانی عەرەبیدا، زاراوەی (صحیفة) یان (جریدة)ی بۆ بەکاردێنن، کە لە بنەڕەتی وشەی (صفحة)ەوە هاتووە و بەمانای ڕوو، یان پێست هاتووە، (صحیفة) بەمانی پەڕەیەك کە لە هەردوو ڕووەکەی نوسرابێت. لە زمانی کوردییشدا ئەوەی تا ئێستا زانرابێت (حاجی قادری کۆیی ) بەیەکەمین کەسێك دادەنرێت کە زاراوەی (جەریدە)و (ڕۆژنامە)ی لە نوسیندا بەکارهێنابێت، ئەمەش لەساڵی ١٨٧٠دا کە دەڵێت: (صەد قائیمەو قەصیدە کەس نایکڕێ بە پووڵێ ڕۆژنامەو جەریدە کەوتوونەتە قیمەت و شان)، یان دەڵێت: (لە دەوری ئێمە ڕۆمان و جەریدە ئەگەرچی مەقصەدە، زانینی باوە) بڕوانە: د. کەمال فوئاد :٢٠٠٠: ٩). شێخ محەمەدی خاڵیش لە فەرهەنگی خاڵدا دەنوسێت: (( ڕۆژنامە: نووسراوێکە ڕۆژو مانگ و ساڵ پیشان ئەدا. نووسراوێکی چاپکراوە ڕۆژ بەڕۆژ دەرئەچێ بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگ و باس. بڕوانە: (شێخ محمدی خاڵ : ١٩٦٤: ١٨٤)، یان دەوترێت: (( ڕۆژنامە لە بنچینەدا لە دوو وشەی لێکدراوی کوردی پێك هاتووە ڕۆژ، نامە واتە نامەی ڕۆژانە)) بڕوانە: (جەبار جەباری : ٢٠٠٤: ٤٢). بەڵام بەلێکدانەوەی ئێمە مەرج نییە ڕۆژنامە ڕۆژ بەڕۆژ دەربچێت، یان نامەی ڕۆژ بێت، بەڵکو ڕۆژنامە کەلە دوو وشەی (ڕۆژو نامە) لێکدراوە، قاڵبی گرتووەو بووە بە ناوێکی لێکدراوی نوێ. کە

ڕۆژنامەنوسیی دێن، بریتین لە زانستو هونەری دەرکردنی ڕۆژنامە* و گۆڤارو بواری نوسینو داڕشتنی بابەتو هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانو هونەرەکانی وێنەکێشانو وێنەگرتنو هێڵکاریی و دیزاینو چاپکردنو ڕیکلام بڵاوکردنەوە، کە پرۆسەی دابەشکردنو فرۆشتنیشیان بەدوادادێت[٣١٢]. جۆرنالیزم بە واتایەکی گشتگیرتر دێتو گوزارشتە لە ڕۆژنامەگەریی وەك زانست، پرێس سنوردارترەو زیاتر بۆ گوزارشتکردنە لە پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی، هەر ئەمەشە وایکردووە بە پێی زانستیی ڕۆژنامەگەریی نوێ جۆرنالیزم بەو زانستە بزانرێت کە لە تیۆرو پرۆسەی ڕۆژنامەگەرییش دەکۆڵێتەوە کە ئەمەی دواییان دەچێتە خانەی ( The press)ەوە[٣١٣]، زاراوەی جۆرنالیزمیش لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمەوە بەتەواوی لە زمانی ئینگلیزییشدا بەم واتایەی دەچەسپێت[٣١٤].

(شێخ محەمەدی خاڵ) دەنوسێت: ((ڕۆژنامەگەریی: خەریکبوون بە دەرکردنی ڕۆژنامەوە دەبەخشێ))[٣١٥]، (د.کەمال مەزهەر)یش دەنوسێت: (( نووسەرانی کورد زاراوەی "ڕۆژنامەگەریی" بۆ "الصحافة" بەکاردێنن...بەڵام قسەی چەند برادەرێکی شارەزا وای لێکردم "ڕۆژنامەنوسیی" بەکاربێنم، چونکە زیاتر لەگەڵ دەستوری زمانی کوردییدا دەگونجێ))[٣١٦]، بەڵام ئێمە لێرەدا زاراوەکانی( ڕۆژنامەنوسیی، ڕۆژنامەگەریی، ڕۆژنامەوانیی) بەم جۆرانە دەناسێنین:

١. ڕۆژنامەنوس: هەر کەسێکە بۆ ڕۆژنامە بنوسێ، ئیدی مەرج نییە لە ناو ڕۆژنامەکەدابێتو بەدوای کۆکردنەوەی زانیارییەکاندا بچێت.

---

"ڕۆژنامە"یە ئەم ڕۆژنامەیە بە واتای Newspaper دێت کە ناوە بۆ کەناڵێکی ماسمیدیایی کە بەخولی ڕێکوپێك دەردەچێتو مەرج نییە ڕۆژانە بێت، وەك دەوترێت ڕۆژنامەیەکی هەفتانەیە، کەواتە ڕۆژنامە ناوە بۆ کەناڵەکە نەك بۆ وادەو خولی دەرچونی ڕۆژنامەکە.

312 بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٥٢٩).

313 بڕوانە: د.أديب خضور (٢٠٠٠ : ٩).

314 بڕوانە: سلێمان حەیدەر پور دەعوا یسرا (٢٠٠١: ٧٤).

315 شێخ محمدی خاڵ ( ١٩٦٤: ١٨٤).

316 د. کەمال مەزهەر ئەحمەد (١٩٧٨ : ٥).

٢. ڕۆژنامەگەر: هەر کەسێکە تەکنیك لە ڕۆژنامەدا بەکاربێنێت بۆ کۆکردنەوە یان تۆمارکردن، یان چاپکردن، یان دیزاین، یان بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە.

٣. ڕۆژنامەوان: هەر کەسێکە کە لە ڕۆژنامەیەکدا کاردەکات، یان بابەتەکانی بۆ ڕۆژنامە ئامادەدەکاتو بەخۆی بەدوای کۆکردنەوەو ڕوماڵکردنی زانیارییەکانەوە دەبێتو دەیانکاتە بابەتی ڕۆژنامەنوسیی، کەواتە لایەنی پرۆفێشناڵێتیی لە ڕۆژنامەنوسییدا دەگرێتەوە.

واتە: هەموو ڕۆژنامەوانێك ڕۆژنامەنوسەو ئەگەر تەکنیکیشی بەکاربرد ئەوا ڕۆژنامەگەریشە، بەڵام مەرج نییە هەموو ڕۆژنامەنوسو ڕۆژنامەگەرێك ڕۆژنامەوان بن. کەواتە:

١. ڕۆژنامەنوسیی: هەموو ئەو هەنگاوو پرۆسانەیە کە بۆ نوسین یان ئامادەکردنی پەیامێکی میدیایی بەڕێوەدەچنو زیاتر وابەستەی پەیامێکی نوسراوە بۆ هەر کەناڵێکی میدیایی بە ڕۆژنامەشەوە. لەبەر ئەوەی لە ڕۆژنامەی چاپکراودا نوسین ڕەگەزی زاڵە، بۆیە ئەم زاراوەیە زیاتر بۆ ڕۆژنامەی چاپکراو بەکاربراوە، بەڵام بە نوسینی پەیامی ئێزگەیی یان تەلەڤیزیۆنیی یان ئینتەرنێتییش هەر دەوترێت ڕۆژنامەنوسیی (وەك دەوترێت : ڕۆژنامەنوسیی چاپکراو، ڕۆژنامەنوسیی بیستراو، ڕۆژنامەنوسیی بینراو، ڕۆژنامەنوسیی بیستراوو بینراو، ڕۆژنامەنوسیی مەڵتی میدیایی)و لە مێژوی ڕۆژنامەگەریی کوردیشدا زیاتر ڕۆژنامەنوسیی بەکارهاتووە چونکە تەنها کەناڵی ماسمیدیای کوردیی تا سەردەمانێکی زۆر ڕۆژنامەی چاپکراو بووەو هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانیش وەك مۆدێلی نوسین لە نوسیندا بەکاردێن نەك لە ڕۆژنامەگەریی و ڕۆژنامەوانییدا. لە ڕۆژنامەنوسییدا "توانستی کەسیی: ڕەگەزی زاڵدەبێت.

٢. ڕۆژنامەگەریی: پرۆسەی تەکنیککارییە بۆ ڕومالکردنو تۆمارکردنو چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەو پەیامە ڕۆژنامەنوسییەی ئامادەدەکرێت بۆ کەناڵێکی میدیایی بە ڕۆژنامەشەوە، زۆرجاریش لە بری زاراوەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندنیش بەکاردێت، "توانستی تەکنیکیی" ڕەگەزی زاڵدەبێت تیایدا.

٣. ڕۆژنامەوانیی: پرۆسەی گەڕانو کۆکردنەوەی ڕاستەوخۆیانەی ڕوداوو بابەتاکانە کە ڕۆژنامەوان لە ڕێی توانستی کەسیی تەکنیکەوە ڕوماڵیان دەکاتو دەیانکاتە بابەتی ڕۆژنامەنوسییو دەیانگوێزێتەوە بۆ کەناڵێکی میدیایی بە ڕۆژنامەشەوە، "توانستی کەسیی لەگەڵ توانستی تەکنیکیی"دا ڕەگەزی زاڵ دەبن تیایدا.

لە فەرهەنگەکاندا "ڕۆژنامەنوسیی" بەچەند واتایەکی تریش دێت[٣١٧]:

١. پیشەسازیی ڕۆژنامەنوسیی.

٢. نوسینی ڕۆژنامەنوسیی:

ا. بابەتی ئامادەکراو بۆ بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامەدا.

ب. نوسینێك کە بەشێوەی پیشاندان ڕاستەوخۆ ڕوداوەکان بخاتە ڕو.

پ. نوسینێك کە لای وەرگر جێی سەرج بێت.

٣. ڕۆژنامەو گۆڤارەکان.

بەکارهێنانی ڕۆژنامەنوسیی وەك پرۆسەیەك بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاریی، مێژویەکی دێرینی هەیە، زۆرێك لە سەرچاوەکان ئەم مێژووە دەبەنەوە سەردەمی بابلییەکان، بەوەی لەو سەردەمەدا کەسێکیان دەستنیشاندەکرد بۆ تۆمارکردنی گرنگترین ڕوداوەکانی ڕۆژ تا خەڵك لێیان ئاگاردابن، مێژونوسی یەهودیی (فلایفۆس جۆزیف)، ئەوە دوپاتدەکاتەوە کە بابلییەکان مێژونوسەکانی خۆیان

---

[317] بڕوانە: د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ٣١٣).

ڕادەسپارد بەتۆماركردنی ڕوداوەكان ئەمەش لە چەرخی سێیەمی پێش زاییندا[٣١٨]، دواتر چینییەكان دێن كە بە درێژایی ١٥٠٠سالْ ڕۆژنامەیەكی ڕەسمییان بەناوی ئیمپراتۆریەتی خۆرەوە دەركردووە[٣١٩]، ڤۆلتێریش دەلێت: ((لە سەردەمانێكی زۆر كۆنەوە لە چین ڕۆژنامەو گۆڤار هەبوون))[٣٢٠]، یان دەوترێت ڕۆژنامەی "كین بان"ی چینییەكان لە سالْی ٩١١پێش زاییندا یەكەم ڕۆژنامەی دنیا بووەو بەمانگانە دەرچووە[٣٢١]، هەندێك ڕای تریش واباسدەكەن كە یەكەم ڕۆژنامە لە دنیادا ڕۆژنامەی چینییەكان بووە كە بەناوی"كینگ باو"ەوە لە پەكین لە چەرخی هەشتەمی زاییندا دەرچووە[٣٢٢]. سەرچاوەگەلێكی تریش باس لەوە دەكەن كە یەكەم ڕۆژنامەی دنیا ڕۆژنامەی "ئەكتادیۆرینا"ی ڕۆمەكان بووە كە یۆلیۆس قەیسەر لە سالْی ٥٨ی پێش زاییندا دەریكردووە[٣٢٣]، ئەگەر بمانەوێت بۆ مێژوی ڕۆژنامەنوسیی بگەڕێینەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای مێژوی مرۆڤایەتیی، چونكە وەك دەوترێت: ((ڕۆژنامەنوسیی هێندەی دنیا كۆنە))[٣٢٤]، بەلاْم ئەم مێژووە بە مێژوی كۆنی ڕۆژنامەنوسیی دادەنرێت‌و بە قۆناغی پێش چاپەمەنیی دەناسرێت، مێژوی ڕۆژنامەنوسیی بە چەمكی ئێستای بۆ داهێنانی چاپەمەنیی لە سالْی ١٤٣٦ەوە لە لایەن (جۆهان جنسفلیش گۆتەنبەرگ)ەوە لە شاری مایەنزی ئەلْمانیا، دادەنرێت[٣٢٥]. ڕۆژنامەنوسیی نوێ سەرمایەداریی ڕۆلْی گرنگی لە گەشەسەندن‌و بلاْوبونەوەیدا هەبووە، هەندێك سەرچاوەی تریش پێیان وایە ڕۆژنامەنوسیی نوێ مێژووەكەی بۆ نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەیەم

---

318 بڕوانە: أمیل بواڤان (١٩٤٩ : ١١).

319 بڕوانە: www.ar.wikipedia.org/wiki

320 أمیل بواڤان (١٩٤٩ : ١١)، مجد الهاشمی (٢٠٠٣ : ٨٤).

321 بڕوانە: وریا جاف (١٩٩٨ : ٤).

322 بڕوانە: د. تودوروف (١٩٩٠ : ٧).

323 سەرچاوەی پێشوو.

324 أمیل بواڤان (١٩٤٩ : ١١).

325 بڕوانە: www.ar.wikipedia.org/wiki

دەگەڕێتەوە[٣٢٦]. لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی باسی بابلییەکان یان میسرییەکان یان چینییەکان دەکەن، بەڵام دواجار ڕۆژنامەنوسیی بووەتە داهێنانو بەرهەمێکی خۆرئاوایی و ناتوانین بەردەوامبونو پێشکەوتنی ڕۆژنامەکان بەکەم بایەختر لە نوسینەوەی چەند بابەتێکی سادەی ناتاشکراو دۆکۆمێنت نەکراو بزانین، (ئەمیل بواقان) دەڵێت: ((دۆکۆمێنتگەلێکی وا لە بەردەستدانین ئەوە بسەلمێنن کە لە سەردەمانێکی زۆرەوە ڕۆژنامەو گۆڤار لە چین هەبوبن))[٣٢٧]، چونکە بنەماکانی ( شار، خوێندەواریی، بازرگانیی، پیشەسازیی)[٣٢٨] بە بناغەی لەدایکبونی ڕۆژنامەنوسیی نوێ دادەنرێن، (دانیل لیرنەر)یش دەڵێت: ((پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان شارستانیبوونو خوێندنو ڕۆژنامەنوسییدا هەیە))[٣٢٩]. بەدوای قۆناغی چاپەمەنییدا، قۆناغی ڕۆژنامەنوسیی ئەلکترۆنیی و دواتر ڕۆژنامەنوسیی دیجیتاڵیی دێن، کە لە سەردەمی ئەمڕۆدا لە ڕێی ئینتەرنێتەوە بە دنیادا بڵاودەبنەوە[٣٣٠].

ڕۆژنامەنوسییش بۆ هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانو هەریەك لە تیۆری ڕۆژنامەنوسیی و ڕەخنەی ڕۆژنامەنوسیی و مێژوی ڕۆژنامەنوسیی دابەشدەبێت، لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوەکەی ئێمە لەسەر هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانە بۆیە ئەو سێ بوارەی تر لێرەدا ناخەینەڕو.

بەگشتیی ڕۆژنامەنوسیی بەشێکە لە پرۆسەی بەکۆگەیاندن، پرۆسەی بەکۆگەیاندنیش بەشێکە لە پرۆسەی کۆمۆنیکەیشنو ڕۆژنامەنوسییش بەرهەمێك بەرهەمدەهێنێت کە دەبێت بە یەکێك لە ئامرازەکانی ماس میدیا[٣٣١]، کەواتە وەك ئەڵمانییەکان دەڵێن: ((ڕۆژنامەنوسیی بریتییە لە پەیوەندیکردنی مرۆڤ لەگەڵ

---

326 بڕوانە: مجد الهاشمی (٢٠٠٣ : ٨٤).

327 أمیل بواقان (١٩٤٩ : ١١).

328 بڕوانە: د. تودوروف (١٩٩٠ : ٧).

329 د. إبراهیم إمام ( ١٩٩١: ٨).

330 بڕوانە: www.ekateb.net/bookcont/ch9-11

331 بڕوانە: ژان کازنو (١٩٩١ : ٣).

یەکتر بەشێوەیەکی گشتیی و ئاشکرا بەهۆی جۆرەکانی کۆمۆنیکەیشنی زەینی (لەگەڵ /یان) تەکنیکی میدیا بۆ بەرهەمهێنانی تێگەیشتن دەربارەی شتی واقیعیانەی سەردەم و کۆمەڵ))[٣٣٢].

(بیار ئەلبێر) توێژەری فەرەنسایی لە کتێبی ڕژنامەنوسییدا دەڵێت: (( ڕۆژنامەنوسیی ئاوێزانکردنی بەرهەمێکی پیشەسازیی و داهێنانێکی فیکرییە لە یەك کاتدا))[٣٣٣]، (ئەدۆڵف ئۆخس)یش دەڵێت: ((پیشەیەکی پەیڕەوبەندانەیە لە پێناوی بەرژەوەندیی گشتییدا))[٣٣٤]، لە فەرهەنگی ویکیپیدیاشدا هاتووە: ڕۆژنامەنوسیی کۆکردنەوەو شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەو خستنەڕوی زانیارییەکانە دەربارەی ڕوداوە ئێستاییەکان و ئاراستەو دۆزو کەسەکان[٣٣٥]. (د. ئەدیب خەزوور) دەنوسێت: (( ڕۆژنامەنوسیی زانستیشەو هونەریشە، بۆیە وەك هەر زانستێك پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیەو وەك هەر هونەرێکیش پێویستی بەخواست و بەهرەو ئارەزومەندیی هەیە))[٣٣٦]، لەلایەکی ترەوە ڕۆژنامەنوسیی بەدیاردەیەکی زیندوی کۆمەڵایەتیی دادەنرێت و لە زۆر باریشدا وابەستەی ئەو کۆمەڵگایە دەبێت کە تیایدا دەردەچێت، بۆیە ناتوانرێت ڕۆژنامە لە کۆمەڵگا جیابکرێتەوە[٣٣٧]، یان دەوترێت ((ڕۆژنامەنوسیی بریتییە لە پرۆسەی بڵاوکردنەوە لە ڕێگای ئامڕازە چاپکراوەکانەوە))[٣٣٨]، کەواتە ڕۆژنامەنوسیی بەگشتیی ئەو پرۆسەیەیە کە تیایدا لە لایەن کەسی ڕۆژنامەوانەوە ڕوداوەکان ڕوماڵدەکرێن و دواتر دادەڕێژرێن و پاش بژارو جوانکردن و ڕازاندنەوە ئاراستەی خوێنەران دەکرێن و بەگشتیی خۆی لە سێ هونەری دیاریکراودا دەبینێتەوە، کە بریتیین لە:

---

[332] قوباد ڕەسوڵ (٢٠٠٦ : ٢٣).

[333] بیار البیر (١٩٧٠: ١٠).

[334] www.elsohof.com/kamoos

[335] www.en.wikipedia.org/wiki/information

[336] د.ادیب خضور (٢٠٠٠ : ٥).

[337] بڕوانە: د.ادیب خضور (١٩٩٠ : ٧).

[338] د. إبراهيم إمام ( ١٩٩١: ١٠).

(هونەری نوسین، هونەری دەرهێنان، هونەری بەڕێوەبردنی ڕۆژنامە)[٣٣٩]، بە تێڕوانینێکی تر ڕۆژنامەنوسیی دیاردەیەکی ئابوریی کۆمەڵایەتییە لە کۆمەڵدا، هێزێکی سەرەکیشە بۆ پێکهێنانی ڕای گشتیی و لێکگەیشتنی مرۆیی، بۆیە پەیامی ڕۆژنامەنوسیی پەیامێکی گشتگیرانەی ئامانجدارانەیە بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین خەڵك لە دەوری ئامانجە مرۆییە بالاکانی کە لە ناوەڕۆکیاندا هەموو مرۆڤایەتیی بەشدارن[٣٤٠]، (تۆفلەر)یش دەنوسێت: ((زانین ئەو تەوەرەیە کە شەڕەکانی ئایندەو شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکانی لە دەوردا دەخولێنەوەو بنەمای سەرەکیی دیاردەی جیهانگەریشە، ڕۆژنامەنوسییش بەشێکی گرنگ لەم پرۆسەیەدا جێبەجێدەکات کە ئەویش دەستخستنی زانیارییە))[٣٤١]، لە فەرهەنگی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەرییشدا هاتووە: ڕۆژنامەنوسیی بریتییە لەو هێزە کاریگەرەی کارایی خۆی لە هێزی ئەو وشانەوە وەردەگرێت کە لە هۆش و دەرونی خەڵکدا دروستی دەکات، بۆیە ڕۆژنامەنوسیی پیشەو پەیامە نەك تەنها بازرگانییەکی ڕووت[٣٤٢]. وشەی چاپکراو کە خۆی لە ڕۆژنامەدا دەبینێتەوە پرۆسەی ڕۆژنامەنوسیی بەرهەمی دێنێت و لە بایەخدارترین بەکارهێنانەکانی وشەیە، زۆرترین کاریگەرییەك کە پێکدێت، ڕۆژنامەنوسیی و ئەو زمانەی کە بەکاردێت لە ڕۆژنامەنوسییدا دروستیدەکەن[٣٤٣]. ڕۆژنامەنوسیی ئەو هونەرەی پەخشانە کە لە پەخشانی کردارییی جیادەبێتەوەو دەشێت ناوی بنێین پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی، خاوەنی تایبەتمەندییەکە کە بەئاسانیی و ڕونیی و ئاشکرایی واتاکان دەدات بەدەستەوەو هەموو ئاستەکانی کۆمەڵ دەتوانن لێیتێبگەن[٣٤٤]، لەم بارەیەوە دەوترێت: ڕۆژنامە لەگەڵ خەڵکدا دەدوێت، بۆیە بەزمانێك دەنوسرێت کە

---

339 بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة ( ١٩٥٨ أ : ٤).

340 بڕوانە: جۆن ر. بيتنەر (١٩٩٠ : ٣٣).

341 الفين وهايدي تولفر (١٩٩٨ : ١٢٠).

342 بڕوانە: طلعت همام (١٩٨٨ : ٥).

343 بڕوانە:د. محمد حسن عبدالعزيز (بلا : ١٣).

344 بڕوانە:عمر الدسوقي (بلا : ٨٨).

تێگەیشتنی بابەتەکانی لای هەموو خەڵك ئاسان بێت[٣٤٥]، جەماوەریبونی ڕۆژنامەگەریی وا لە پرۆسەی ڕۆژنامەنوسیی دەکات کە بەزمانێك بنوسرێت کە لای جەماوەرەکەی ئاسانو وەرگیراوو واتاداربێت[٣٤٦]. لە ڕۆژنامەنوسییدا ئەرکە بنەڕەتییەکانی زمان وەك: ئەرکی کۆمەڵایەتیی(پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی)، گوزارشتکردن (هەستو سۆزو ڕوانینو ئەزمون)، پەسنکردن (هەواڵو گەیاندنی زانیاریی) جێبەجێدەکرێن[٣٤٧]، ڕۆژنامەنوسیی چەقی پرۆسەی میدیاییە، ئەو پەیامەشی لە ڕۆژنامەنوسیی دەکەوێتەوەو ئاراستەی خەڵك دەکرێت، کرۆکی پرۆسەی ڕۆژنامەنوسییە[٣٤٨]، (( ڕۆژنامەنوسیی چالاکیی هۆشی مرۆیی ئاراستەدەکات))[٣٤٩]، بۆیە ئەگەر لە مێژوی ڕۆژنامەنوسیی بکۆڵینەوە دەتوانین ئاستەکانی گەشەی کۆمەڵایەتیی دیاریبکەین.

ڕۆژنامەنوسیی پرۆسەیەکە وشە دەکاتە بنەماو وێنەی چەسپاوو هێڵو ڕەنگیش وەك ئامڕازی یاریدەدەر بەکاردەبات بۆ پێکهێنانی پەیامەکەی کە ئەمەش لە ئاستی مادییدا پیشەسازییە، لە ڕوی نوسینو بلاوکردنەوەشەوە هونەرە[٣٥٠]. بۆیە پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی، وەك هەر پەخشانێکی ڕۆژنامەگەریی بریتییە لە پێکهێنانی پەیامێکی زمانیی (نوسراو)و گواستنەوەی بۆ وەرگرێکی (خوێنەر)و زامنکردنی پەیوەندیگرتنو ڕاگەیاندن بۆی، لە ڕێی یەکێك یان چەند هونەرێکی ڕۆژنامەنوسییەوە، (فلیپ گایار) ڕۆژنامەوانی فەرەنسایی لە کتێبەکەیدا بەناوی (تەکنیکی ڕۆژنامەنوسیی[٣٥١])ەوە، کۆمەڵێك بنەما بۆ پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی دادەنێت لەوانە:

---

345 د. عبدالستار جواد (١٩٩٩ : ١١).

346 د. عبدالستار جواد (١٩٩٨ : ٨).

347 بڕوانە: د. هادی نهر (٢٠٠٣ : ١٦٤-١٦٥).

348 بڕوانە: د. عبدالعزیز شرف (٢٠٠٠ : ١٨).

349 د. عبدالعزیز شرف (١٩٩١ : ٢٠٩).

350 بڕوانە: د. جان جبران کرم (١٩٩٢ :٢٧).

351 بڕوانە: ئومێد مەسعودی (٢٠٠٥ :١٠).

١. ئامانجی سەرەکیی شێوازی ڕۆژنامەنوسیی زیاتر لە هەر شتێك دەیەوێت ئەو ئامانجە بپێکێت کە خوێندن‌و تێگەیشتن بۆ خوێنەری ئاسایی ئاسان بکات، کەواتە سادەنوسین تایبەتمەندییەکی دیاری پەخشانی ڕۆژنامەنوسییە.
٢. بابەت‌و نوسراوەکان سەرنجڕاکێش‌و شیرین بکات‌و خوێنەر بکاتە شایەتێکی ناڕاستەوخۆی ڕوداوەکان.
٣. نوسینی ڕۆژنامەنوسیی دەشێت تا ئەو جێگەیەی پێی دەکرێت خوێنەر بباتە ناخی ڕوداوەکەوە.
٤. لە ڕۆژنامەنوسییدا دەشێت هەر بابەتێك بەشێوەیەکی تایبەتی بنوسرێت، یان بەهونەرێکی تایبەتیی ڕۆژنامەنوسیی دابڕێژرێت.
٥. ڕاستیی نوسین، واتە ڕۆژنامەنوس چی بینیوە یان هەستی پێکردووە یان بیستویەتی وەکو خۆی پیشانی خوێنەری بدات.
٦. زیندوێتیی شێواز، کە بەهۆی سادەیی‌و سوربون‌و لێبڕان‌و شیکردنەوەوە لە نوسیندا بەرجەستەدەبێت.

پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی، یان ڕۆژنامەنوسیی وەك بەشێکی دیاری پەخشانی کرداریی کە لە ئاوێزانبونی پەخشانی ئەدەبیی یان هونەریی‌و پەخشانی زانستییەوە دێتەکایەوە، زمانێکی بژارکراوی ڕۆژانەی خەڵکی لێدەردەچێت کە دواجار خزمەتێکی گەورە بە بواری فەرهەنگ‌و دەوڵەمەندکردنی زمانی نەتەوەیی هەر نەتەوەیەك دەکات‌و دەبێتە هۆیەك بۆ پێکەوەگرێدانی خەڵك بەیەکەوە،(د. نصرالدين العياضي) دەڵێت: ((پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی ڕایەڵەیەکە لە نێوان پەخشانی ئەدەبیی‌و پەخشانی ئاسایی "زمانی ڕۆژانەی خەڵك"و پەخشانی زانستییدا))[٣٥٢]، بەجۆرێك کە بتوانێت ڕوداوێکی دیاریکراو بەهەمان تێگەیشتنەوە بۆ هەموو خەڵك بگوێزێتەوە، هەر ئەمەشە کەوادەکات ڕۆژنامەنوسیی فاکتەری بنەڕەتیی پێکهێنانی ڕای گشتیی بێت.

[352] www.islamweb.net/ver2/library/ummah-showchapter

کەواتە پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی وا دەخوازێت بەباشی خاڵبەندیی تێدا ڕەچاوبکرێتو لە هەمانکاتدا بە خۆگونجاندن لەگەڵ پێشکەوتنەکانی زمانو زانستی ڕۆژدا، دەستەواژەی نوێ بەکاربەرێت[353]. لەم جۆرە پەخشانەدا ناشیرینترین دیاردەو ڕوداو و کارەساتو تاوانەکان بە زمانێکی شیرینو جوان دەخرێنەڕو، بەجۆرێك کە هەواڵی خراپبونی ئاوەڕۆی شوێنێك لە ڕۆژنامەیەکدا بخوێنینەوە بێئەوەی چەشەو زەوقی خودیمان بشێوێنێت، ئەمەش وەك (مالکۆلم ف. مالێتی) دەڵێت: ((پێویستی بە زیرەکییو توانستی ڕێکخستنو ڕێکوپێککردنی درێژەی بابەتەکانو مەشقکردنو ڕاهێنانو...تاد، هەیە))[354].

زمان گرنگترین ئامرازی ئاڵوگۆڕکردنی بیر و ڕاو سەرنج و زانیاریی و داتاکانەو هۆیەکە بۆ پێکگەیشتن و دواتر بەرجەستەکردنی بازنەی پەیوەندییەکانی پرۆسەی کۆمۆنیکەیشن.

لەڕێی زمانەوە دەتوانین گوزارشت لە خۆمان (وەك زات)، لەدەوروبەرمان(وەك شوێن)، لە ساتەکانی ژیانمان(وەك کات)بکەین و ڕایەڵەیەکە کە من یان(ئێمە) بەتۆ و ئەو ، من یان(ئێمە) بە ئێوەو ئەوانەوە دەبەستێتەوە و بناغەی پێکهاتنی کۆمەڵگاکان دادەمەزرێنێت، بەتایبەتیش ئەو جۆرە لە کۆمەڵگا کە لە ئەمڕۆدا بە (کۆمەڵگای زانینگەرایی) ناودەبرێت.

ئینجا ئەگەر (زمان) بۆ هەربوارێکی مرۆیی گرنگبێت، ئەوا بۆ ڕۆژنامەنوسیی گرنگترین فاکتەری پرۆسەی بەکۆگەیاندن(Mass Communication)دەبێت، بەوەی کە لە ڕێی یەکێك لە کەناڵەکانی دەربڕینەوە(زمانی ئاخاوتن بێت یان زمانی نووسین)وێنای تەواوی ئەو بزاوت و ڕوداوانەمان بۆ دەکات کە لە دورو نزیکمانەوە ڕوودەدەن.

ئەرکی سەرەکیی ڕۆژنامەنوسیی گۆڕینی دیمەن و وێنەبینراوەکانە بە وشە و زاراوەکان و، چنین و ڕێکخستنی ئەو وشەو زاراوانەیشە لە فرێز و ڕستەی

---

[353] بڕوانە: ئومێد مەسعودی (٢٠٠٥ :٥٨).

[354] Malcolm F. Mallette (1998: 11).

واتاداری وەهادا کە لە توانایاندا هەبێت هەمان دیمەن و وێنەی بینراو(لای نێرەر-Sender)لە بیرو زەینی (وەرگر-Receiver)دا، دروستبکەنەوە، وەك لەم هێڵكارییەدا دەردەكەوێت:

ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە پەیامنێر یان نووسەری ڕۆژنامەوانیی دەبێت خاوەنی خەرمانێکی دەوڵەمەندی وشەو زاراوەکان بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو بزاوت و دیمەن و وێنانە بگۆڕێت و بگوازێتەوەو گوزارشتیان لێبکات وەك ئەوەی کەهەن، نەك وەك ئەوەی خۆی دەیخوازێت.

(جەمیز ج. کیلپاتریك) لە بۆڵتنی کۆمەڵەی ئەمریکیی بۆ سەرنوسەری ڕۆژنامەکان، دەڵێت: ((ئەگەر مرۆڤ بیەوێت باش بنوسێت ئەوا پێویستە کەشکۆڵێکی فرەڕەهەند دروستبکات، واتە پێویستە کە وشەکانو فریزەکانو

وێنەکان، ڕەنگەکان، بۆنەکان، دەنگەکان و جوڵەو ڕایەڵ و چنراوەکان کۆبکاتەوە، پێویستە تێڕوانینێکی تیژی هەبێت لە ئاست شتە بێبەهاکاندا، وەك: تایەیەکی فش، گلۆپێکی سوتاو، قەیتانێکی پچڕاو، دەفتەری تێبینییەکان، یان ئەو ساتانەی مرۆڤ تیایاندا شپرزەدەبێت...، ئێمە هەموو پارو پارچەکان هەڵدەگرین، چونکە دەشێت ئەوە بزانین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆ بابەتێك سودیان لێوەردەگرینەوە))[٣٥٥].

پەیام لە پرۆسەی ماسکۆمۆنیکەیشندا بەگشتیی و لە ڕۆژنامەنوسییدا بەتایبەتیی لەگەڵ ساکاریی و سادەیی دەربڕینەکاندا، سەختترین و قورسترین جۆری پەیامە نێردراوەکانە[٣٥٦]، بەوەی دەبێت لە ناوەڕۆکیدا هەڵگری یەك واتا بێت و لە فۆڕمدا شیاوو ڕازاوەبێت و نامەیەك بێت بۆ کەسانێکی نەناسراو بە جۆرێك وا لەو کەسانە بکات بە تەوسەوە ئەو پەیامە وەربگرن، تەنها پەیامێك بۆ ژمارەیەکی زۆر (دیاریکراو) یان وەك ماسمیدیا( دیارینەکراو لە وەرگر)دەنێررێت و دەبێت کاریگەریی و پەیوەندیی و وابەستەێتیی لە نێوان ئەم جەمسەرانەدا هەبێت:

- (نێرەر ) وەك تاك، یان کۆ(گرۆپ)..........(دیاریکراو).
- (پەیام) ..........(دیارکراو).
- (وەرگر) دیاریکراو لە ڕوی قەبارەوە نەك پێکهاتەوە، یان لە زۆر باردا دیارینەکراو............(دیارینەکراو بە تایبەتی لە ماسمیدیادا).

ناردنی نامەیەك بۆ تەنها کەسێکی نەناسراوو دیارینەکراو لە ڕوی پێکهاتەزانیارییەکانی وەك(ناسنامە، تەمەن، ڕەگەز، نەتەوە، ئایین، مەزهەب، شوێنی نیشتەجێبوون، ئاستی خوێندن، ڕۆشنبیریی، دەرامەت و باری ئابووریی و...هتد)ەوە، کارێکی سەخت و دژوارە، بەتایبەتیی ئەو دیارینەکراوییە دەبێتە مایەی ئەوەی نەزانرێت لە کەیداو لە کوێدا و بەکوێدا و بەچیدا و چۆن و بە چ ئامڕازێك(وتن، نامە، نامەی ئەلکترۆنیی، هەواڵناردن،...)پەیامەکەی بۆ ڕەوانە

---

[355] مالکوڵم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ٢٢).

[356] بڕوانە: د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :٢٩).

بکرێت و کاریکاتە سەر ئاست و جۆری کاریگەرییەکان، ئەوا ئەم پرۆسەیە لە ماسمیدیادا هێجگار سەختتردەبێت، لەبەرئەوەی هەموو ئەم فاکتەرانە نادیارو نەزانراودەبن.

کەواتە ئەو نامەیەی بۆ پەیامی ڕۆژنامەنوسیی ئامادەدەکرێت دەخوازێت بابەتییانە بێت و بە زمانێکی ئاسان و ڕەوان و سادەو ساکار دابڕێژرێت[٣٥٧]، لێرەوە دێینە سەر تایبەتمەندییەکانی ئەو زمانەی بۆ نووسینی مەبەستەکانی پەیامی ڕۆژنامەنوسیی دیاریدەکرێن و لە ئاستی گوزارشتکردنی کرداریی دەکەوێتەوە، کە یەکێك لە سێ ئاستەکەی گوزارشتکردن پێکدەهێنێت، بەڵام ئەوەی بایەخی ڕۆژنامەنوسیی زیاتردەکات ئەوەیە کە دوو ئاستەکەی تریش بەکاردەبات و مامەڵەی ڕاستەوخۆو بزواوانەیان لەگەڵدا دەکات، چونکە نوسینی ڕۆژنامەنوسیی تەنها بریتی نییە لە پەیامێکی بەپەخشان نوسراوی بێناوەڕۆك، بەڵکو وابەستەی زانینە قوڵەکان و ئەزمونە بەهادارەکانەو ئاشنایەتییە لەگەڵ زانستەکانی سایکۆلۆژیاو سیاسەت و ئابوریی و ڕۆشنبیریی و سۆسیۆلۆژیا و فەلسەفەو مێژوو جوگرافیا و ئەدەب و زمان و ڕەفتارو هونەرو زانستەپەتییەکانی ترو...تاد[٣٥٨]، ئەم ئاستانەیش بریتین لە:

١. ئاستی چێژئامێزی هونەریی و جوانکاریی، کەلە ئەدەب و هونەردا بەکاردەبرێت، بیرو ڕاو سەرنجی کەسیی زاڵە بەسەر بیری سەرەکیی بابەتەکاندا، هونەرە ڕەوانبێژیی و جوانکارییەکان و گواستنەوەی وێنە بۆ واتای دی بەکاردەبرێن و لایەنی سۆز و ئەندێشەی فراوان ڕۆڵی گەورەی تیادەبینن.
٢. ئاستی زانستیی تیۆریی ڕوتکراوەیی کەلە زانست و لێکۆڵینەوە و بابەتە زانستییەکاندا بەکاردەهێنرێت، زاراوەکان هەڵگری واتایەکی دیاریکراون و (زانین و زانیاریی) و لۆژیك زاڵە بەسەر بابەتەکاندا و دورن لەهەموو

[357] بڕوانە: د. عبدالعزيز شرف (١٩٩١ : ١٧١).

[358] بڕوانە: د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :٦٩).

ئەندێشە و سۆزێك ، بەپێی پێوەرو پەیڕەوو یاساو ڕێساو دەستور کاردەکەن.

٣. ئاستی کرداریی کۆمەڵایەتیی ئاسایی، کە لە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەرییدا بەکاردەهێنرێت، تێکەڵاوێکە لەنێوان لایەنی زاتیی و بابەتییدا(زات دەخرێتە ژێر ڕکێڤی بابەتەوە)و بەپێی جۆری ژانر یان مۆدێلی بەکارهێنراو لە داڕشتنی بابەتەکەدا(ڕاو زانیاریی، یان بەجیا یان بەتێکەڵ) بەکاردەبات، لە زۆربەی بارەکاندا گوزارشت لە ڕوداو و شتەکان دەکات وەك ئەوەی کەهەن و زۆررترین خەڵك لە گوزارشتلێکردنەکانیان تێدەگەن، سۆز ئاوێزانی لۆژیکێکی کۆمەڵایەتیی دەکرێت و بە پێی تیۆری ڕاگەیاندنی کارپێکراو یان جۆری ڕاگەیاندن دەخرێتەگەڕ.

ئەگەر توانرا ئەم سێ ئاستە لەیەکتر نزیکبکرێنەوە ئەوا هێمایەکی دیاری گەشەسەندنی ئەو کۆمەڵگایە دەبێت کە دەتوانێت تا ئاستێکی دیار تێگەیشتن ئاسانبکات، دورکەوتنەوەی ئەم ئاستانەش لەیەکتر ، ئاستەنگ لەبەردەم لێکدانەوە و تێگەیشتنی گشتییدا دروستدەکات و هەریەکێك لەو بەرهەمانەی کەلە هەرئاستێکیانەوە سەرچاوەدەگرن دەکاتە بابەتێك بۆ دەستەبژێرێکی دیاریکراوی ناوکۆمەڵ نەك هەموویان، بۆیە میدیای نوێ دەخوازێت هێندەی بتوانێت کارئاسانیی لەم پێناوەدا بکات و لەیەکیان نزیکبکاتەوە تا پەیامی ماسمیدیا بتوانێت بگاتە هەموو کەسێك و هەموو شوێنێك.

هەر بابەتێك لای دەزگای نێرەر بەتۆنێك دەنووسرێت بەڵام لای وەرگر مەرج نییە بەهەمان تۆنی خۆی وەربگیرێت، چونکە لای وەرگر (مۆد یان مۆدێلی وەرگرتن هەیە)کە بەپێی سەرنج و تێڕوانینی خۆی لێکیدەداتەوە (ئەگەر پەیامەکە وا ئامادەکرابێت کە لێکدانەوەیەك زیاتر هەڵبگرێت)، چەندە بتوانرێت دیمەن و واتای پەیامی نێرەر وەکو خۆی لای وەرگر وەربگیرێت ئەوەندە پەیامەکە

کاریگەرترو کاراتر دەبێت و کەناڵ دەتوانێت کاربکاتە سەر وەرگر، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەوەنەکرا کەناڵ تەنها دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ زانیاریی وەرگیراو کەمەرج نییە هەمان بەهاو هێزو کاریگەریی لای وەرگر هەبێت.
(ڤلادیمیر سیمسۆنۆڤ)یش دەڵێت: (( ڕۆژنامەوسیی خۆی لە خۆیدا بریتییە لە دیاردەیەکی ئاڵۆزو هەمەلایەن‌و چەند پەیوەندییەکی دەرەکیی‌و ناوەکیی پێکەوە گرێدراوە))[359]، هەر ئەمەشە وادەکات لێکدانەوەیەکی دیاریکراو هەڵنەگرێت‌و فرە ڕەهەندانەش لێکبدرێتەوە. ((ڕۆژنامەنوسیی کەدواتر ڕۆژنامەگەریی بەرهەمدەهێنێت، بەسەرخانێکی بایەخداردەزانرێت کە توانستی گوزارشتکردنی ڕاستەقینانەی لە ژێرخانی مرۆیی هەیە))[360]، پەیوەندیی تاکی ڕۆژنامەنوسیش بەکۆی خەڵکەوە، لەڕێی پەیامە ڕۆژنامەنوسییەکەیەوە بەرجەستەدەبێت، بۆیە دەشێت پەیوەندیی ئۆرگانیی لە نێوان نێرەرو وەرگردا هەبێت بەجۆرێك کە ئەم دوو پۆڵە بتوانن پەیامی پرۆسەگەلێکی وەها بەیەك ببەخشن، وەك (جۆرج دی گۆپن) دەڵێت: ((ئەگەر خوێنەر مەحکوم بێت بەوەی لە مەبەستەکانی نوسەر تێبگات، ئەوا نوسەریش مەحکومە بەوەی پێداویستییەکانی خوێنەر بزانێت‌و لە خواستەکانی تێبگات))[361].

---

[359] ڤلادیمیر سیمسۆنۆڤ ( ٢٠٠٣ : ٧٩).

[360] د. سامي ذبیان (١٩٨٧ : ١٣).

[361] George D. Gopen (1987 : 1178).

## ٢/٢) چەشنە ڕۆژنامەنوسییەکان

وەك چۆن لە بواری ئەدەبدا چەشنە ئەدەبییەکان هەن، بەهەمان شێوەش لە بواری ڕۆژنامەنوسییدا چەشنە ڕۆژنامەنوسییەکان هەن، چەشنە ڕۆژنامەنوسییەکان بەو قاڵبە گشتییە هونەرییانەی ڕۆژنامەنوسیی دەوترێن کە جیاوازییان لەگەڵ یەکتردا هەیەو هەریەکەیان خاوەنی تایبەتمەنیی خۆیانن[٣٦٢]، هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکان ئەو مۆدێلانەن کە ڕوداوو زانیارییە دەستکەوتوو ڕوماڵکراوەکانیان پێ دادەڕێژرێت، جیاوازی هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکان لەگەڵ خودی ڕۆژنامەنوسییدا ئەوەیە کە هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکان ئەو فۆڕمانەن کە بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکانیان پێدەنوسرێت‌و هەریەك لەم هونەرانە بۆخۆیان سەربەخۆن، بەڵام ڕۆژنامەنوسیی پرۆسەی نوسینەوەو بڵاوکردنەوەی بەشێك لەم هونەرانەن لە ڕۆژنامەیەکی دیاریکراودا، کە لە ڕێیانەوە بابەتەکان دەخرێنە ڕوو بڵاودەکرێنەوە، هەر وەك چۆن ڕۆژنامەنوسیی پرۆسەی نوسینی پێوەربەندییانەی هەریەك لەم هونەرانەش لە بنیاتی هەریەکەیاندا دەگرێتەخۆ[٣٦٣]، ئەم جیاکارییە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ نوسەرو سەردەمەکانیان، یان تەنها بۆ زمانی بەکارهاتوو شوێنی بڵاوبونەوەیان، بەڵکو لەگەڵ ئەمانەشدا دەگەڕێتەوە بۆ ژینگە هونەرییەکان‌و ئەو پێداویستییانەی کە شێوازبەندیی دەبەخشنە چەشنێکی ڕۆژنامەنوسیی، ئەم چەشنانە (( لەگەڵ گەشەو بەکارهێنان‌و وابەستەییان بە پەیوەندیی نێوان نێرەرو پەیام‌و ئامرازو وەرگرەوە، دەگۆڕێن))[٣٦٤]، بەجۆرێك کە دەشێت چەشنە بنەڕەتییەکان بەڕێژەی جیاجیا تێکەڵی یەکتر بن، هەروەك چۆن ئەو تێکەڵاوبوونە بۆ تێکەڵاوبونی هونەرەکانیشیان ڕاست دەوەستێتەوە، بەڵام ئەم تێکەڵاوبونە ژانرێکی نوێ بەرهەمدەهێنێت، یان لە ژانرێکیاندا کە هەڵگری بنەماکانی ئەو ژانرە بێت دەمێنێتەوە.

---

[362] بڕوانە: د. عبدالعزیز شرف (١٩٨٩ : ٣٠٨).

[363] بڕوانە: د. إبراهیم إمام ( ١٩٩١: ١١).

[364] د. کاظم معتمد نژاد (٢٠٠٤ : ٣).

بەگشتیی لە ڕۆژنامەنوسییدا (زمان) باڵادەستیی هەیەو پرۆسەی نوسین پرۆسەیەکە کە لێیەوە بەپێی ئاوێزانبونی کەسی نێرەرو لایەنە خودییو بابەتییەکانی چەشنەکان دیاریدەکرێت. لێرەوە چەشنە ڕۆژنامەنوسییەکان لەسەر بنەمای فۆرمو ناوەڕۆكو شێوازبەندیی نوسین دابەشدەبن بۆ:

١. چەشنە خودییەکان.

٢. چەشنە بابەتییەکان.

(د. مەحمود فەهمی) لای وایە ڕۆژنامەنوسیی پرۆسەیەکی تەواوکارییانەیە، بۆیە لەلایەك زانستێکی بابەتانەیەو لەلای دووەمیشدا هونەرێکی خودییانەیە[٣٦٥]، ئەوەی هاوبەشیی نێوان هەموو چەشنە ڕۆژنامەنوسییەکان پێکدەهێنێت، بەپلەی یەکەم واقیعییەتبونو ڕاستەقینەیی ڕوداوەکانە، بەڵام هەر چەشنێك بەجۆرێك مامەڵە لەگەڵ ئەم واقیعییەتەدا دەکات، یان بە تێڕوانینی خودییانە، یان بابەتییانە، یان بە تێکەڵاوکردنی هەردووکیان بەجۆرێك کە دواجار لەسەر چەشنێکیان دەگیرسێتەوە. هەندێك سەرچاوەی تریش لە سەر بنەمای گوزارشتکردنی ڕۆژنامەنوسیی چەشنەکان دابەشدەکەن بۆ[٣٦٦]:

١. گوزارشتکردنی هەواڵییانە.

٢. نوسینی شیکردنەوەی ڕاڤەکارییانە.

بەڵام ئەم دابەشکردنە لەگەڵ ئەو ئامانجانەدا نایەتەوە کە دەخوازن لە ڕوانگەی تاکڕوانینو گشتڕوانینەوە، لە لایەنی ئامادەیی دیاری خودو بابەتیبونەوە جیاکاریی لە نێوان هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکاندا بکەن.

---

[365] بڕوانە: د. محمود فهمي (١٩٦٤ : ١٨).

[366] بڕوانە: د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :١١٣-١٨٧).

## ٣/٢) چەشنە خودییەکان

ئەم چەشنە لە پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی، ماکی خۆی لە پەخشانی ئەدەبیی و هونەرییەوە وەرگرتووە، هەموو ئەو هونەرە ڕۆژنامەنوسییانە دەگرێتەخۆی کە تەوەری سەرەکییان (تاکی نوسەر)و بنیاتی بنەڕەتییان (خودڕوانین)ە، لەگەڵ بڕێکی دیاریکراو لە زانیاریی و لە قسەی ڕۆژانەی خەڵك، بابەتەکان زاتییانە دەنوسرێن.

"خود" لە زمانی ئینگلیزییدا "Subject"ی پێدەوترێت، کەلەهەمان بنچینەی وشەی "Object"ەوە هاتووە، بەڵام لە بر"ob" بڕگەی "sub"ی بۆ دانراوە، بەواتای لەژێر یان لەگەڵ، خودیی ڕێژە لە خود وەردەگرێت، بەو واتایەی خود بریتییە لە ناوەڕۆك و ناسنامەو کەسێتییەکەی و گوزارشتکەریشە لە هەر هەست و بیرکردنەوەیەك[٣٦٧].

خودێتیی بەواتای تاکگەرایی، واتە هەر شتێك کە پەیوەندو تایبەتە بەکەسێکەوە (یەك کەس)، کەواتە کە دەوترێت بیرکردنەوەیەکی خودییە بەو مانایە دێت کە بنەماو لێکدانەوە و حوکمدانەکان لەسەر بنەمای هەست و ئارەزوی کەسێك بنیاتنراون[٣٦٨]، گەر ئاشکراتر بڵێین سەرچاوەی خودێتیی بیری تاکەکەسە[٣٦٩]، نەك واقیع. کەواتە لە خودگەرییدا کاتێك جیاکاریی لە نێوان ڕاستەقینەو وەهمدا دەکرێت، لەسەر ئیعتیباراتی خودیی دەکرێت و پشت بە ڕاستەقینەیەکی ڕەها نابەسترێت، چەشنە خودییەکان لە ڕۆژنامەنوسییدا ئەو هونەرانەن کە لێیانەوە ڕۆژنامەوان وەك ئەوەی دەیخوازێت ڕومالی واقیع دەکات، نەك وەك ئەو ڕاستەقینەیەی کە واقیع خۆی هەیەتی.

تایبەتمەندییەکانی ئەم هونەرانە لەم خاڵانەدا کۆدەکەینەوە:

---

[367] بڕوانە: د. عبدالوهاب الميسري (www.islamonline.net/ilo-arabic/dowalia/mafaheem-4).

[368] بڕوانە: ام الزين بنشيخة–المسكيني(www.enashir.com/blogs/tarik/8694).

[369] بڕوانە: (www.philo.most4host.com/dor.php).

١. نوسەر خۆی بۆخۆی بابەتگەلێك بۆ لەسەر نوسینیان هەڵدەبژێرێتو هەر خۆیشی ئەو هونەرە دیاریدەکات کە دەیەوێت لە ڕێگەیەوە بابەتێکی ڕۆژنامەنوسیی بنوسێت.

٢. ئاراستەی بابەتەکان لە ناوەوەی نوسەرەوە بۆ دەرەوە (بۆ خەڵك) دەڕواتو بینینی بابەتەکانە بە چاوی خودی نوسەر و داڕشتنیانە بەجۆرێك کە بابەخگەلی نوسەر ببێتە بایەخی هەموو خەڵك. نوسەری ئەم چەشنە نوسینە لە خودی خۆیەوە بەرەو بابەتو بەرەو دنیابینی دەرەوەی خۆی دەڕوات، پرۆسەیەکە لە تاکەوە بۆ گشتو لێکدانەوەکانی بارگاوین بەتێڕوانینە کەسییەکانی خودی نوسەر.

٣. لەم چەشنەدا ڕاکان زاڵن بەسەر زانیارییەکاندا، بەتایبەتیش ئەو زانیارییانەی کە دەبنە زانست، باکگراوندی زانیاریی نوسەر چاوگی بنەڕەتیی نوسینەکانیەتی و ڕۆڵی گەورە لە گەلاڵەبونیاندا دەبینێت.

٤. سۆزو ئەندێشە لە بنەما دیارەکانی ئەم چەشنەن، نوسەر هەوڵدەدات سۆزی وەرگر بوروژێنێتو ئەندێشەیەکی کراوەی لە مەبەستە دیاریکراوەکانی خۆی بۆ دروستبکات.

٥. نوسەر لەم بابەتانەدا وا خۆی دەنوێنێت کە لە وەرگر زیاتر دەزانێتو لە زۆربارادا شێوازێکی ئامۆژگاریکردنو ڕێنوێنیکردنو پەروەردەکردن دەگرێتە خۆی، نوسەر بڕیاری خۆی لەسەر ڕەوشو ڕەتو ئەنجامەکان دەدات.

٦. هونەرەکانی ئەم چەشنە زۆر وابەستەی تافی نوسینوکاتی ڕوداو نابنو زۆرجار دەکەونە دوای ڕوداوەکانەوە.

٧. نوسەر ئامادەیی لە نوسینەکەدا هەیە، لانی کەم ناوەکەی لەسەر بابەتەکەی تۆمارە، ئەمەش وادەکات کە لەڕوی سیاسەتی کەناڵەوە بەرپرسیارێتیی بەپلەی یەکەم بۆ خودی نوسەر بگەڕێتەوەو بە ڕای تاکەکەسییش تەماشابکرێت.

٨. بەپێزیی و ئاستی نوسین و گوزارشت و لایەنە ڕێزمانییەکانی ئەم بابەتانە وابەستەی کارامەیی کەسیی و توانستی خودیی دەبن و لەزۆربارد بەرجەستەبوی ستایلی خودی ئەو نوسەرەدەبن کە دەیاننوسێت.

٩. نوسەر دەیەوێت گوزارشتکەربێت لە بیرو بابەتەکانی نەست و بەهانەو یاساو پەیڕەوو دەستوریان لەناو کۆمەڵدا بۆ دەدۆزێتەوە تا لە تایبەتەوە بینکات بەباو، لە نەرێوە بیانکاتە ئەریّ و بە پێچەوانەشەوە.

١٠. مەبەستی سەرەکیی ئەم چەشنە دروستکردنی کاریگەریی یەك ئاراستەیە لەسەر وەرگر، بەردەوام کەسێك لەپشت بابەتەکەوە دەدوێت کە لە لێکدانەوەی خۆیەوە وەڵامگەلی بۆ پرسیارو پرسەکانی زاتی خۆی ئامادەکردووە، نەك لە پرسیارو پرسەکانی خەڵکەوە.

١١. نوسەر دەیەوێت بابەتەکەی وەك داهێنانێکی هونەریی بخاتەڕو بۆیە هەموو توانستەکانی خۆی لە جوانکردن و ڕازاندنەوەو گونجاندنی بابەتەکەیدا دەخاتەگەڕ.

١٢. نوسەر خۆی بۆخۆی جۆری پەیوەندیی لە نێوان بابەتێك و بابەتێکدا، یان ڕوداوێك و ڕوداوێکدا دروستدەکات و دەتوانێت لێکدانەوە بۆ ڕوداوە چاوەڕوانکراو، یان ڕونەداوەکانیش بکات و لە ئایندەی پەیوەندیی و کارلێك و گۆڕان و ڕوداوەکان بدوێت، چونکە دواجار دەچێتە خانەی لێکدانەوەی کەسییەوە کە وەك سەرچاوەی بەهێز لە میدیاکاندا تەماشاناکرێت.

١٣. نوسەر مەرج نییە لەگەڵ هەبونی ڕوداودا بابەتی هەبێت، مەزاج و ئارەزوو پسپۆڕیی و ئاگایی و خواستی خۆی لە دیاریکردن و نوسینی بابەتدا ڕۆڵدەبینن.

هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانی ئەم چەشنە بریتی دەبن لە:

## ١. وتار (Essay)

نوسینی بابەتێکە کە گوزارشتی ڕاستەوخۆ لە ڕای نوسەرەکەی دەکات، تیایدا نوسەر دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو دەدوێت‌و هەوڵدەدات لێکدانەوەو بەڵگەو شایەت‌و شیکردنەوەگەلێکی وەها لە تێڕوانینی خۆیەوە بێنێتەوە، کە بڕوا لای خوێنەر دروستبکات[370]. لەم هونەرەدا ((کەمتر پەیڕەوی بابەتیبوون دەکرێت‌و زیاتر پابەندبوونە بە لایەنی کەسییەوە))[371]، هەندێك سەرچاوە وتار دەبەنەوە سەر شێوەنوسینی ڕۆژنامەنوسیی "شیکاریی ڕاڤەکاریی"و بە گرنگترین جۆرەکانی ئەم شێوە نزسینەی دادەنێن[372].

ئامانجی وتار ڕاڤەکردن‌و هەڵسەنگاندن‌و بڕیاردان‌و پێشنبینیکردن‌و ئاماژەدان‌و ڕونکردنەوەی دیاردەو ڕوداوەکانە بەشێوەی بەهانە هێنانەوەو بەڵگەو سەلماندنگەلێك کە زۆربەیان لە توانست‌و پێشخانی زانیاریی کەسیی نوسەرو بڕواو ئایدۆلۆژیاو بیری ئەوەوە سەرچاوەدەگرن، هونەرێکە دەتوانێت لە هونەرەکانی تر زیاتر بڕوا لای خوێنەر دروستبکات، چونکە بەپێی کارامەیی وتارنوسەکە وەڵامی بڕوابەخش بۆ ئەو پرسیارانە دەخاتەڕو کە لای خوێنەرەوە سەرچاوەدەگرن، ((وتارنوس دەیەوێت هۆشمەندانە لەگەڵ هۆشی خوێنەردا بدوێت، بۆئەوەی خوێنەر ئەو هەستەی لابخەملێت کە ئەمە ڕاستەقینەیەو، تەنها بزواندنی سۆزو ئەندێشەکانی نین))[373]. ئەرکێکی سەرەکیی وتار، خستنەڕوو لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی ڕوداوەکانە، ئەو ڕوداوانەی کە هەواڵ ناتوانێت هەموو پێکهاتەو ڕوکارو لایەنەکانیان بخاتەڕو، وتارنوس دێت‌و لەسەر بنیاتی هەواڵەکان

---

[370] بڕوانە: د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٣٣٨).

[371] د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ٢١٧).

[372] بڕوانە: د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :١٨٧).

[373] سەرچاوەی پێشوو (١٨٩).

پایەکانی بەتوانستی ئەندازیارانەی خۆی دادەمەزرێنێت. ((وتاری ڕۆژنامەنوسیی، پێشەکی و ڕێنمونیی و ئەنجامی هەیە، درێژەی ڕوداوێکی گەورەو سەرەکیی دەخاتەڕو، لەشێوەی هەرەمێکی ئاسایی یان لاکێشەدا دادەڕێژرێت، مەبەست لێی ڕادەربڕینە نەك دەستپێشخەریی ڕۆژنامەنوسیی))[٣٧٤]، ئینگلیزەکان زاراوەی (Essay)ی بۆ وتار بەکاردێنن کە بەمانای هەوڵدان دێت، واتە شتێکی تەواوو کامڵ نییەو وابەستەی خوێنەرە کە دوای خوێندنەوەی لایەنە ناتەواوەکانی تەواوبکات، لە فەرهەنگی (لاروسی)شدا هاتووە: ((وتار ناوی نوسراوگەلێکە کە خاوەنەکەی زۆر ڕۆناچێتە ناو بابەتەکەوەو زۆریش وردیناکاتەوە، وشەی وتاریش بەمانای هەوڵدان، یان ئەزمون، یان پراکتیزەکردنێکی بەرایی دێت))[٣٧٥]، وتار تەنها باسکردنی ڕوداوێکی قەوماو نییە، بەڵکو زۆرجار وتارنوس لە تێڕوانینی خۆیەوەو بە درکی ڕۆژنامەنوسییانەی خۆی بیرێکی نوێ، یان وێناو تێڕوانینێکی نوێ دەخاتەڕو کە خۆی لەخۆیدا جێی بایەخی ڕای گشتییە[٣٧٦]، لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردیشدا هاتووە : ((وتار پەخشانێکی نوسراوە درێژییەکی مام ناوەندیی هەیەو لە بابەتێکی دیاریکراو دەدوێت))[٣٧٧]، (د.عبداللطیف حمزة)یش دەنوسێت: (( وتار بیرۆکەیەکە لەو بیرۆکانەی وتارنوس یان نوسەری ڕۆژنامەنوسیی لە ژینگەو دەوروبەرییەوە دەستی دەخات و هەر کاتێك بیرۆکەیەکیان کاری لە نوسەرەکە کرد، ئەوە لە دەرونیدا دەخەمڵێت کە پێویستە لەسەری بنوسێت))[٣٧٨]، یان دەوترێت: ((وتاری ڕۆژنامەنوسیی وابەستەی ڕوداوە هەنوکەییەکان و گیروگرفت و کێشە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابورییەکانەو لە ڕێی ڕاڤەکردن و باسکردنیانەوە، بە شێوەیەکی جوان و سادەو ساکار دەنوسرێت بۆ ئەوەی

---

[374] هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ :٦٨).

[375] د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨أ : ١٦٧).

[376] بڕوانە: د. فاروق أبو زید (١٩٨٣ : ١٧٩).

[377] د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨أ : ١٦٧).

[378] د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨ب : ١٢).

بەخێرایی بگاتە خوێنەر))[٣٧٩]. کەواتە ئەوەی وتار وەك هونەرێك دەناسێنێت، فۆرمو شێوازەکەیەتی نەك ناوەڕۆکەکەی، بۆیە ئەو دابەشکردنانەی لەسەر بنەمای مەبەست یان ناوەڕۆکی وتار دەکرێن، ڕاست نایەنەوە، چونکە دەشێت وتار لەسەر هەر بوارو بابەتێك بنوسرێت، لە بابەتە هونەرییەکانەوە تا زانستەپەتییەکان، لە ئەندێشەی پەتییەوە تا ڕاستەقینە.

لێرەوە سێ بنەمای گرنگ ڕۆڵ لە نوسینی وتاردا دەبینن، کە بریتین لە: ((سیاسەتی ڕۆژنامەکە، چۆنێتیی داڕشتنی وتارەکە، بایەخەکانی خوێنەر))[٣٨٠].

دواجار وتاری ڕۆژنامەنوسیی ئەو نوسراوەیە کە ڕۆژنامە بڵاویدەکاتەوە بۆ ڕوماڵکردنی پرسیار یان بایەخگەلێکی وەها کە وابەستەی هەنوکەیی ڕوداو یان کێشەکان یان دۆزە زیندووەکانی پەیوەست بە خوێنەرن، ئیدی پەیوەستگەلێکی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ، هەروەها پیشاندانێکی ڕەوتی ژیانی خەڵکەو خستنەڕوی ئەو شتانەشە کە دەشێت لە ئایندەدا لە ژیانیاندا ڕوبدەن[٣٨١].

بەگشتیی وتار بۆ ئەم جۆرانە دابەشدەبێتو ((بەگشتیی وتارەکانی ڕۆژنامەیەك گوزارشتکەردەبن لە سیاسەتی ڕۆژنامەکەیانو، هەڵوێستگەلی نوسەرەکانیان دەبن بەرامبەر بەڕوداوەکانی ڕۆژو ئەو بابەتانەی کە بیری خەڵکیان خەریك کردووە))[٣٨٢]، هەر جۆرێکیشیان کە بە ناوازەو پشتبەستن بە ڕاستەقینە بنوسرێت، ئەوا هەرچەندە تاکەکەس دەیاننوسێت، بەڵام بە وتارێکی بابەتیی ناو دیدێکی خودیی دەژمێررێت[٣٨٣]:

---

[379] د. محمد عبدالحكيم محمد (١٩٩٩ : ١٠٧).

[380] د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٨ أ : ٢١٧).

[381] بڕوانە: د. إسماعيل إبراهيم (٢٠٠١ : ٢٦).

[382] د. فاروق أبو زيد (١٩٨٣ : ١٧٩).

[383] بڕوانە: د. قيس الياسري و آخرون ( ١٩٩١ : ٦٢).

* سەروتار لە زمانە لاتینییەکاندا بە چەند شێوەیەك دێت وەك : Editorial, Leader.

١. سەروتار (Editorial Article)* : (( یەکەم وتارو سەرەکیترین وتاری ڕۆژنامەیە))[٣٨٤]، لە ڕۆژنامە لاتینییەکاندا لە ستونی یەکەمی لای چەپی ڕۆژنامەدا دەنوسرێتو لای ئێمەش لەلای ڕاستدا دەنوسرێت، گوزارشت لە ڕاو بۆچونی ئەو ڕۆژنامەیە دەکات کە بڵاویدەکاتەوە، یان ئەو لایەنەی لەپشت ڕۆژنامەکەوەیە ئەگەر ڕۆژنامەکە ئۆرگانی ئەو لایەنە بوو، کەواتە ((دەرخەری هەڵویستەکانی ڕۆژنامەکەیە بەرامبەر ڕوداوو دۆزە هەنوکەییەکان))[٣٨٥]، ئەم وتارە ناوی کەسی لەسەر نانوسرێتو بەگشتیی سەرنوسەر دەینوسێت یان نوسەرێك کە سەرنوسەر ڕایدەسپێرێت بەناوی ڕۆژنامەکەوە بینوسێت، لە ڕوی بایەخی سەروتارو هەستیاریی بابەتو نوسینیەوە،(ڕای تیل) ڕۆژنامەوانی ئەمریکایی دەڵێت: (( پێش ئەوەی سەرت سپی بێت، بیر لە نوسینی هیچ سەروتارێك، لە هیچ ڕۆژنامەیەکدا مەکەرەوە))[٣٨٦] بنەما سەرەکییەکانی بریتین لە: ((شیکردنەوە، ڕاڤەکردن، پشتبەستن بە بەڵگەی گونجاو لە هەندێك کاتداو بە جوڵاندنی هەستو سۆز لە هەندێك کاتی تردا، بۆ گەیشتن بەمەبەستی سەرەکیی کە قەناعەتپێکردنی خوێنەرە))[٣٨٧]، سەروتار، ماهیەتو کەسێتیی تایبەت دەدات بە ڕۆژنامە، شێوەو ناوەڕۆکی جودایە لەو هەواڵانەی بڵاودەکرێنەوە ...، ئەوەی وادەکات سەروتار جیاوازبێت بریتییە لە "ڕا"، ئەوە شتێکی گرنگە کە نەهێڵرێت هەواڵ جێی ڕای سەروتار بگرێتەوە، سەروتار چەندە لە نیشتمانەوە نزیك بێت ئەوەندە زیاتر کاریگەریی دەبێتو بەرپرسیارێتیی ڕۆژنامەکەش زیاتر دەکات[٣٨٨].

---

[384] د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٣٢٦).

[385] د. فاروق أبو زید (١٩٨٣ : ١٨٢).

[386] د. قیس الیاسري و آخرون ( ١٩٩١ : ٦١).

[387] هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ : ٦٨).

[388] Malcolm F. Mallette (1998: 69).

زۆرجار ڕووبەری سەروتار درێژایی ستونێکی ڕۆژنامە تابلۆیدەکانو نیو ستونی لاپەڕەی ڕۆژنامە گەورەکان دەگرێت، ئەگەر لە سێ یەکی ئەم قەبارەیە کورتتر بوو ئەوا بە (سەروتارێکی کورت Leaderette)[٣٨٩] ناودەبرێت.

ب. وتاری سەردەستە، یان سەرە (Leading Article): وتارێکە لە جێی سەروتار یان لە ستونی کۆتایی لاپەڕە (یەك)ی ڕۆژنامەدا سەرنوسەر بەناوی خۆیەوە، یان ئەندامێکی دەستەی نوسەران، یان نوسەرێکی دیاری ئەزمونگەر دەینوسێتو لە هەموو بارەکاندا ناوی نوسەری وتارەکەی لەسەرەو دواجار بە ڕای ڕۆژنامەکە نازانرێت، ((ئەرکی شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی ڕوداوو هەواڵە گەرمەکانی ڕۆژەو خوێنەر لە ڕێی بیرو سەرنجە وردەکانییەوە دەبەستێتەوە بە ڕۆژنامەکەوە))[٣٩٠]، پەیوەندیگەلێکی ویژدانیانە لەگەڵ خوێنەراندا دروستدەکات لە ڕێی ئەو بەڵگەو بەهانە لۆژیکییانەی کە دەیانخاتە خزمەتی بیری گشتیی بابەتەکەو ڕایەڵەی سەرەکیی سیاسەتی ڕۆژنامەکەوە.

پ. کورتە وتار (Paragraph): بە وتارێکی کورت دەوترێت کە تیایدا نوسەر بە ئاماژەیەکی کورتو خێرا بیرەکەی خۆی دەخاتەڕو، ((هەمیشە ئەم جۆرە بابەتانەش هەڵگری یەك بیرۆکەی دیاریکراو دەبن))[٣٩١]، هەندێك جاریش بەناوی "وتەیەك"ەوە دادەبەزێت[٣٩٢].

ت. ڕۆژانە وتار (Diary): ((وتارێکە لە ناوەڕۆکیدا چەند بابەتێکی هەنوکەیی و ڕۆژانەی لە خۆ گرتووە))[٣٩٣]، کە لە تێبینیی و ڕامانو سەرنجی نوسەرەکەیەوە سەرچاوەیانگرتووەو لە یەك وتاردا چەند بابەتێکی سەربەخۆ دەخرێنەڕو.

---

[389] د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٣٢٦).

[390] د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٣٢٧).

[391] سەرچاوەی پێشوو (٧١٤).

[392] بڕوانە: د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ٤١٩).

[393] د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٢٧٧).

ج. وتاری سەرەکیی: بەو وتارە دەوترێت کە دەبێتە بابەتی سەرەکیی لاپەڕەکەی خۆیو لە بەر بایەخی بابەتەکە، بابەتەکانی تر لە ڕوی دیزاینو بڵاوکردنەوەوە وابەستەی ئەودەبن.

ح. وتاری ئاسایی: فۆڕمی گشتیی وتار نوسینە کە لە سەرەتادا باسکرا، بەڵام لەم جۆرەدا هەموو جۆرە مەبەستو ناوەڕۆکێك جێیان دەبێتەوە، وتارنوس بەپێی ئەزمونو پسپۆڕییو لێزانینی خۆی وتارەکە دەنوسێتو مەرج نییە تەنها وتارێکی ڕۆژنامەنوسیی ڕوت بێت، ئەم جۆرە وتارەش دابەشدەبێت بۆ[٣٩٤]:

١. چیرۆکە وتار.
٢. وتاری دانپیانان.
٣. وتاری کاریکاتێری.
٤. وتاری زانستیی:
   أ. زانستەمرۆڤایەتییەکان، وەك: ( وەرزش، ئابوری، زمانەوانی، ئەدەبی، بازرگانی، یاسایی، جوگرافیی، مێژویی، ...تاد).
   ب. زانستە پەتییەکان، وەك: ( پزیشکیی، ئەندازیاریی، بایۆلۆژیی، جیۆلۆژی، ...تاد).
٥. وتاری ڕۆژنامەنوسیی.
٦. وتاری ڕەخنەیی.
٧. وتاری شیکاریی.
٨. وتاری ساتیری.
٩. وتاری بەراوردکاریی.
١٠. وتاری کەسیی.
١١. وتاری کۆمەڵایەتیی.
١٢. وتاری وەسفیی.
١٣. وتاری فەلسەفیی.
١٤. وتاری ئایینی.

---

394 بروانە: د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٨ أ : ١٧٢-٢٢٦)، د. فاروق أبو زيد (١٩٨٣ : ١٨١).

## ٢. ستونی ڕۆژنامەنوسیی (Column)

ڕۆژنامە بە پێی سیستمی ستون دابەشدەکرێت و بابەتەکانی لەسەر ئەم پەیڕەوە بڵاودەکرێنەوە، ستونی ڕۆژنامەنوسیی بەو بابەتانە دەڵێن کە لە یەکێك لەو ستونانەی ڕۆژنامەکەدا بڵاودەکرێتەوە کە (( درێژییەکەی بەدرێژایی لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکەو پانییەکەی بەپێی قەبارەی ڕۆژنامەکە دەگۆڕێت))[٣٩٥]، بەڵام هەموو کاتێك مەرج نییە ستونێکی ڕۆژنامەنوسیی هەموو درێژیی لاپەڕەکە بگرێتەوە. بابەتێکی تێدا دەنوسرێت کە نوسەر بە ئارەزومەندیی خۆی دەینوسێت و گوزارشتە لە دیدی ئەو بۆ ئەو بابەتەی لەسەری دەنوسێت و بابەتەکە بەبیرو بۆچوونی نوسەرەکەی دادەنرێت و ناوی نوسەرەکەی لەسەرە، ((بیرۆکەیەك، یان ڕایەك، یان بۆچونێکە کە دێتە بیری نوسەرەکەوەو ئەویش چەند دێڕێکی کورتی لەسەر دەنوسێت و زیاتر لە سەر ڕوداوێك یان دیاردەیەکە کە سەرنجی نوسەرەکەی ڕاکێشاوە))[٣٩٦]، نوسەر تەنها کێشەیەك یان بابەتێك ناخاتەڕو، بەڵکو ڕێوشوێنی چارەسەرکردنیشی دەستنیشاندەکات و لە زۆر باردا ((لە ژینگەی نوسەرو پێگەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵ ناچێتەدەرەوە))[٣٩٧] و مەرجیش نییە نوسەرەکەی وابەستەی سیاسەتی ڕۆژنامەکە بێت کە تیایدا بڵاودەکاتەوەو زیاتر لە ئەزمونی کەسییەوە سەرچاوە دەگرێت، نوسەر لەسەر بنەمای توندوتۆڵکردنی پەیوەندیی لەگەڵ خوێنەردا دەینوسێت و هەوڵدەدات زۆرترین زانیاریی و واتا لە کەمترین وشەو ڕستەدا دەربڕێت[٣٩٨]، لەسەرەتای ستوندا بابەتێك دەخرێتەڕو، لە درێژەی ستونەکەدا قسەی لەسەر دەکرێت. یان دەوترێت: (( ستونی ڕۆژنامەنوسیی بریتییە لە بیرۆکە، یان ڕا، یان چارەسەرسازیی کێشەیەك و تیایدا

---

[395] د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ١٩٤).

[396] د. قاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ : ٦٩).

[397] د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٨ : ٢٢٧).

[398] بڕوانە: د. فاروق أبو زيد (١٩٨٣ : ١٩٧).

خۆیەتیی و درکی ڕۆژنامەنوسییانەی نوسەر دەردەکەوێت))[٣٩٩]. یان ستون بە تاك ستونێکی ناوستونەکانی ڕۆژنامە دەوترێت و تیایدا گوزارشتێکی ڕۆژنامەنوسانە دەنوسرێت، پەیڕەوی لاپەڕەی ڕۆژنامەکان وادەخوازێت لە پەڕەیەکدا لە یەك ستون زیاتر نەبێت، زۆرێك لە نوسەرە ناودارەکان ستون لە ڕۆژنامەکاندا دەنوسن بەو مەبەستەی وابەستەیی خۆیان بە خوێنەرەوە لەدەستنەدەن و زانیاریی خوێنەران و ڕای گشتیش بەئەزمونی دەوڵەمەندو شێوازی دەرکەوتووانەی خۆیان دەوڵەمەندبکەن[٤٠٠].

ستونی ڕۆژنامەنوسیی دابەشدەبێت بۆ:

ا. ستونێك کە شوێن و نوسەرو ناونیشان و بواری بابەت و کاتی بڵاوبونەوەی دیاریکراوە[٤٠١].

ب. ستونێك کە شوێن و نوسەرو ناونیشان و کاتی بڵاوکردنەوەی دیاریکراوە بەڵام بابەتەکانی هەمەڕەنگن[٤٠٢].

پ. ستونێك کە شوێن و ناونیشان و بوارو بڵاوبونەوەی دیاریکراوە بەڵام نوسەرەکەی دیارینەکراوە.

ت. ستونێك کە شوێن و ناونیشان و بڵاوبونەوەی دیاریکراوەو نوسەرو بابەتی دیارینەکراوە.

ج. ستونێك کە شوێنی دیاریکراوەو ئەوانی تری دیارنەکراون.

ح. ستونێك کە هیچ یەکێك لەو بنەمایانەی دیارینەکراون و بە پێی هەبونی بابەت بڵاودەکرێتەوە.

---

[399] د. محمود فهمي (١٩٦٤ : ١٣٨).

[400] بڕوانە: www.de.wikipedia.org/wiki/kolumn

[401] Seon Brone: (1976: 134).

[402] د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ١٣١).

### ٣. گۆشە (Angle)

لە زۆر ڕووەوە تایبەتمەندیی ستونی ڕۆژنامەنوسیی هەیە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە لە یەکێك لە گۆشەکانی ڕۆژنامەکەدا دادەنرێت، ناشێت بکەوێتە هەر ستونێکی ڕۆژنامەکەوەو شوێنەکەی جێگیرو دیاریکراوە، (( نوسەر بابەتێکی دیاریکراوی وەسفئامێزانەی هەواڵ یان ڕوداوێکی تێدا دەخاتەڕو))[٤٠٣] کە دواجار لە تێڕوانین و رامانی نوسەرەکەی ناچێتە دەرەوە.

### ٤. گۆشە نیگا (Viewpoint)

بینین و تێڕوانین و ڕاوبۆچونی کەسێکە لەسەر بابەت یان ڕوداوێك، هەڵسەنگاندن و مەزەندەکردنییەتی بەپێوانەی هۆشی خۆی و ((دۆزینەوەی پەیوەندییە لە نێوان پێکهاتەکاندا))[٤٠٤]، شوێنی دیاریکراوی لە ڕۆژنامەدا نییەو تایبەت نییە بە کەس و کات و بابەتێکی دیاریکراوەوە، لە کتێبی (نوسین و نوسینی ڕۆژنامەنوسیی کاریگەر)دا، کە لەلایەن (پەیمانگای ڕۆژنامەنوسیی ئەمریکیی)ەوە بڵاوکراوەتەوە، هاتووە: (( وێسگەو هەڵوێستە ئاڵۆزەکان جێگای تاقیکردنەوەو ئەزمونی نوسەرن، ئەو پەیوەندییانەی لە نێوان دوو توخم یان چوار یان چواردەدا هەن چین؟ ئینجا ئەگەر تۆ نەیزانی ئەی چۆن خوێنەر دەیزانێت؟))[٤٠٥].

### ٥. ڕونکردنەوە (Clarification)

خستنەڕو، یان وەڵامدانەوەی بابەتێکی بڵاوکراوە یان ڕایەکی بەرامبەرە کە نوسەر یان ڕۆژنامە لە بەر نادیاریی یان شاراوەیی ئەو لایەنەی لەسەری دەنوسرێت ناچاردەبێت ڕونکردنەوەی زیاتر بدات، یان بەخشینی زانیارییە لەلایەن دەزگا یان

---

[403] د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ٥١).

[404] سەرچاوەی پێشوو (٥٩٦).

[405] مالکۆلم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ٤٧).

سەرچاوەیەکی زانیارییەوە لەسەر ڕوداو یان هەڵوێست یان بابەتێکی بڵاوکراوەی دیارکراو، بۆئەوەی پاکانەی خۆی یان هەڵوێستی خۆی دەربارەیان دیارییکات.

### ٦. بیرۆکە (Idea)

بیرۆکە بەگشتیی بنەمای هەر کارێکی ڕۆژنامەنوسییە[٤٠٦]، وەك هونەرێکی سەربەخۆش مەبەست لێی ئەو بروسکە بابەتە خێراو سەنجڕاکێشەیە کە نوسەرێکی ڕۆژنامەنوسیی لە بزاوتەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆی یان کۆمەڵگا، یان دەسەڵات، لەناوخۆدابێت یان دەرەوە، دەیهێنێتو وەك بروسکە بابەتێك بڵاویدەکاتەوە، لە زۆربادا ئەم بیرۆکە بڵاوکراوەیە دەبێتە بنیاتو ماکی هونەرێکی ڕۆژنامەنوسیی بەرفراوانو گەورەتر. یاخود هەستێکی ڕۆژنامەنوسییانەی خێرایە بەرامبەر بە بابەت یان ڕوداوێکی دیاریکراو.

### ٧. هەڵسەنگاندن (Evaluation)

کێشانەکردنو خستنەڕوی بابەتێکی بڵاوکراوەیە، کە دواتر نوسەری هەڵسەنگێنەر دێتو بەپێی لێکدانەوەکانی خۆی پێوانەی دەکاتو سەرنجەکانی لەسەری دەخاتەڕو، یان شیکردنەوەی هەڵوێستو ئاراستەگەلی جەماوەرە کە لە ڕێی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە دەستدەخرێنو وەستانە لەسەر پاڵنەرو ئامانجەکانیانو دانانی ڕێوشوێنی پێویستە بۆ چۆنێتیی ئاراستەکردنی ڕای گشتیی لە ڕێی بابەتە نوسراوەکانی ناو ڕۆژنامەکەوە کە خودی ئەم پرۆسەیەش وەك بابەتێك بڵاودەکرێتەوە[٤٠٧].

---

[406] بڕوانە: د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٤٧٧).

[407] بڕوانە: سەرچاوە پێشوو( ٣٤١).

## ٨. پیشاندان (Survey)

نمایشکردنی بابەتێکە وەك ئەوەی نوسەر دەیەوێت، بابەت خستنە پێش چاوی خوێنەرە، لە چاوی نوسەرەکەیەوە، بەڵام نوسەر هەوڵدەدات کار لەسەر بنەما فیکرییەکان بکات تا بڕواو سەرنجو بزواندن لای خوێنەر دروستبکات، هەندێك جار بە پیاچونەوەو گەڕانەوە بۆ ئەو بابەت یان ڕوداوانەی پێشتر نوسراون دەبێتو نوسەر خوێندنەوەی نوێیان لە بارەوە دەردەبڕێتو دەکرێت بەچوار جۆرەوە[٤٠٨]:

ا. شێوازی دۆکۆمێنتاری، کە نوسەر تیایدا ئەو بەڵگەنامانە هەڵدەبژێرێت کە لەگەڵ ئامانجەکەیدا دێنەوە.

ب. شێوازی شیکاریی، نوسەر لێکۆڵینەوە لە ڕوداوێك و دەخالەتی ڕوداوەکانی تر لەم ڕوداوە دەکات، لە هۆکارەکانی ئەم دەخالەتکردنە دەکۆڵێتەوە.

پ. پیاچونەوەو پشکنینو پیشاندانێکی بەرفراوانانەی بابەتێکی دیاریکراو.

ت. شێوازی چێوەبەندیی، بەدیاریکردنی بابەتێك دەبێت لە ناو بابەتگەلێکی تردا.

## ٩. گێڕانەوە (Narration)

ڕونکردنەوەو باسکردنی بابەت یان ڕوداوێکە بۆ خوێنەر بەتایبەتیش بۆ ئەو بابەتە تۆمارکراو یان هەواڵیانەی کە گوزارشت و زاراوەو مەبەستگەلێکیان تیادەبێت کە لای خوێنەر ڕوون نابن، یان (( باسکردنو ڕونکردنەوەیە لەسەر دراما یان فیلمێك کە لە ڕێی وێنەکانییەوە واتا دەدات))[٤٠٩]، نوسەر وێنەکان دەکاتە نوسین بەو تێگەیشتنەی خۆی دەربارەی ئەو بابەتە لای دەخەملێت، لە زۆرباریشدا لە چییەتیی ڕوداوەکان دەکۆڵێتەوە.

---

[408] بڕوانە: د. ا. بوریتسکي (١٩٩٠ : ٢٠٢).

[409] بڕوانە: د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٦٤٤).

## ١٠. چیرۆکی ڕۆژنامەنوسی (Story)

گێڕانەوەی ڕوداوێکی ڕاستەقینەیە بەشێوازێکی ئەدەبیانەو وابەستەی شێوازو بەهرەمەندیی ڕۆژنامەنوسەکە دەبێت کە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێشەرانە ڕوداوەکە بگێڕێتەوە، ئەم جۆرە وابەستەی کاتی ڕودانی ڕوداوەکە نابێت، دەشێت چیرۆکێکی ڕۆژنامەنوسیی دەربارەی ڕوداوێك بنوسرێت کە لە کاتێکی بەسەرچوشدا ڕویدابێت، ئەوەی گرنگە خودی ڕوداوەکەو وادەو کەسەکان و هۆکارو ڕەوتی بابەتەکەو ئەنجامەکانن کە هەموو ڕاستەقینەن، زیاتریش ئەندێشەو سۆزی نوسەری ڕۆژنامەنوسیی دەیانکاتە بابەتێکی ڕۆژنامەنوسییانە، (( چیرۆکی ڕۆژنامەنوسیی بریتییە لەو ڕێگەیەی ڕۆژنامەنوس بەهۆیەوە لەگەڵ هەست و سۆزی خوێنەردا دەدوێت بە بابەتییەکی تەواوەوە، لە زۆرکاتدا تەوەری نوسینەکە یان تایبەتییە، یان مرۆیی، یاخود باس لە شوێنێك دەکات، زیاتر لە ئەدەبەوە نزیکەو جۆرێکەی لە جۆرەکانی نوسینی وەسفکاریی))[٤١٠]، ئەوەی تایبەتمەندیی بەم چیرۆکە دەدات ئەوەیە ((گرنگترین خاڵی سەرەکیی یان گرێی ڕوداوەکە لە سەرەتادا دەخرێتەڕو دواتر دێتە سەر بۆدیی بابەتەکەو پاشان وردەکارییەکانی دەنوسێتەوە))[٤١١]، سەرەتای ئەم چیرۆکە سەرەتایەکی هەواڵدەرانەیەو هەر لەسەر بنەمای سەرەتا یا پێشەکیی چیرۆکەکەیش جۆرەکانی دیاریدەکرێن[٤١٢]، کە بریتین لە:

ا. سەرەتایەکی کۆتەیشنانە (The Quote Lead).

ب. سەرەتایەکی تۆو منانە (You& I).

پ. سەرەتایەکی پرسیاریانە (Question Lead).

ت. سەرەتایەکی بەهێز(Punch Lead).

---

[410] هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ : ٧٤).

[411] د. محمود فهمي (١٩٦٤ : ٧٤).

[412] سەرچاوەی پێشوو (٧٤-٧٥).

ئەرکە بنەڕەتییەکانی چیرۆکی ڕۆژنامەنوسیی بریتی دەبن لە: گەڕان بەدوای ڕاستییەکان‌و خستنەڕویان بەشێوەیەکی گونجاوو پێشکەشکردنی ئامۆژگاریی‌و ڕێنمایی دور لە شێوازی مامۆستایی‌و بەشداریکردن لە پێکهێنانی ڕێگەی بیرکردنەوەی خوێنەرو پیشاندانی کەسایەتییە دیارەکان‌و قۆستنەوەی ڕای گشتیی لە ڕێی گفتوگۆکردن لەگەڵ هەست‌و سۆزیانەوە.
ئەم هونەرە دەیەوێت دیمەن‌و وێنەکانی ڕوداو لەڕێی وشەکانەوە پیشانبدات بەجۆرێك کەوێنەی ڕاستەقینەی ڕوداو لای خوێنەر دروستبکات[٤١٣].

## ١١. لێدوانی ڕۆژنامەنوسی (Editorial Comment)

شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی ناوەڕۆکی هەواڵ یان ڕا یان بابەتێکە کە نوسەری لێدوانی ڕۆژنامەنوسیی لە تێڕوانینی خۆیەوە پرۆسەیەکی لەو جۆرە بەڕێوەدەبات‌و زۆرجار بە وەڵامدانەوە یان بەدرۆخستنەوە یان بە بەرپەرچدانەوەی بابەتێکی بلاوکراوە دەبێت‌و تیایدا هەڵەو لایەنە نێگەتیڤییەکانی لە بابەتی یەکەمدا هەبوون زەق دەکرێنەوەو نوسەر هەوڵدەدات لەسەر بنیاتی بابەتی یەکەم ڕاو تێڕوانینێکی نوێ بداتە خوێنەر کە زۆرجار پێچەوانەی یەکەمە[٤١٤]. ئامانجی ئەم هونەرە تێگەیاندنی باشتری خوێنەرە و بوار بە ڕۆژنامە دەدات زیاتر لەسەر ئەو دۆزانە بووەستێت کە دەکەونە خانەی ستراتیژی ڕۆژنامەکەوەو مەرجیش نییە وەك ژانرەکانی هەواڵ وابەستەی هەنوکەیی بابەتەکە بێت.
بەپێی جۆری بابەتەکەو ئاستی وابەستەیی بە جۆرێك لە خوێنەرەوە دادەڕێژرێت‌و لە توانایدا هەیە پەی بە خواستەکانی خوێنەرو چۆنێتیی قەناعەتپێکردنی بەرێت‌و لەگەڵ هۆش‌و ویژدانیاندا بدوێت، (پرۆفیسۆر سێرجی لۆکاچ) دەڵێت: (( لێدوان گوزارشتێکە لە تێڕوانینی ڕۆژنامەنوس، دەربارەی ڕوداو یان دیاردەیەکی

---

[413] بڕوانە: د. أ. بوريتسكي (١٩٩٠ : ١٨١).

[414] بڕوانە: د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ٣١٩).

دیاریکراو لە سەر بنەمای هەڵسەنگاندنێکی بابەتیانەو وابەستە بە بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە کە بە شێوەیەکی لۆژیکیی و کورتیی و بە زمانێکی جەماوەرییانەی ئامانجدار هانی خوێنەران دەدات بۆ مەبەستەکەی خۆی))[٤١٥].

## ١٢. ڕانان (Review)

نمایشکردن و خوێندنەوەی کتێبێك یان لێکۆڵینەوەیەکە لەگەڵ ڕونکردنەوەو هەڵسەنگاندن و دەرخستنی لایەنە بەهێزو لاوازەکانیدا لە دیدێکی ڕەخنەگرانەی کەسییەوە[٤١٦]، لە هەندێك سەرچاوەشدا بە زاراوەی ڕانانی کتێب ( Book reviewing) دێت[٤١٧].

## ١٣. ساتیر (Satire)

ئەم هونەرە شێوەیەکە لە شێوەکانی داشۆرین و گاڵتەجاڕیی[٤١٨]، بەڵام لێرەدا نوسەر بەشێوەیەکی بابەتیانە ڕەخنەو پلارەکانی پێشکەشدەکات و مەبەستی لە بابەتەکەی تەنها پێکەنینی خوێنەر نییە، یان سوککردنی پرۆژە، یان کەسی لەسەر نوسراو نییە ((گاڵتەجاڕییەکە کە مەبەستی بیناکردنە نەك ڕوخاندن و شکاندن))[٤١٩]، بەشێوازێکی پێچەوانەی ڕوداوەکان وەك جامی وێنەی فۆتۆگرافیی بڕگەکان پیشان دەدرێت و نوسەر مەبەستی دەرخستن و ڕەخنەیەکی بنیاتنەرانەی تەنزئامێزی بابەتیانەیەو لە زۆرباردا چارەسەری کێشەو گرفتەکانیش دەستنیشان دەکات و جیاوازی لەگەڵ وتاری ساتیرییدا ئەوەیە کە کورتەو دەربارەی بابەتە هەنوکەییەکان دەنوسرێت و دەشێت نوسەر وێنەو کاریکاتێر یان

---

[415] د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :٢٠٠).

[416] بڕوانە: د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ٨٣١).

[417] بڕوانە: د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ٨١).

[418] بڕوانە: د. سيروس شميسا (١٩٩٥ : ٢٣٤).

[419] بڕوانە: د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ٨٤٩).

هەر ئامرازێکی یاریدەدەری تر بۆ پتەوکردنی بابەتەکەی بەکاربهێنێت. هەر لە ساتیردا جۆرێکی تر هەیە کە بە زمانێکی زبرو توندوتیژانەو ڕاشکاوانە و کۆمیدییانە لە دیاردەیەك دەدوێت بەمەبەستی پەندلێوەرگرتن[٤٢٠].

نوسەری ساتیری (Satirist) لەسەر بابەتێك دەوەستێتو ڕادەمێنێت تا وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانەی لێدەربێنێت، بەئاگاییەوە ئاراستەی نوسینەکەی لەم ڕامانەوە دەگۆڕێت بەئاراستەیەکی تر بەجۆرێك کە شتێکی دیاری ناوازەی سەردەمەکەی لە شوێنێکی ترەوە دەهێنێتو بەرامبەریی پێدەکات لە بەرامبەر ئەو شێوە دواکەوتووەی کە کەوتۆتە بەردەم ڕەخنەکانی ئەمو خاڵە لاوازەکان لەبەرامبەر ئەو وێنە گەورەکراوە ناوازەیەدا ڕادەگرێت[٤٢١].

## ١٤. پارۆدی (Parody)

ئەم هونەرەش شێوازێکی گاڵتەجاڕییانەی ڕەخنەگرانەی هەیە، بەڵام لەسەر ((بنەمای هەڵوەشاندنەوە دەنوسرێت))[٤٢٢] و زیاتر بەلای داشۆریندا دەڕوات، واتە بابەت یان ڕوداوێك دەهێنێتو دەیخاتە ژێر نەشتەری پلارەکانییەوەو بیرەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە، بیرێکی تر بەڕای نوسەر لەسەر ئاسەوارەکانی پێکدەهێنێتەوە.

ئەم هونەرە ئەوەی لە شانۆی پارۆدییدا بەڕێوەدەچێت کە لاسایکردنەوەیەکی گاڵتەجاڕییانەی هەیە، نوسەر لە ڕێی زمانەوە دەیکاتە دیمەنێکی نوسراوو ((هەمان ئەو شێوازە گاڵتەجاڕییە باوەی خۆیشی دەپارێزێت))[٤٢٣].

---

[420] بروانە: www.jenskleemann.de/wissen/bidung/wikipedia/j/jo/journalistische-dar

[421] بروانە: جنکیزایتماتوف (١٩٨١ :١١٨).

[422] د. سیروس شمیسا (١٩٩٥ : ٢٣٠).

[423] www.jenskleemann.de/wissen/bidung/wikipedia/j/jo/journalistische-dar.

## ١٥. پۆلیمیك (Polemic)

بابەتێکی وتووێژخوازانەی ڕووبەڕووانەی هێرشبەرانەی نێوان دوو نوسەر، یان دوو خاوە ڕا یان زانیارییە، کە بەدژە ئاراستەی یەکتر وتووێژەکانیان بۆ دژایەتیکردنی بیرو سەرنجی یەکتری بەکاردەبەنو زۆرجار دەبێتە ((هێرشێکی نابابەتییانەی نازانستییانەو زۆرلەخۆکردنو بێبەهاکردنی بەرامبەری تێدا دەردەکەوێت))[٤٢٤]، یان دەوترێت: ((وتووێژێکی هەڵچووانەی لێزانانەیە، یاخود هاندانی گفتوگۆیەکە کە لە هەردوو بارەکەدا دەبنە هۆی ناکۆکیی، ئیدی لە بواری فەلسەفیی، یان ئایینیی، یان سیاسییدا بێت، ئەم زاراوەیە لە زاراوەی کۆنی یۆنانیی (Polemikos)ەوە هاتووە کە بەمانای جەنگاوەر یان شەڕکەردێت))[٤٢٥]، هەندێك جاریش بە دژەئاراستە، یان ئاراستەی پێچەوانەش ناودەبرێت.

## ١٦. ڕاپرسی (Questionnaire)

پرسیار یان کۆمەڵە پرسیارێکی دیاریکراوە لە ڕوداو یان مەراسیم یان بۆنەیەکی دیاریکراودا ڕووبەڕوی ژمارەیەك لە خەڵك یان خوێنەران دەکرێتەوە بۆ زانینی بیرو ڕاو هەڵوێستیان دەربارەی ئەو ڕوداوە[٤٢٦]، ئەو ڕایانەی لێرەدا بڵاودەبنەوە گوزارشتێکی تاکەکەسییانەیان هەیە، بۆیە نوسەری ڕاپرسیی میتۆدی خۆی لەسەر بنەمای بابەتەکەی یان سیاسەتی ڕۆژنامەکەی دادەڕێژێتو پرسیارێك دەخاتە بەر وەڵامدانەوە کە لە زۆربازدا خزمەتکردن بێت بەو مەبەستەی دەیخوازێت، هەندێك جاریش بۆ زانینی ڕای گشتیی و کاردانەوەی خەڵك بەرامبەر ڕوداوەکان بەکاردەبرێتو، بەگشتیی دەکرێت بە دوو جۆرەوە[٤٢٧]:

أ. ڕاپرسییەکی ڕاستەخۆ، کە ڕووبەڕو ڕۆژنامەنوسەکە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات.

---

[424] سەرچاوەی پێشوو.

[425] www.wissens-quiz.de/polemik.

[426] بڕوانە: د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ٤٦٧).

[427] بڕوانە: د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ٧٩٤).

ب. راپرسییەکی ناڕاستەوخۆ، لە ڕێی نامە یان ئیمێڵ یان پێگەکانی ئیتەرنێت، یان لاپەڕەکانی ڕۆژنامەوە دەکرێت.

## ١٧. ڕەخنەگرتن (Critic)

هونەرە ڕۆژنامەنوسییە خودییەکان بەگشتیی لەسەر بنیاتی ڕەخنەگرتن و پرۆسەی ڕەخنەسازییانەی بابەت و ڕوداوەکان دامەزراون، بەڵام مەبەست لە هونەری ڕەخنەگرتن وەك هونەرێکی سەربەخۆ لە ڕۆژنامەنوسییدا، ڕەخنەیەکی نوسراوە کە ڕاستەوخۆو بابەتییانەو ئاشکرایانە ڕەخنەکانی تێدا خراوەتەڕو، هەندێك سەرچاوە بە هونەری ڕەخنەگرتن لە خودی ڕەخنەگیراوەکانیش ناویدەبەن و لەسەر بنەمای هۆکارو ئەنجام کار لەسەر چەمك یان بەرهەمی ڕەخنەیی کەسەکان دەکات[٤٢٨].

## ١٨. میلۆدونگ (Meldung)

نوسینێکە کە بە گوزارشتێکی هەستییارانەی ڕۆژنامەنوس دەنوسرێت و تیایدا بەشێوەیەکی سادەو ساکارو بەزمانی خەڵك، گومان و تۆمەتەکان دەخاتەڕو، ((هەندێك جار بە نوسینێکی پۆلیسییانە ناودەبرێت کە تیایدا لە تۆمەتباریی کەسێك دەدوێت، یان تۆمەتی تاوانێك دەخاتەڕو))[٤٢٩].

## ١٩. نامە (Message)

بە نوسراوێکی تایبەت دەوترێت کە کەسانی دەرەوەی ڕۆژنامە دەینوسن، ئاراستەی کەسێك یان ڕای گشتیی یان دامەزراوەیەك دەکرێت و لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێتەوەو لە نامەیەکی کەسیی دیاریکراوەوە دەبێتە بابەتێکی گشتیی و بەسەر ئەم جۆرانەدا دابەشدەبێت:

---

[428] بڕوانە www.de.wikipedia.org/wiki/kritik

[429] www.wissens-quiz.de/meldung.

ا. نامەی خوێنەران یان هاووڵاتیان بۆ ڕۆژنامەکە[٤٣٠] (Letter to the Editor)، نامەیەکە خوێنەران ڕاو سەرنجی خۆیان بۆ ڕۆژنامەکە، یان داواکارییەکانیانی بۆ لایەنە بەرپرسەکان تێدا دەنوسن‌و لە ڕۆژنامەدا بڵاودەبێتەوە.

ب. نامەی کراوە(Open letter)، نوسراوێکە وەك نامەی ناڕەزایی یان داواکاریی یان بەدەنگەوەهاتن، دەستەیەك یان لایەنێك یان کەسێك دەینوسێت‌و لە ڕێی ڕۆژنامەوە ئاراستەی ڕای گشتیی یان لایەنە بەرپرسەکانی دەکات[٤٣١] و دەیەوێت هاووڵاتیان وەك شایەتێکی ناڕاستەوخۆی داواکارییەکانی لێبکات.
یاخود نامەی سەرکردەیەکە لە ڕێی ڕۆژنامەوە ئاراستەی جەماوەر یان ڕای گشتیی جیهانیی دەکرێت.

پ. نامەی تایبەت (Speical message)، نامەیەکە کەسێك بۆ کەسێکی تری ڕەوانەدەکات، کە کەسی یەکەم یان دووەم یان هەردولا کەسانی ئاسایی نین‌و تیایدا سەرنج‌و ڕاو زانیاریی ئاڵوگۆڕ دەکەن‌و گەر دەست ڕۆژنامەیەك بکەوێت وەك جۆرێك لە بەڵگەنامە بڵاودەکرێتەوە، وەك نامەی نێوان دوو ڕۆشنبیر، یان دوو بازرگان، یان دوو سیاسیی،...تاد.

ت. نامەی نێوان سەرۆکی وڵاتان (Message)، ئەو نامە ڕەسمییانەن کە سەرۆکی وڵاتێك بە هەر بۆنەیەکەوەبێت ئاراستەی سەرۆکی وڵاتێك یان گەل‌و وڵاتێکی تری دەکات.

ج. نامەی دۆستانە (Goodwill message)، نامەیەکی ودیی یان دۆستانەیە کە لە نێوان دوو کەس یان دوو دەستە یان گروپ یان زانکۆدا بۆ دروستکردنی دۆستایەتیی‌و ئاشنایەتیی‌و یەکترناسین‌و دەرخستنی نیازپاکیی، ئاراستەی یەکتری دەکەن.

---

430 بڕوانە: د. محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢ : ٣٣٠).

431 بڕوانە: د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ٦٨٧).

ح. نامەی کەسیی یان نهێنیی (Privatie message)، نامەیەکی نهێنیی یان کەسیی تایبەتە، بەنهێنی ئاراستەی لایەنێك یان کەسێکی بەرامبەر دەکرێت، وەك نامەی دەزگا هەواڵگرییەکان، یان باندەکانی مافیا، یان کەس و گروپە تیرۆریستییەکان و هەندێك جار بە هەر ڕێگایەك بێت ئاشکرادەبن یان ئاشکرادەکرێن و بایەخێکی گرنگیان لە ڕۆژنامەنوسییدا هەیە.

خ. پرسەنامە، نامەیەکە بۆ دەربڕینی هاوسۆزیی و سەرخۆشیکردن لە کەسێك، یان گروپێك، یان وڵاتێك، بۆ پرسەو ناخۆشیی و شینێکیان دەنوسرێت و هاوخەمیی نوسەرەکەی تێدا دەردەخرێت.

چ. پیرۆزبایی، یان نامەی خۆشیی کە لە بۆنە، یان ئاهەنگ یان سروت یان یادەوەریی یان ڕوداوێکی خۆشییدا دەنوسرێت و نوسەرەکەی هاوبەشیی و خۆشحاڵیی و کامەرانیی خۆی بۆ بەرامبەرەکانی دەخاتەڕو.

د. سوپاسنامە، نامەیەکی پێزانین و ستایش و سوپاسکردنە کە کەسێك یان دەستەیەك یان سەرکردەیەك یان کۆمەڵێك خەڵك بەناوی میللەتێکەوە بۆ کەسانی تر یان بۆ ڕۆژنامەیەك یان بۆ دامەزراوەیەکی دەنوسن و تیایدا ستایشی ڕۆڵی ئەو شوێنە یان کەسە دەکەن کە نامەکەی ئاراستەکراوە.

## ٢٠. یاداشتی ڕۆژانە (Day book)

گوزارشتێکە ڕوداوەکانی ڕۆژ لە ڕۆژنامەدا لە چێوەی بابەتێکدا تۆماردەکات[٤٣٢] ئیدی لەهەر بوارێکدا بێت، لە هەندێك ڕۆژنامەدا ستونی دیاریکراو لە یەکێك لە لاپەڕە دیارەکاندا بەم ناونیشانەوە دەکرێتەوەو بابەتەکانی ڕۆژی تێدا دەخرێتەڕو، یان زنجیرە نوسینێکە لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردن یان کۆنگرەیەك یان مۆندیالێك یان بارودۆخی ئاگربڕ، یان شەڕ یان ئاشتییدا دەنوسرێت و ڕۆژانە ڕوداوەکان دەخاتەڕو.

---

[432] بڕوانە: د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٢٥٩).

## ٢١. نوسینەوەی ژیاننامە (Biography)

نوسینەوەو بڵاوکردنەوەی ژیاننامەی کەسایەتییەکی ناودار، یان دیارە، کە لەلایەن ڕۆژنامەکەوە ژیاننامەکەی دەنوسرێتو ئەو لایەنانەی دەردەخرێن کە پەیوەندییان بە کاتو شوێنو بابەتی بڵاوکردنەوەی ئەو بابەت یان ڕوداوەوە هەیە کە شیاوی ناوهێنانو ناساندنەوەی ئەو کەسەیە، وەك یەکێك دەبێتە سەرۆکی وڵاتێك یان دەبێتە یاریزانێکی سەرکەوتو. یان ئەو بابەتەیە کە ڕۆژنامەنوسێك دەربارەی ژیانی تایبەتیی نوسەرێك یان سیاسییەك دەینوسێت[٤٣٣].

## ٢٢. ژیاننامەی کەسیی (Autobiography)

ئەو بابەتەیە کە کەسێك دەربارەی ژیانی خۆی بۆ ڕۆژنامەی دەنوسێت[٤٣٤]، واتە کەسێکە خۆی چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە، بەتایبەتیی کەسە بەئەزمونو دیارو دەرکەوتووەکان ئیدی لە هەر بوارێکدا بن.

## ٢٣. پانێل (Panel)

بەو بابەتە تۆمارکراوە نوسراوە دەوترێت کە چەند کەسێکی دەستنیشانکراو بەشداریی لە تەوەرو گفتوگۆکانیدا دەکەن، کە ((دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو))[٤٣٥]ەو وەڵامی پرسیارەکان لە دیدی خۆیانەوە دەدەنەوەو پرسەکان دەخەنە ژێرباری سەرنجی خۆیانەوە. یان بەشداریکردنی خەڵکە لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی ڕۆژنامەیەك دەیخاتە بەردەم ڕای گشتیی، وەك زانینی ئەنجامی یارییەکانی جامی جیهانیی.

---

[433] د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ٩٧).

[434] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (٦٨).

[435] سەرچاوەی پێشوو (٧١١).

## ٢٤. ئاگانامە (Advertisement)

بریتییە لەو پەیامە تایبەتەی دەربارەی کەسێك یان بابەتێکی دیاریکراو دەنوسرێت، بەمەبەستی ئاگادارکردنی خەڵك بەو ناوەڕۆکەی لە نوسراوەکەدا دێتو لەزۆربارداا ڕۆژنامە لە بەرامبەر بڵاوکردنەوەیدا پارەی خۆی وەردەگرێتو بەداهاتێکی بەهاداری پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی دەژمێررێت. لەلایەکی تریشەوە دەبێتە شێوازێك بۆ هاندانو کۆکردنەوەی خەڵك لە دەوری ئەو ئامانجەی ڕۆژنامەکە هەیەتی و هەنێك جاریش دەچێتە خانەی چەواشەکارییەوە ئەگەر جۆری ئاگانامەکە گۆڕا بۆ شێوازێکی سیاسیی یان سەربازیی دیاریکراو، ((هونەری پیشاندانی ئایدۆلۆژیا یان بیر یان کاڵا یان خزمەتگوزارییەكو بانگەشەبۆکردنو برەودانە پێی))[٤٣٦]، بەگشتیی دابەشدەکرێت بۆ ئەم جۆرانە:

ا. ئاگانامەی بازرگانیی (ڕیکلام Reklam)، پەخشنامە یان نوسراوێکە کە بۆ بازاڕگەرمکردنو کڕیار دەستخستن بۆ بەرهەمێکی بازرگانیی لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێتەوە، ئاگادارکردنەوەی کڕیارە بەکاڵاو خزمەتگوزارییە ڕیکلام بۆکراوەکانو زانیاریی پێدانیانە دەربارەی زۆر لایەنی بابەتە ڕیکلامبۆکراوەکە[٤٣٧]، ((بایەخی ئەم هونەرە لە هونەرەکانی تر کەمتر نییە و بایەخگەلی گەورەی وابەستەیی ڕۆژنامەگەریی بە کۆمەڵگاو بنەما ئابورییەکانەوە دەردەخات))[٤٣٨]. سەرەتای بڵاوکردنەوەی ئاگانامەی بازرگانیی بۆ ڕۆژنامە بەریتانییەکان دەگەڕێتەوە ئەمەش وەك ئەنجامێکی ڕاستەوانانەی شۆڕشی پیشەسازیی و فرەبونی کایەکانی بەرهەمهێنان لەو وڵاتەدا[٤٣٩].

ب. بازاڕگەریی (Marketing)، ئەو پەخشنامەو نوسراوانەیە کە ڕۆژنامەیەك وەك پاشکۆیەکی سەربەخۆ لەگەڵ ڕۆژنامەکەیدا بڵاویدەکاتەوە و تایبەت دەبێت

---

436 سەرچاوەی پێشوو (٢١).

437 بڕوانە: د. بشیر عباس العلاق (١٩٩٨ : ٣٢).

438 د. هویدا مصطفى (١٩٩٩ : ٢٠٥).

439 بڕوانە: www.ekateb.net.bookcont/ch3-7

بەبەرهەمو بازاڕو نرخو جۆری کالاکانی کۆمپانیایەك یان فرۆشگاو دامەزراوەیەکی بازرگانیی و دەچێتە خانەی کاراکردنی فرۆشتن و بازاڕگەرمکردنی ڕاستەخۆی بەرهەمێك یان کۆمپانیایەکی دیاریکراوەوە. بازاڕگەریی (( خستنە بازاڕی کالایەك و بازاڕبۆگەرمکردن و برەوپێدانییەتی بەهۆی ئاگانامەیەکی تایبەت بەو کالایەوە لە ڕۆژنامەو میدیاکانی تردا))[440]، یان دەوترێت: بازاڕگەریی و ئاگانامەکانی ئەم بوارە، ئامرازێکی کاریگەرن بۆ زیادکردنی بەرهەمو پڕفرۆشیی و کەمکردنەوەی تێچونی کالاکان و بەستنەوەی خوێنەرە بە بازاڕو دامەزراوە بەرهەمهێنەکانەوە[441].

پ. پڕوپاگەندە (Propaganda)، ئاگانامەیەکی سیاسیی یان سەربازیی دیاریکراوە، ((وەسفکردن یان شیکردنەوەی لێدوانێکی دەرچوو لە حکومەتێکی دیاریکراو یان حیزبێکی سیاسییەو گومان لە دروستیی و ڕاستیی نییەت و مەبەستی ئەو لایەنە دەکرێت کە لێدوانەکەی داوەو نایەوێت بگەینە ڕاستیی))[442]، پەیمانگای شیکردنەوەی پڕوپاگەندەش دەڵێت: ((گوزارشتێکە لە بۆچوون و کرداری چەند تاکێك یان کۆمەڵێك کە پێشوەخت نەخشەی بۆکێشراوە بۆ کارکردنە سەر بۆچوون و کرداری چەند تاکێك یان چەند کۆمەڵێك))[443].

ت. ئاگاداریی (Declaration)، بلاوکردنەوەی نوسراوێکی دادگاکان یان دامەزراوە بازرگانیی و ئابوریی و ...تادییەکانە، دەربارەی باری کەسێتیی یان تۆمارکردنی ئامێر یان زیادکردن و کەمکردنەوەیەکی دیاریکراو، یان بانگکردن بۆ مەبەستێکی دیاریکراوەو لە ڕێگەیەوە کەس و لایەنی بەرپرسی لێ ئاگاداردەکرێتەوە.

---

440 د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ٦٠٠).

441 بڕوانە: د. محمد فريد الصحن (١٩٨٨ : ١١).

442 هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ : ٨٩).

443 سەرچاوەی پێشوو .

ج. مژدەدان (Preaching)، ئەو جۆرەیە لە ئاگانامە کە بە زۆریی لە پەیڕەوە ئایینییەکاندا پەیڕەودەکرێت، لە ڕێی مژدەدەرو زانای ئایینیی و بانگەشەکەری ئایین یان مەزهەب یان پەیڕەوێکی دیاریکراوەوە بانگەشە بۆ ئاین یان ئاینزاکەی خۆی دەکات و بەجۆرێك لە ئاگانامەی ئایینیی دەناسرێت.

هەندێك جاریش لە ڕۆژنامەدا بە ناوی "مژدە"وە ئاگانامەیەك بڵاودەکرێتەوە، کە لەبەر بایەخی ناوەڕۆکەکەی و چاوەڕوانیی هاووڵاتیان، ڕۆژنامە وەك مژدەیەك بڵاویدەکاتەوە، ئیتر دەشێت لە بەرامبەریدا بڕێك پارە وەربگیرێت لە سەرچاوەکە، یاخود بێبەرامبەریش بێت.

ح. دەنگۆ (Rumour)، بڵاوکردنەوەی بابەتێکە کە تەنها پشتی بە قسەو قسەڵۆکی ناو خەڵك بەستووەو لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە پشتڕاست نەکراوەتەوە، بەڵام لەبەر پڕفرۆشکردنی ڕۆژنامەیەك یان بزواندنی خوێنەر، بڵاودەکرێتەوەو چەندین شێوەی لێدەکەوێتەوە[٤٤٤]، وەك:

- دەنگۆی تۆمەتباریی.
- دەنگۆی دژ.
- هەڵمەتی دژە دەنگۆ.
- دەنگۆی تۆقێنەر.
- دەنگۆی کارەساتەکان.
- دەنگۆی ئاراستەکان.
- دەنگۆی هێواش.
- دەنگۆی ڕوخێنەر.
- دەنگۆی سەرسوڕهێنەر.
- دەنگۆی ڕەگەزپەرستیی.
- دەنگۆی نەتەوەیی.
- دەنگۆی مەزهەبپەرستیی.

خ. بۆزانین، بڵاوکردنەوەی ئاگادارییەکە بۆ ئاشناکردنی خوێنەرانی بە بەرهەمێك، یان ڕوداوێك بێئەوەی ڕۆژنامەکە بەدوای قازانج و دەسکەوتی ماڵییدا بگەڕێت.

---

[444] بڕوانە: د. محمد فرید محمود عزت (٢٠٠٢ : ٤٩٧).

## ٢٥. كاريكاتێر (Caricature)

وێناكردنی كەسەكانە بە وێنەو دەرخستنی شێوەو سیما دیارەكانی ڕویانە، ئەو تایبەتمەندییە ڕوكارییانە بەزیادەڕۆییانە دەردەخرێن، كە تایبەتمەندییەكی دیارو دەركەوتوی ڕو، یان جەستەیانەو بەشێوەیەكی پێكەنیناویی دەخرێنەڕو[445]،لە زۆرباردا لە وێنەیەك یان كۆمەڵە وێنەیەك پێكدێت كە لەگەڵیدا وتەیەكی نوسراویش هەیە بۆ ڕونكردنەوەی زیاتری مەبەستی كاریكاتێریستەكە، ((كاریكاتێر هونەرێكی لێكدراوە لە ڕەگەزی هەریەك لە هونەرەكانی شێوەكاریی و كۆمیدیا یان گاڵتەجاڕیی بە هەموو شێوەكانییەوە))[446]، ئەم هونەرە بەیەكێك لە هونەرە ڕۆژنامەنوسییە سەرنجڕاكێش و بەهادارەكان دەژمێررێت، ئەوەی تێبینی دەكرێت (( كاریكاتێر وەك هونەرێكی سەربەخۆ، لە دەركەوتنی ڕاستەقینەیەوە لە چەرخی هەژدەیەمدا تا ئەمڕۆ لە ململانێدایە لەگەڵ كێشەو گرفتە كۆمەلآیەتیی و سیاسییەكاندا))[447]، كاریكاتێر تەنها بۆ پێكەنین نییە، بەڵكو بۆ ڕەخنەو دەرخستنی دەردو ناتەواویی و لایەنە لاوازەكانی كۆمەڵ و سیاسەت و بوارگەلێكی تریشە.

لە لایەكی ترەوە كاریكاتێر بەو شێوە پێكهێنراوە دەوترێت كە ((ناوەڕۆكێكی گاڵتەجاڕییانە یان ڕەخنەگرانە یان بەراوردو جیاوازیگەلێكی كۆمیدیانەی تێدایەو بە هێڵكارییەكی زیادەڕەوی كراوانە دەردەخرێت، كە لە بنەڕەتدا لە وشەی "Caricatura"ی ئیتاڵییەوە هاتووەو لە زاراوەی "Caricare" وەرگیراوەو مانای زیادەڕەویكردن یان باركردن دەگەیەنێت))[448]. دابەشدەبێت بۆ

---

[445] بڕوانە: د. كرم شلبي (١٩٩٤ : ١٤٦).

[446] د. ممدوح حمادە (١٩٩٩ : ٩).

[447] سەرچاوەی پێشوو (١٣٤).

[448] د. ممدوح حمادە (٢٠٠٠ : ٣).

کاریکاتێری: (سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، کۆمیدیی، پۆرترێتیی)[٤٤٩] و هەر یەکێك لەمانەش بۆ چەندین جۆری جیاجیا دابەشدەبن.

کاریکاتێر بەم شێوانە لە ڕۆژنامەدا ئامادەیی دەبێت[٤٥٠]:

ا. لە گۆشەی سەربەخۆدا.

ب. کاریکاتێرێك لە سەر ڕوی دەرەوەی ڕۆژنامەیەك.

پ. وێنەی کاریکاتێریی.

ت. کاریکاتێرێك کە لەگەڵ گۆشە یان بابەتێکی تردا بڵاودەبێتەوە.

ج. کاریکاتێرێکی وەرگیراو لە ڕۆژنامەیەکی ترەوە.

ح. چیرۆکی کاریکاتێریی، لای خوێنەر بەم جۆرە کاریکاتێرە دەشوترێت "کۆمیکیس".

خ. وێنەیەکی کاریکاتێریی کە وەك لۆگۆیەك لەگەڵ ناونیشانی گۆشە یان ستونێکدا دادەنرێت.

چ. کاریکاتێری زنجیرەیی.

د. وێنەی کاریکاتێریی ڕیکلامو ئاگانامەکان.

ر. کاریکاتێری تەلەڤیزیۆنیی کە دواتر دەبێتە فیلمی کارتۆن (Cartoon film)[٤٥١].

## ٢٦. فیولیتۆن (Feuilleton)

یەکێکە لە هونەرە ڕۆژنامەنوسییە ڕەخنەگرییە گاڵتەجاڕییەکانو مەبەست پێی ((پێکەنینە بەشتی خراپ))[٤٥٢]، نوسینێکی پێکەنیناوییە لەسەر کێشەیەکی دیاریکراو دەنوسرێتو پشت بە فاکتە بنەڕەتییەکانی کێشەکەو بە دۆکۆمێنتو

[449] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو (٥-١٠).

[450] بڕوانە: د. ممدوح حماده (٢٠٠٠ : ١٦-٢٩).

[451] بڕوانە: د. کرم شلبي (١٩٩٤ : ١٤٧).

[452] د. مەغدید سەپان (٢٠٠٥ : ١٣٨).

نمونەکان دەبەستێت‌و پەیڕەوەی زیادەڕەویی‌و سەرسوڕهێنان‌و سەرچڵیی‌و ناوازەیی‌و دەرخستن‌و جەختکردنەوە لەسەر سیما دیارە تایبەتەکانی کەسێك یان ڕوداوێك دەکات‌و هەندێك جاریش ئەوەندە تەمومژاوییانە دەنوسرێت کە دیار نییە لەسەر چ دیاردە یان کەس یان هەڵوێستێك نوسراوە[٤٥٣]. بەگشتیی شێوەیەکی تێکەڵاوە لە ئەدەب‌و ڕۆژنامەنوسیی و بەکارهێنانی زمانە بەواتاگەلێکی تایبەت بۆیە ((هەڵەی زمانەوانیی بەهیچ شێوەیەك جێگای نابێتەوە، بچوکترین هەڵەی زمانەوانیی، دەبێتە تێکدان‌و سەقەت بوونی هەموو نوسینەکە))[٤٥٤]. فیولیتۆن ڕوداو دروست ناکات‌و لە سەر ڕوداوێکی قەوماوی ڕاستەقینە، یان کەسێکی ڕاستەقینە دەنوسرێت، پاش ئەوەی فیولیتۆننوس بەوردیی ڕوکارو ناوەڕۆکەکانی ئەو بابەتە دەپشکنێت‌و تاقییاندەکاتەوەو دەیانکاتە نوسینێکی ڕۆژنامەنوسیی وەها کە گاڵتەجاڕییانە لە واقیع دەدوێت[٤٥٥]، بێئەوەی توانج‌و ناوزڕاندن‌و لەکەدارکردنی ئاشکرای تێدا بێت‌و خۆی لە هەر سنوربەزاندنێکی یاسایی بەدوردەگرێت.

## ٢٧. بابەتەکانی سەرگەرمکردن

ئەمانە بابەتە خۆشبارییەکان، یان زاخاودانەوە، یان پشودانیشیان پێدەوترێت، ئەو نوسین‌و هێڵکارییانەن کە بۆ کاتبەسەربردن‌و خۆشییبەخشین‌و زاخاودانەوەی بیری خوێنەر بڵاودەکرێنەوەو جۆرێك لە وەرزشی زەینیی بەخوێنەر دەبەخشن، وەك: وشەگۆڕکێ، بورجەکان، نوکتە، مەتەڵ، پرسیارو وەڵام، ناسینەوەی وێنە،...تاد.

[453] بڕوانە: د. أ. بوریتسکي (١٩٩٠ : ٢١٣).

[454] د. مەغدید سەپان (٢٠٠٥ : ١٣٨).

[455] بڕوانە: www.de.wikipedia.org/wiki/feuilleton

## ٤/٢) چەشنە بابەتییەکان

ئەم جۆرە لە پەخشانی ڕۆژنامەنوسیی پشکی سەرەکیی تیایدا بۆ زانیارییەکانە، لەگەڵ زانیارییەکانیشدا بەبڕی دیاریکراو بیرو ڕاو لایەنی هونەرییو ئامادەیی خەڵك هەن بەجۆرێك کە هەموو ئەمانەی دوایی خزمەتی ڕاستەقینەییو سەلماندنی زانیارییە دەرخراوەکان بکەن، بۆیە تەوەرەی سەرەکییان و بنیاتی بنەڕەتییان "گشتڕوانین"ە، یاخود "بابەتیبون"ە، زات بابەتییانە بابەتەکانی دەنوسێت.

بابەت لە ئینگلیزییدا بە "Object" دەنوسرێت کە لە زاراوەی "Objectary" لاتینییەوە وەرگیراوە کە بەمانی وەستان لە بەردەم، یان کۆسپدانان دێتو لە کرداری "Jacere"ەوە هاتووە کەواتای (پێیدەگات)و "ob" بەواتای (دژ) دێت[٤٥٦]. بابەت بریتییە لە شتێك کە بونێکی لە جیهانی دەرەکییدا هەبێتو هەر شتێکیشە کە بەهەستەوەرەکان هەستی پێبکرێتو بخرێتە ژێر تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوەوەو چێوەیەکی دەرەکیی هەیەو سەربەخۆیانە لەبەردەم ئیرادەو هەستی مرۆییدا دەردەکەوێت[٤٥٧].

بابەتێتیی گوزارشتکەرە لە ئیرادەگەریی شتەکان وەك ئەوەی هەن، بێ تێکەڵکردنی هیچ ئارەزوو بەرژەوەندییو لایەنداریيەك، واتە پشت بە ڕاستییەکانو بنەما هۆشییەکان دەبەستێت، بەو مانایەی بابەتە مەعریفییەکان بونێکی ماديیان لە واقیعدا هەیەو بەدەرن لە خواستو ئیرادەگەریی مرۆیی[٤٥٨].

تایبەتمەندییە گشتییەکانی هونەرەکانی ئەم چەشنە لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورتدەکەینەوە:

---

[456] بڕوانە: د. عبدالوهاب المیسري (www.islamonline.net/ilo-arabic/dowalia/mafaheem-4).

[457] بڕوانە: ام الزین بنشیخة-المسکیني(www.enashir.com/blogs/tarik/8694).

[458] بڕوانە: (www.philo.most4host.com/dor.php).

١. بابەتەکان، ڕوداو دەیانسەپێنێت و جۆری ڕوداوەکەو سیاسەتی کەناڵەکە ئەو هونەرە دیاریدەکەن کە بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکەی پێدەنوسرێت.

٢. ئاراستەی بابەتەکان لە دەرەوەی نوسەرەوە بۆ ناوەوەی خەڵك دەڕوات و خستنەڕوی بابەتەکانە وەك ئەوەی لە واقیعدا هەن و ئاگادارکردنەوەی خەڵکە لە ڕاستییەکان. لە زۆرباردا پێداویستیی و بایەخی بوارەکانی دەرەوەی نوسەر بابەتگەلێك پێکدەهێنن و پرۆسەیەکە لێکدانەوەکانی وابەستەی فاکت و تێڕوانینە گشتییەکانی خەڵکن.

٣. لەم چەشنەدا زانیارییەکان زاڵن بەسەر بیرو ڕا کەسییەکاندا، پێشخانی ڕوداو و خودی ڕوداوەکان چاوگی بنەڕەتیی نوسینەکانن و لە زۆرباردا ئایدۆلۆژیاو ئایین و مەزهەب و نەتەوەو ڕەگەزو تەمەن و...تاد، ڕۆڵیان تیانابینن، دیارە لە هەندێك باریشدا بەپێی تیۆرە ڕۆژنامەنوسییەکان و پەیوەندیی ڕۆژنامە بە دەسەڵاتی سیاسییەوە سێبەری ئەوانە وەك تارماییەك لە ناو بابەتەکاندا دەردەکەون، بەڵام بەئاشکراو زەقیی نابینرێن.

٤. دواندنی هۆش و هۆشگەرایی لە بنەما دیارەکانی ئەم چەشنەن، نێرەر هەوڵدەدات بە زانیاریی و داتاو ئامارو سەرژمێریی و مێژوو ناوو کاتەکان و...تاد، وێنەیەکی ڕاستەقینەی ڕوداو یان بابەت پیشانبدات.

٥. لەم بابەتانەدا هاوتایی لە نێوان نێرەرو وەرگردا هەیە، نێرەر بە زمانێکی هاوڕێیانە زانیارییەکان بۆ وەرگر دەگێڕێتەوەو شێوازی پیشاندانی ڕاستەوخۆ دەگرێتەخۆی و کاریگەریی ناوەڕۆکی پەیامەکەو حوکم و بڕیاری کۆتایی بۆ وەرگر بەجێدەهێڵێت.

٦. هونەرەکانی ئەم چەشنە زۆر وابەستەی کاتی ڕودانی ڕوداوەکانن و هەوڵی بنەڕەتییان دەستپێشخەریی ڕۆژنامەنوسییەو تەریب بە ڕوداوەکان دەڕۆن و تازەیی و هەنوکەیی لە بنەما سەرەکییەکانیانن.

٧. نێرەر وەك خود نابێت بەبەشێك لە پرۆسە ڕۆژنامەنوسییەکەو لایەنی خودیی تێکەڵ بە بابەتەکان ناکات، ئەگەر ناویشی هات بۆ جەختکردن لەسەر بەهێزیی سەرچاوەی زانیارییەکان دێت ڕۆژنامە بەرپرسیارێتیی یەکەمی ئەم بابەتانە لە ئەستۆ دەگرێت، چونکە دەکەونە سنوری ڕاو سیاسەتی ڕۆژنامەوە.

٨. دارشتنی بابەتەکان وابەستەی پێوەرو ستایلی ئەو هونەرە دەبن کە وەك مۆدێلێك بۆ نوسینی بابەتێك دیاریدەکرێتو لە زۆربارردا وابەستەی شێوازی بەکارهێنراوی ڕۆژنامەکە دەبێت.

٩. نێرەر دەخوازێت گوزارشتکەربێت لە بیرو بابەتو ڕاستەقینەکانی هەستو بە پێوانە دیارو ئامادەکراوەکانی یاساو پەیرەوو دەستورەکانی ناو کۆمەڵ بیانخاتەڕو، لە نادیارەوە بیانکاتە دیارو لە گشتێکی دیاریکراوەوە بیانکاتە گشتێکی گشتگیر.

١٠. مەبەستی سەرەکیی ئەم چەشنە دروستکردنی کاریگەریی فرە ئاراستەیە کە تیایدا تەنها نێرەر نێرەرو وەرگر وەرگر نییە، بەڵکو وەرگریش ئامادەیی لە بابەتەکاندا هەیەو بەشێکە لە پرۆسەی پەیامگەریی نێرەر، بابەتەکان دور لە لێکدانەوەی کەسییو خودیی وەڵامگەلێکی بابەتییانەی بۆ ئەو پرسیارو پرسانە هەیە کە لە ناو خەڵکەوە گەڵاڵەیکردونو کۆیکردونەتەوە.

١١. نێرەر پەیرەویی شێوازبەندییو پەیرەوبەندیی جواننوسین دەکات، تا ئەو ئاستەی بابەتەکە نەبێتە بابەتێکی ئەدەبیی. ئەم بابەتانە ئەگەر داهێنانیش بن، داهێنانێکی ڕۆژنامەنوسییانەن کە ئامانجی سەرەکییان گەیاندنی بیرو زانیاریی ڕوداوە نەك توانستو کارامەیی ڕۆژنامەنوس.

١٢. نێرەر ناتوانێت جۆری پەیوەندییەکانی بابەتو بابەت، ڕوداوو ڕوداو، لە تێڕوانینی خۆیەوە پێکبهێنێت، بەڵکو پشت بە خودی ئەو ڕوداوانە دەبەستێت کە ڕویانداوە، نەك ئەوانەی کە ڕودەدەن، زانیارییەکان وەك

ئەوەی هەبون و ڕویانداوە ڕومالّدەکرێن، نەك وەك ئەوەی پێویستە هەبن‌و وا ڕوبدەن، بۆیە ئەم بابەتانە وەك سەرچاوەی بەهێزی ڕۆژنامەنوسیی لە میدیاکاندا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

١٣. نێرەر یان ڕاستتر دەزگای نێرەر لەگەلّ هەبونی ڕوداودا دەشێت بابەتی هەبێت، مەزاج‌و ئارەزوو خواستی کەسیی لە دیاریکردن‌و نوسینی بابەتەکاندا ڕۆلّ نابینن، ئەوەی ئەم پەیڕەوە دیاریدەکات ( سیاسەتی کەنالّ، ستراتیژی نەتەوەیی، ئاسایشی نەتەوەیی، بەرژەوەندییە بالاّکانی خەڵك)ن، نەك زاتییەتی خودی پەیامنێرەر.

ژانرەکانی ئەم چەشنەش بریتین لە:

## ١. هەوالّ (News)

هەوالّ* ڕاپۆرتێك یان گێڕانەوەی ڕوداوێکە ((هەوڵە ئەکادیمییەکان ڕاستیی ئەوەیان دووپتکردۆتەوە کە هەوالّ ڕاپۆرتێکە لە سەر ڕوداو، نەك خودی ڕوداو بێت))[٤٥٩]، بەشێوەیەك کە وەلاّمی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە لە زەینی خوێنەردا دەربارەی ڕوداوێك دروستدەبن‌و ئاگادارکردنەوەو ئاشناکردنی خوێنەرە بەو ڕوداوانەی لە دەوروبەریدا دەگوزەرێن.

ناساندنی هەوالّ بەپێی بوارو سەردەم‌و جۆری کۆمەڵگاو سیستمی سیاسیی‌و ئامانجی ڕۆژنامەگەریی، گۆڕانی بەسەردا دێت، بۆیە پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ هەوالّ سەخت‌و دژوارە، ((هەوالّ بەو ئیعتیبارەی وابەستەی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤە، بۆیە بەردەوام لە ناجێگیربووندایەو دەگۆڕێت، ئەم گۆڕانەشی وایلێدەکات کە ناساندن‌و دەرخستنی ئاسان نەبێت‌و فرەلێکدانەوە هەڵبگرێت))[٤٦٠].

---

* "هەوالّ" وەك زاراوە لە فەرهەنگ‌و ئەدەبیاتی کوردییدا بۆ پتر لە ١٥٥ساڵ بەر لەئێستا دەگەڕێتەوەو لە شیعرێکی (مستەفا بەگی کوردی)دا ئاماژەی پێکراوە، کە دەڵێت: (صەبا یارانی مەجلیس گەر هەوالّی من دەپرسن لێت          بڵێ کێشایە مەیخانە دووچاوی بێچووە عەیارێ )، بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا : ١٩٩٩: وانەی تایبەت).

[459] کۆرتیس ماکدۆگالّ (٢٠٠٥ : ٣٥).

[460] د. حسني نصر، د. سناء عبدالرحمن (٢٠٠٤ : ٤٧).

(فۆر تكليف) دەڵێت: ((هەواڵ بزواندن‌و دەرچونە لە هەر شتێكی باو، بەو مانایەی ئەگەر سەگێك پەلاماری پیاوێكی دا، نابێتە هەواڵ‌و، بەڵام ئەگەر پیاوێك پەلاماری سەگێكی دا، ئەوە هەواڵە))[٤٦١]، (نیل ماكنیل** ) دەڵێت: (( هەواڵ كۆكردنەوەی فاكتەكانە لەسەر ڕوداوێكی هەنوكەیی كە بەلای خوێنەرانەوە گرنگە))[٤٦٢]، (گیراڵد جۆنسۆن) دەنوسێت: (( هەواڵ وەسف یان ڕاپۆرتێكی ئەو ڕوداوانەیە كە بەلای خوێنەرەوە گرنگن))[٤٦٣]، (فرایزەر بۆند) یش دەنوسێت: (( هەواڵ ڕاپۆرتێكی كاتییە لەسەر شتێكی سەرنجڕاكێشەر بەلای مرۆڤەوەو هەواڵێكی باشیش ئەو هەواڵەیە كەبەلای زۆرترین خوێنەرەوە بەهاداربێت))[٤٦٤]، (د. عبداللطیف حمزة)یش دەڵێت: (( هەواڵ ئەو نوێییە كە خوێنەران بەشەوقەوەن بۆ زانینی))[٤٦٥]، (د. عبدالستار جواد)یش دەڵێت: (( هەواڵ ئەو شتەیە كە لەوەوبەر نایزانین، یان لە بیرمان كردووە، یان پێشتر لێی تێنەگەیشتوین))[٤٦٦]، (ماكدوجل)یش پێی وایە: (( هەواڵ نوسینێكە لەسەر ڕوداوێكی دیاریكراو كە بەلای ڕۆژنامەكەوە وایە ئامرازێكە بۆ بەدەستهێنانی قازانجێكی مادیی بۆ ڕۆژنامەكە))[٤٦٧]، (فارنس فالین)یش بەو جۆرە ڕۆژنامەنوسییە ناوی دەبات كە ئەركی گواستنەوەی زانیارییە دیاریكراوەكانە بەشێوەیەكی مولتەزیمانە، دەربارەی ڕوداوێك كە بەشێوەیەكی چڕوپڕو بەخێرایی بگەیەنرێتە خوێنەر[٤٦٨]، (جلال الدین الحمامصي)یش، هەواڵ بەوە دەزانێت كە هەر شتێكە شیاوی بڵاوكردنەوە بێت بۆ خەڵك[٤٦٩]، (د. أدیب خضور)یش، هەواڵ بەوە دەزانێت كە ڕوداوە وردو هاوسەنگ‌و نوێكان كە بەلای خەڵكەوە بایەخدارن پێشكەشبكات[٤٧٠]، یان دەوترێت: (( هەواڵ گوزارشتە لە واقیع، بەڵام هەر واقیعێكیش ناتوانرێ بە

---

[461] هوف جورج (١٩٧٣: ٢).

** ماوەیەكی زۆر جێگری سەرنوسەری ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز بووە بۆ كاروباری دەرەوە.

[462] نیل ماكنیل (١٩٥٥: ١١٢).

[463] هوف جورج (١٩٧٣: ٢).

[464] F. Fraser Bond (1973 : 78).

[465] د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨أ : ٥٥).

[466] د. عبدالستار جواد (٢٠٠٢: ٤٣).

[467] د. قیس الیاسري (١٩٨٧ : ١٢).

[468] بڕوانە: د. أدیب خضور (١٩٨٢ : ١٥).

[469] بڕوانە: جلال الدین الحمامصي (١٩٩٣ : ٢٣).

[470] بڕوانە: تیسیر أبو عرجە (١٩٩٩ : ١٢).

هەواڵ دابنرێت))[٤٧١]، (د. محمد الدروبي)یش، هەواڵ بە ترۆپکی کاری ڕۆژنامەنوسیی دەزانێت[٤٧٢]، کۆمسیۆنی (میك براید)یش کۆمەڵە سیفاتێك بۆ هەواڵ دیاریدەکات وەك (( هەواڵ وا دەخوازێت ڕاستەوخۆ دوای ڕودانی ڕوداوێك بڵاوبکرێتەوە، جێی بایەخپێدانی گشتیی بێت، هەڵگری زانیاریگەلێکی پێشتر نەزانراوبێت، پەیوەندیی بە ژیانی ڕۆژانەوە هەبێت، زانیارییەکە تیابێت بەسودبێت بۆ هەڵوێست وەرگرتن یان بڕیاردان))[٤٧٣]، (چارلس دانا)یش دەڵێت: (( هەواڵ هەر شتێکە کە جێی بایەخپێدانی جەماوەرێکی زۆربێتو سەرنجیان بە ئاراستەی ڕوداوەکەدا بگۆڕێت))[٤٧٤]، (چیلتۆن بوش) مامۆستا لە زانکۆی ستانفۆرد دەڵێت: (( ڕاپۆرتێکە دەربارەی ڕوداوێك بەشێوەیەك کە خوێنەر بەئاسانیی تێیبگات))[٤٧٥]، (ولزلی‌و کامبل)یش دەڵێن: هەواڵ ڕاپۆرتێکە لەسەر بیرێك یان ڕوداوێك یان ململانێیەك و خاسییەتی هەنوکەیی هەیە[٤٧٦]. چەندین

---

471 ڕەزا حاجی ئابادی (٢٠٠٥ : ٢٣).

472 بڕوانە: د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :١١٣).

473 د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :١١٤).

474 د. ابراهيم امام (١٩٩١ : ٩٥).

475 سەرچاوەی پێشوو.

476 سەرچاوەی پێشوو.

* وەك ئەو پێناسانەی گۆڤاری (کولییر)ی ئەمریکایی کردونی، بڕوانە: (د. ابراهيم امام :١٩٩١ : ٩٦)، یان ئەو پێناسانەی لە کتێبی هونەری هەواڵنوسین لە ئێزگە نێودەوڵەتییەکاندا خراونەتەڕو، بڕوانە: (د. عبدالنبي خزعل: ٢٠٠٣: ١١٧)، هەروەها وەك ئەم پێناسانەی کە لە کتێبی (روزنامەنگاری، د. کاظم معتمد نژاد:٢٠٠٣: ١٧-١٨)و کتێبی (نەریتی ڕۆژنامەوانی، فریبا سەیاد-د. عەلی ئەکبەر فەرهەنگی:٢٠٠٦: ٢٢)دا بڵاوکراونەتەوە، وەك:

لیل ئاسپنسەری نوسەری کتێبی (هەواڵنوسین): هەواڵ بەلەخۆگری هەر کردەوەو هزرێکی ڕاستەقینە دەناسێنێت کە بۆ ژمارەیەکی زۆر لەخوێنەران، سەرنجراکێش بێت.

و. ج. بلایەر لە کتێبی (ڕۆژنامەنوسیی)دا دەڵێت: هەواڵ هەر بابەتێکی هەنوکەییە کە بەهۆی سەرنجراکێشبوونییەوەو بەهۆی بایەخداربوونییەوە لەلایەن خوێنەران، لەچاپەمەنییەکاندا بڵاودەکرێتەوە.

نێس. مۆلی نوسەری کتێبی (هەواڵ پەیداکردن)، هەواڵ بەگواستنەوەی ڕاستەقینەی ڕووداوە گرنگەکان دادەنێت کە لەڕۆژنامەکانی جیهاندا چاپ دەکرێن‌و دەبێتەجێی بایەخی خوێنەران.

میشیل. ڤی. چارنلی: لە کتێبی (هەواڵنێری)یدا دەنوسێت: هەواڵ، ڕاپۆرتی گونجاو، پوختەو وردەکاری ڕووداوێکە نەك خودی ڕووداوەکە.

ئەریك. سی. هۆپ ڤۆد: هەواڵ بەڕاپۆرتی ڕووداوێك دادەنێت بەومانایەی کە جێی بایەخی هەمووان بێت.

ڕۆژە کلۆس لە کتێبی (هەواڵەکان)دا، هەواڵ بە گوێزانەوەیەکی سادەو بێگەردی ڕووداوەکانی ئێستا پێناسە دەکات.

پێناسەی تریش بۆ هەواڵ کراون*، دواپێناسەیەکیش کە لەبارەی هەواڵەوە هەیە، ئەوەیە کە هەواڵ دەبێت چەند بەهایەکی هەواڵیی تێدابێت[٤٧٧]، وەك : (تازەیی، نزیکیی، دەرکەوتن و ناوبانگ، ململانێ، ئەنجامەکان، بایەخی مرۆیی، ڕووبەڕووبەنەوە، ناباویی، کارەسات،...تاد)[٤٧٨]، لێرەوە (جۆن هۆهنبرگ) دەڵێت: ((ناکرێت هەواڵ لە پێناسەیەکی دیاریکراودا سنورداربکرێت، بۆیە دەشێت بڵێین هێندەی ژمارەی ڕۆژنامەنوسان پێناسەیش بۆ هەواڵ هەیە))[٤٧٩].کەواتە هەواڵ ڕوماڵکردنی ڕوداوێکە کە تازە ڕویداوە یان تازە بەئێمەگەیشتووە بەمەرجێك بەهای هەواڵیی خۆی لەدەستنەدابێت و بەوردیی و دروستیی و بابەتییەوە بێلایەنانە*، بەزمانێکی سادەو بێتێکەڵکردنی بیروبۆچوونی ڕۆژنامە یان نوسەری هەواڵەکە دەگوێزرێتەوە بۆ خوێنەر. هەواڵ بەگشتیی لە دوو بەش پێکدێت، پێشەکیی یان سەرەتا (Lead)، لەگەڵ بۆدی یان ناوەڕۆك (Body)، ئەوەی بەسەرەکیی دەزانرێت لە هەواڵدا پێشەکییەکەیەتی[٤٨٠]، هەواڵ بە پلەی یەکەم

---

فەرناندۆ ترۆ لە کتێبی (هەواڵ)دا، دەنوسێت: هەواڵ گوزارشتە لەبڵاوکردنەوەیەکی ئۆرگانیزەکراوانەی پرۆسێسی ڕووداوو ئاگاداریی و زانستە مرۆییەکان و گوێزانەوەی بیروباوەڕو رایگشتییە.

[477] بڕوانە: أمور خبر برون مرزی (١٩٩٧ : ٥).

[478] بڕوانە: مالکوڵم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ١٤٦).

[479] جۆن هۆهنبرگ (١٩٦٠ : ٦٧).

* هەرچەندە باس لە چەمکی بێلایەنیی لە هەواڵدا دەکرێت، بەڵام لەبەکارهێنانی زاراوەکاندا جۆرێك لە لایەنداریی دروستدەبێت. بڕوانە: (هەڤاڵ ئەبوبەکر: ٢٠٠٥: ٦).

** مەبەست لە تازەیی ڕوداو بە پلەی یەکەم تازەیی ڕودانی ڕوداوەکە نییە، بەڵکو تازەیی زانیارییەکانی ناو هەواڵەکەیە بەلای خوێنەرەوە، واتە دەشێت ڕوداوێك کە دەیان ساڵ لەمەوبەر ڕویدابێت و ئێستا بە ئێمە بگات، هەواڵێکی تازە بێت،

بڕوانە: (نعیم بدیعی، حسین قندی: ٢٠٠١ : ١٩). بە ئاراستەیەکی تریش دەوترێت: ((گرنگترین مەبەست لەهەواڵ، گەیاندنی ڕوداوێکە کە لە ڕاستیدا ڕویدابێ یان بەم نزیکانە ڕوبدات))، بڕوانە: (د. مەغدید سەپان: (٢٠٠٥ : ١٥). ئەو ڕوداوانەی ڕوياننەداوە دەشێت بکرێنە هەواڵ و پێش ڕودانیان بڵاوبکرێنەوە، بەمەرجێك یەکێك لە وشە یان دەستەواژەکانی گومانکردنیان بخرێتە پێشەوە، وەك (ئەگەری ئەوە هەیە، وابڕیارە، واچاوەڕواندەکرێت،...تاد) چونکە ئەگەری ڕودانیان لە سەداسەدنییە. بڕوانە: (هەڤاڵ ئەبوبەکر: ٢٠٠٥: ٥).

[480] بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة (أ١٩٥٨ : ٨٤). جۆرەکانی پێشەکیی هەواڵیش بۆ پتر لە شانزدە جۆر دابەشدەبن، بڕوانە: (کۆرتیس ماکدۆگاڵ: ٢٠٠٥ : ١٨٠).

وابەستەی بابەتێتیی‌و تازەیی** و خێرایی بڵاوکردنەوەیەتی[٤٨١]، کەواتە وابەستەی کاتە، هەر ئەم ڕەگەزە دیارەی هەواڵ وادەکات کە چەند ژانرێکی ڕۆژنامەنوسیی لە ژێر چەتری خۆیدا کۆبکاتەوە، کە لە هەموویاندا ڕەگەزی کات یان هەنوکەیی، زاڵترین بنەماو ڕەگەزیان دەبن و بریتین لە:

ا. سەردێڕی هەواڵ:

نوسینی پێشەکی هەواڵە بەشێوەیەکی کورت‌و چڕوپڕو لە زۆربادا سەرەتای ئەم پێشەکییە دەبێتە ناونیشانی هەواڵەکەش، لە ڕۆژنامەدا لە لاپەڕە (یەك)دا دەنوسرێت‌و درێژەی هەواڵەکە بۆ لاپەڕەکانی ناوەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەوەی زۆرترین هەواڵ‌و هەمەڕەنگترین هەواڵ لە دەروازەی ڕۆژنامەکەدا کە لاپەڕە (یەك)ە، دابنرێت[٤٨٢].

ب. کورتەی هەواڵ:

هەواڵێکە کە بەهۆی نزیکبونەوەی دەرچونی ڕۆژنامەکەو وابەستەبون بە دیزاینی ڕۆژنامەکەو بایەخی خودی هەواڵەکەوە، کورتدەکرێتەوە، تا لە بۆکسی یەکێك لە گوێچکەکانی لاپەڕە (یەك)، یان هەر ستونێکی لاپەڕە (یەك)دا بڵاوبکرێتەوە. یان بەو هەواڵەیش دەوترێت کە لەبەر کەمبایەخپێدانی ڕۆژنامەکە بە ناوەڕۆکەکەی تەنها بەکورتیی دایدەڕێژێتەوە.

پ. وێنەی هەواڵدەر (فۆتۆنیوز):

وێنەیەکی فۆتۆگرافیی ڕاستەقینەیە کە بەشێوەیەك گیراوە بزاوتن‌و بابەتێتیی تێدا بەرجەستەبووەو لە توانستیدا هەیە واتا ببەخشێت بێئەوەی بۆ دەقەکان بگەڕێینەوە، ئەمەش وابەستەی پەیوەندیی نێوان ڕوداو–وێنەگر–خوێنەر، دەبێتەوە[٤٨٣].

ت. هەواڵە چاوەڕوانکراوەکان:

ئەو ڕوداوانەن کە ئەگەری ڕودانیان هەیە لە ئاییندەیەکی نزیکدا، لەسەر بنەمای پێشینەی ڕوداو یان گۆڕانەکان، دەنوسرێنەوە.

---

[481] بڕوانە: د. عبدالنبي خزعل( ٢٠٠٣: ٥١).

[482] بڕوانە: (هەڤاڵ ئەبوبەکر: ١٩٩٧ : ٥٥).

[483] بڕوانە: د. محمد عبدالحمید، د. السید بهنسي (٢٠٠٤ : ٣٥).

ج. کاپشن (Caption):

ئەو دێرە نوسینەیە کە لە سەر یان لە ژێر وێنەیەکدا دەنوسرێت و ناوەڕۆکی وێنەکە ڕوندەکاتەوە[٤٨٤]، لەزۆربارددا وا بەپەسەند دەزانرێت کە خودی هەواڵنوسەکە یان وێنەگرە ڕۆژنامەوانییەکە ئەم دێرە بۆ هەر وێنەیەکی دیاریکراو بنوسێت، تا کاریگەرو بەهێزبێت، ((ئەسۆشیتدپرێس ئامۆژگاریی پەیامنێرەکانی دەکات کە خۆیان کاپشنەکان بنوسن تا سەرنجڕاکێشترو گونجاوترو بەهێزتربێت و هەڵگری ناوەڕۆکی وێنە هەواڵییەکەبێت))[٤٨٥].

ح. لێدوان لەسەر هەواڵ:

ڕۆژنامەنوس ڕوداوێکی دیاریکراو یان هەواڵێکی بڵاوکراوە دەخاتەڕو، دواتر لە بەشی دووەمی بابەتەکەیدا بەپشت بەستن بەو ڕاستییانەی لەبەردەستیدان بەپەرەگرافێك یان چەند پەرەگرافێك، ڕوداو یان هەواڵەکە ڕوندەکاتەوەو قسەی لەسەر دەکات[٤٨٦].

خ. بەدواداچونی هەواڵ:

بریتییە لەو هەواڵەی کە لەپاش هەواڵێکی بڵاوکراوەوە دێت و درێژە یان وردەکارییەکانی هەواڵی یەکەم دەخاتەڕو.

چ. ڕاپۆرتەهەواڵ:

پێشەکییەکەی وەك هەر هەواڵێکی ئاسایی دەنوسرێت، بەڵام بۆدییەکەی درێژدەکرێتەوە تا ئەو وردەکارییانەی لە پێشەکیی هەواڵەکەدا هەن و بوار بۆ شیکردنەوەو دەرخستنی زیاتریان نییە، لە بۆدی ڕاپۆرتە هەواڵەکەدا بخرێنە ڕو. ڕاپۆرتی هەواڵ، گێڕانەوەو تۆمارکردن و ڕومالکردنی ڕوداوێکە بەشێوەیەکی بابەتییانەو دور لە سەرنج و خواستی ڕاپۆرتنوسەکە، (( ڕاپۆرت بەمانی ئەو هەموو زانیارییە دورو درێژانە کە لە بارەی هەواڵێکەوە دەنوسرێن))[٤٨٧].

---

[484] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ١٤٤).

[485] Melvin Mencher (2001: 331).

[486] بڕوانە: (هەڤاڵ ئەبوبەکر: ١٩٩٧ : ٦٦).

[487] د. فاروق عەلی عومەر (٢٠٠٥ : ١٣).

د. چیرۆکەهەواڵ:

لە فۆڕمدا وەك ڕاپۆرتەهەواڵ وایە، بەڵام بەزمانێکی ئەدەبییانە دادەڕێژرێتو ناوەڕۆکێکی هەستبزوێنانەی هەیەو ڕۆژنامەنوس یان خۆی دەبێتە گێڕەرەوەی ڕوداوە ڕاستەقینە هەنوکەییەکە، یاخود کەسەکانی ناو ڕوداوەکە دەکاتە سەرچاوەی زانیارییە بڵاوکراوەکانی، یان هەردوو شێوازەکە تێکەڵدەکات. لەچیرۆکەهەواڵدا زانیاریی ڕاستەقینە هەن، کاتو کەسو شوێنو ڕوداوەکان ڕاستەقینەنو وابەستەی کاتی بڵاوبونەوە دەبێتو بەتێپەڕبونی کات بەسەردەچێت، پەیڕەوی ڕاستەوخۆ باسکردنی ڕوداوەکە دەکرێت تیایدا[٤٨٨]، (ئەلبێرت ل. هستەر) دەڵێت: (( ئەم هونەرە هونەرێکە کە دەتوانێت ڕێگا بۆ ڕۆژنامەنوسان خۆشبکات لێیەوە ئەو مەبەستو بابەتانە دەرببڕن کە بەشێوەکانی تری هەواڵ ئاسان نابێت دەری ببڕن، ئەوەش لە ڕێی شاردنەوەی ماناگەلێك لەناو دێڕەکاندا، بەجۆرێك کە خوێنەری وریا بتوانێت زانیارییە شاراوەکانی بدۆزێتەوە، ئەمەش ڕێگایەکە کە زۆرێك لە ڕۆژنامەنوسان لەو وڵاتانەدا پیادەی دەکەن کە ئازادیی گوزارشتکردنو ڕۆژنامەگەریی نین))[٤٨٩].

ر. لێکۆڵینەوەی هەواڵیی:

ڕوداوێکە لە چەند شوێنو لایەنێکەوە ڕوماڵدەکرێت تا بە هەموویان دیدێکی تەواوکارییانەمان لەسەر خودی ئەو ڕوداوە پێشکەشبکەن.

ڕ. هەواڵی خێرا (Flash news):

هەندێك جاریش بەهەواڵێکی گەرم (Hard news)یش ناودەبرێت، ڕوماڵکردنی هەواڵییانەی ڕوداوێکە کە گەرماوگەرم تۆماردەکرێتو هێشتا هەموو وردەکارییەکانی دەرنەکەوتون، بەڵام بەمەبەستی دەستخستنی دەستپێشخەرییەکی هەواڵیی بڵاودەکرێتەوەو لەزۆرباردا بۆدی هەواڵەکە هێشتا گەلاڵەنەبووە[٤٩٠].

---

[488] بڕوانە: Melvin Mencher (2001:161).

[489] ألبرت ل. هستر (١٩٨٨: ١٠٠).

[490] بڕوانە: وائل العاني (١٩٨٠ : ١٢).

ز. هەواڵی درێژ:
ئەو ڕووداوەیە کە لە پرۆسەی ڕوماڵکردنیدا زانیاریی‌و وردەکارییەکانی هێندە زۆرن، هەواڵنوس ناتوانێت کورتبڕیی تیابکات، بۆیە دواجار هەواڵێکی درێژی لە ڕوی ناوەڕۆک‌و قەبارەوە لێدەردەچێت.
ژ. هەواڵی بەردەوام:
ئەو هەواڵەیە کە لەبەر بایەخی ڕوداوەکەی ناتوانرێت کۆتایی پێبهێنرێت‌و بەکراوەیی دەهێڵرێتەوە‌و لە ژمارەکانی دواتردا درێژەی پێدەدرێت[491].
س. شریتی هەواڵەکان:
ئەو زنجیرە هەواڵانەن کە لە بەر بایەخیان لە شریتێکدا بە پانیی ڕۆژنامەکە بەدوای یەکدا دێن‌و هەر هەواڵێکیان بەدێڕێکی کورتی واتابەخش بڵاودەکرێنەوە‌و درێژەکانیان دەچنە لاپەڕەکانی ناوەوە.
ش. شیکردنەوەی هەواڵ:
خستنەڕوی هەواڵێک‌و شیکردنەوەی ڕەگەزەکانییەتی بەجۆرێک کە بابەتییانە زانیاریی زیاتری لەسەر بخرێتەڕو، تا ئەوەی خوێنەر بەتەواویی ئاشنای ڕوداوە بنەڕەتییەکە دەبێت، لە پرۆسەی شیکردنەوەکەدا بەڵگەی باوەڕپێکراوو دۆکۆمێنت‌و ئامارو ژمارە دەهێنرێنەوە.
ع. ستونەهەواڵ:
هەواڵێکە لە ستونێکدا نوسەری ستونەکە ڕایدەگەیەنێت‌و ئاوێزانی سەرنج‌و تێڕوانینەکانی خۆی دەدات.

غ. هەواڵی کاریکاتێریی:
ڕوداوێکی ڕاستەقینەیە لە شێوەی کاریکاتێرێکی بابەتیانەدا دەخرێتەڕو، تا پرۆسەی گەیاندنی بەخوێنەر خێراترو کاریگەرتربکات.

---
[491] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو( ١٣).

ف. هەواڵ لە ڕێی وەرگرەکانەوە:

ئەو ڕوداوانەن کە لەلایەن خوێنەرانی ڕۆژنامەیەکەوە ڕەوانەی ڕۆژنامەکە دەکرێن‌و پاش دڵنیابون‌و داڕشتنەوەیان لە ڕۆژنامەکەدا بڵاودەکرێنەوەو زۆرجار ئەو خوێنەرانە خۆیان دەبنە سەرچاوەی هەواڵەکان.

ق. ڕیکلامە هەواڵ:

بڵاوکردنەوەی هەواڵی هاتنە بازاڕی کاڵایەکە، یان گۆڕان لە نرخ‌و جۆرو چۆنێتیی بەرهەمێکە کە بەشێوەی هەواڵ دادەبەزێت‌و لە بەرامبەریدا بەپێی سیستمی ڕیکلام ڕۆژنامەکە پارە وەردەگرێت.

ڤ. ئاگانامە هەواڵییەکان:

ئەو ئاگانامەو ئاگادارییانەن کە بەشێوەی هەواڵ لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێنەوە، وەك ئاگادارکردنەوەی خوێندکاران بۆ دەستپێکردنەوەی ساڵی نوێ.

ك. هەواڵنامە:

هەواڵگەلێکن کە بەدوای یەکدا لە لاپەڕەی هەواڵەکاندا بڵاودەکرێنەوەو بەپێی بایەخی هەواڵەکان‌و سیاسەتی ڕۆژنامەکە ڕیزبەنددەکرێن[٤٩٢].

گ. دەستپێشخەریی هەواڵیی:

بە هەواڵێك دەوترێت کە تەنها ڕۆژنامەوانێك یان کەناڵێك توانیبێتی بەخێرایی‌و بەر لە کەناڵەکانی تر ڕوماڵی بکات‌و بڵاویبکاتەوە، بەشی هەرە زۆری ئەم هونەرە لە کات‌و شوێنە نەزانراوەکاندا دەستدەخرێن، یان لە لێدوانە تایبەتەکانداو پشت بە درك‌و توانست‌و لێوەشاوەیی ڕۆژنامەوان دەبەستێت لە ڕوماڵکردنیدا.

---

[492] بڕوانە: د. حسني نصر، د. سناء عبدالرحمن (٢٠٠٤ : ٢٨).

## ٢. ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی (Report)

بریتییە لە کۆکردنەوەی کۆمەڵێك ڕاستیی لەسەر ڕوداوێك یان بابەتێك بێئەوەی ڕۆژنامەنوسەکە پێ لەسەر ڕای خۆی دابگرێت تیایدا، بەگشتیی لە ڕاپۆرتدا پەیوەندیی لە نێوان بەندی نێوان فاکتو زانیارییەکاندا دەدۆزرێنەوە کە لەسەرەتای ڕوداوێکدا وادەردەکەون پەیوەندییان نەبێت، ((بەڵام لە ڕاستییدا بەشێکی گەورە لە پەیکەری گشتیی ڕوداوەکە پێکدەهێنن))[٤٩٣]. مەرجی سەرەکیی ڕاپۆرت سادەنوسینو ئاشکرایی و ڕونییە لە نوسینداو بەکارهێنانی ڕستەی کورتو درێژنەکردنەوەی فرێزەکانە[٤٩٤]، یاخود ڕوهەڵماڵینە لە ڕوی ئەو زانیارییانەی کە ڕوکەشانە ناتوانرێت ببینرێن، سەرچاوەی سەرەکیی کۆکردنەوەی کەرەستەکانی ڕاپۆرتیش بریتی دەبن لە ( بەڵگەنامەو تۆمارکراوەکان، چاوپێکەوتنەکان، تێبینییە کەسییەکان)[٤٩٥]. بەگشتیی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی گێڕانەوەی سەرنجو تێبینییو وردەکارییەکانی ڕوداوێکی دیاریکراوە کە لەسەر بنەمای بابەتیی کۆدەکرێنەوەو دادەڕێژرێن[٤٩٦]. تایبەتمەندییەکی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی ئەوەیە کە مەرج نییە بەتەواویی وابەستەی ڕەگەزی هەنوکەیی بێت، هەر ئەمەش وادەکات کە زۆر بابەتی بەنرخو بایەخدارو سەرنجڕاکێش لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگاکان و لە ڕابردوو کەلتورو فۆلکلۆرو خواستەکانی ئایندەیان بکرێنە بابەتی ڕاپۆرتەکان[٤٩٧]. ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی هونەرێکە دەکەوێتە نێوان هەواڵو لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنوسییەوەو تیایدا کۆمەڵێك زانیاریی دەربارەی ڕوداوێك پێشکەشدەکرێنو بەهرەمەندیی ڕاپۆرتنوسەکە ڕۆڵی لە شێوازی سەرکەوتویی

---

[493] مالکۆلم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ٣).

[494] بڕوانە: د. فاروق أبو زيد (١٩٨٣ : ١٣٧).

[495] مالکۆلم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ٧).

[496] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٣٢٠).

[497] بڕوانە: د. محمود فهمي (١٩٦٤ : ١٢١).

بابەتەکەدا دەبێت[498]، هەندێك سەرچاوەی تر ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی بەشێوە نوسینێك ناودەبەن کە تیایدا وێنەو هەواڵ تێکەڵ دەکرێن‌و نوسینەکان دیمەنی ڕوداوەکان لە هزرماندا دروستدەکەن‌و ((دەشێ خودی ڕاپۆرتنوس ئامادەیی ڕاستەقینەی لە شوێنی ڕوداوەکەدا هەبێت))[499]، (ئەحمەدی تەوەکولی)یش دەڵێت: ((ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی ئەرکی چارەسەرکردنی کێشەکان نییە، بەڵکو خستنەڕوی کێشەو گرفت‌و ڕاستییەکانە بۆ بەردەم ڕای گشتیی))[500]، ئەگەر بمانەوێت لە بایەخی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی بگەین پێویستە بۆ ڕاپۆرتە ڕۆژنامەنوسییەکانی پرۆسەی ئازادیی عیراق /٢٠٠٣بگەڕێینەوە، لەم جەنگەدا بۆیەکەمجار لە مێژوی ڕۆژنامەگەریی جیهاندا ڕوماڵکردنێکی بەرفراوانانەی خێرای ڕوداوەکان لەڕێی ڕاپۆرتە ڕۆژنامەنوسییەکانەوە دەبینین[501].

## ٣. لێدوانی ڕۆژنامەگەریی (Statement)

وتەیەك، یان بەیاننامەیەك، یان نوسراوێك، یان لێدوان، یان وتارێکە کە لەلایەن کەسێکی بەرپرس یان سەرچاوەیەکی بەرپرس یان وتەبێژێکی ڕەسمییەوە ڕادەگەیەندرێت‌و ڕۆژنامەکان وابەستەی ناوەڕۆکی ئەو دەقە دەبن کە ڕاگەیەندراوە، ئیتر لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەگەرییدا بێت، یان لە بریفینگێك، یان لە بەیاننامەیەکی چاپکراودا دابەشبکرێت.

---

498 بڕوانە: د. فاروق أبو زید، د. ليلى عبدالمجيد (٢٠٠٠ : ٢٠٥).

499 د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :١٦٤).

500 بڕوانە: ئەحمەد تەوکلی، و: مەجید ساڵح (www.kurdistannet.org).

501 بڕوانە: Ralph D. Berenger (2004 : xxvii).

## ٤. بەدواداچون ( Commentary)

گەڵاڵەکردن و کۆکردنەوەی زانیاریی زیاترە بۆ خوێنەر دەربارەی هەواڵێك یان ڕوداوێك یان بابەتێکی پێشتر بڵاوکراوە کە پێشتر لایەنە شاراوەکانی ڕوننەکراونەتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش سود لە سەرچاوە جیاجیاکانی زانیاریی و کنەوپشکنین و لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنوسیی و دۆکۆمێنت و لێکەوتەو ئاسەواری ڕوداوەکان وەردەگیرێت و بەردەوامیی بە ڕوماڵکردنی ڕوداوەکانیش دەبەخشێت.

## ٥. گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسیی* (Interview)

ئەم هونەرە بە چاوپێکەوتن، یان دیدار، یان هەڤپەیڤینیش ناودەبرێت. هاوولاتیان ناتوانن بچنە شوێنی ڕوداوەکانەوە، ڕۆژنامەوانان دەچن و چاوپێکەتن لەگەڵ شایەتحاڵ و زەرەرمەندو قوربانیان و لایەنە پەیوەندیدارەکان بە ڕوداوەکانەوە دەکەن و چاویان بەوکەسانە دەکەوێت کە جۆرێك وابەستەییان لەگەڵ ڕوداوەکەدا هەیە، ئیدی وابەستەبونێکی ڕاستەوخۆبێت یان ناڕاستەوخۆ[٥٠٢]. ئەم هونەرە بنیات یان میکانیزمی نوسینی زۆرێك لە هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانی ترە، پرۆسەی پرسیارە کراوەو داخراوو گریمانەو گومان و ڕامانەکانی خەڵکە، کە ڕۆژنامەنوس زیرەکانە وەڵامگەلی پێویستیان لە سەرزاری ئەو کەسانەوە بۆ دەدۆزێتەوە کە یان نزیکن لە ڕوداوەکەوە یان بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندییان بەڕوداوەکەوە هەیە، یان هێنانە قسەی ئەو کەسانەیە کە کەسایەتییان یان پلەو پایەو بەرپرسیارێتییان کاریگەریی لەسەر ژیانی خەڵك هەیە، بەشێوەیەك لە شێوەکان. لەزۆرباریشدا (( ڕۆژنامەنوس جڵەوی گفتوگۆکە دەگرێت و کۆنترۆڵی

---

* گفتوگۆکردنمان بەکارهێناوە نەك دیدار، چونکە دیدار بەشێکی پرۆسەی گفتوگۆکردنی ڕاستەوخۆ یان بەرامبەرە، بەڵام گفتوگۆ هەموو پەیوەندیگرتنێکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەخۆ، بەرامبەرو نا بەرامبەر دەگرێتەوەو دەشێ لە ڕێی نامە یان تەلەفۆن، یان هەر ئامرازێکی تریشەوە بەڕێوەبچێت.

502 بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة ( ١٩٥٨ أ : ٢٧٨).

دەکاتو پرسیارو تەوەرەکان دیاریدەکات))[503]. ئەم پرۆسەیە لەزۆرباردا بە پرسیارو وەڵامی میکانیکییانەی نێوان گفتوگۆکەرو گفتوگۆلەگەڵداکراودا بەڕێوەدەچێت، بەڵام ((پرۆسەکە تەنها لە پرسیارو وەڵامی بێگیاندا کۆنابێتەوە))[504]، گفتوگۆکردن زیاترە لەوەی پرسیارو وەڵام بێت[505]، بەڵکو پێویستی بەوروژاندنو ئاگایی ڕۆژنامەوان هەیە کە بچێتە ناو تەوەرەکانەوەو پەیوەندییەکی ئۆرگانیی لەگەڵ وەڵامەکاندا پێکبهێنێتو پرسیاری هەنوکەییو زیندو دروستبکاتو زانیارییو ڕاو سەرنجی پێویست لەکاتی پێویستی دیدارەکەدا بخاتەڕو، بەڵام دیارە هیچ گفتوگۆیەکیش بێ پرسیارکردن نابێت، پرسیار لە گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسییدا بۆ ئەم جۆرانە دابەشدەبێتو ڕۆژنامەنوس بەکارامەیی خۆی بەکاریاندێنێت: پرسیاری ( دەستپێکردن یان کردنەوە، بنەڕەتیی، هەواڵیی، بیروڕا، تاقیکردنەوە، زانیاریی، ڕاڤەکاریی، ڕاکێشانی بەرامبەر، ئاسانکاریی، شێوازبەندیی، ڕێکخراو)[506]، بەڵام پرسیارو ڕادەربڕینەکانی گفتوگۆکەر لەخۆوە نینو وابەستەی مەزاجو ئارەزوی سەرپێییانەی خۆی نین، بەڵکو پەیوەستو هەڵقوڵاوی ئەو بابەتانەن کە پێویستە وتووێژیان لەسەر بکرێتو پرۆسەیەکە بۆ (( گەڕانو پشکنینی هزرو خستنەڕوی زانیارییو ڕاوبۆچونو هەڵوێستەکانی بەرامبەر))[507]، بەشێوەیەکی بابەتییانەی وەها کە تازەیی بداتە ئەو زانیارییانەی لەو گفتوگۆیە دەکەونەوە با بابەتەکەیش کۆن یان پێشتر قسە لەسەر کراویش بێت، ئەم پرۆسەیەش لەم هاوکێشەیەوە دێتە بەرهەم:

ڕۆژنامەوان(گفتوگۆکەر) + بابەت + ئامراز (پرسیارو ڕاو سەرنجو ئامێرەکانی تۆمارکردن) + گفتوگۆلەگەڵکراو+ ئامانج = گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسیی

---

[503] د. عبدالعزيز شرف (٢٠٠٠ : ٢١٠).

[504] د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :٢٣٣).

[505] بڕوانە: مالكۆلم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ١٣).

[506] بڕوانە: د. محمود أدهم ( ١٩٨٢ :١٧١).

[507] سەرچاوەی پێشوو (٢٣٣).

میکانیزمی سەرەکیی ئەم هونەرە وتوویژکردنە لەگەڵ کەسێکی بەرامبەردا بەمەبەستی دەستخستنی زانیاریی و هەواڵی نویٚ، یان ڕونکردنەوەو تیڕوانینی دیاریکراو، یان دەربارەی ژیانی کەسێك و دەرخستنی لایەنەکانی ژیانی کەسەکەیە[508]. بەگشتیی گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسیی لەلایەن ڕۆژنامەوانێکەوە دەبێت بەلاَم دەشێت لەلایەن چەند ڕۆژنامەوانێکیشەوە بکرێت، وەك ئەوەی لە بریفینگ و کۆنگرە ڕۆژنامەگەرییەکاندا دەکرێت[509]، (سوزان دان)یش دەڵێت: ((هەڤپەیڤین بریتییە لە کۆمەڵێك پرسیاری ئامانجدار لە کەسێك (یان چەند کەسێك) بۆ وەدەست خستنی زانیاری و بیرو ڕاو تۆمارکردنێکی پێویستی وەلاَمەکان، بەمەبەستی بلاَوکردنەوەیان))[510]، یان دەوترێت: ((گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسیی گرنگترین هونەرەکانی ڕۆژنامەنوسییە کە لێیەوە کەسێتیی و لایەنی سایکۆلۆژیی و باکگراوندی زانیارییەکان و ئەدای کەسێکی بەرامبەر دەخرێتەبەر سەنگی مەحەکی ڕۆژنامەنوس و دواتر خوێنەرانەوە))[511]، لە گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسییدا . بیرو ئایدۆلۆژیا و هەڵوێست و کەسێتیی گفتوگۆلەگەڵداکراو دەردەکەوێت و یەکێکە لەو هونەرانەی چێژو خۆشیی و سودو زانیاریی دەداتە خوێنەر[512] و ، گفتوگۆکەر نمایندەی خەڵکانێکە کە پرسیارێکیان هەیەو ناتوانن بەڕاستەخۆیی ئاراستەی ئەو کەسە گفتوگۆلەگەڵداکراوەی بکەن، دەشێت هەر گفتوگۆیەك وەلاَمدەرەوەی زۆرترین پرسیارەکانی خوێنەربێت لەو تەوەرو بابەت و کەسەی بۆ گفتوگۆکە ئامادەکراوە. ئەم هونەرە زیندوێتیش دەداتە لاپەڕەی ڕۆژنامە، ڕایەڵەی بەستنەوەی ڕۆژنامەیە بە کەسەکان و کەس و ڕۆژنامەکەش بە خوێنەرانەوە. ئەو کەرەستەو زانیارییانەی لە گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسییەوە دەردەخرێن، زانیاریگەلێکن کە دەشێت بۆ زۆر هونەری

---

[508] بڕوانە:.F. Fraser Bond (1973 : 109)

[509] بڕوانە: د. فاروق ابو زید، د. لیلی عبدالمجید (٢٠٠٠ : ١٣٩).

[510] سوزان دان (٢٠٠١ : ١٣).

[511] د. محمود ساعتچی (١٩٩٥ : ٧).

[512] بڕوانە: د. کاظم معتمد نژاد (٢٠٠٤ : ١٨٧).

ڕۆژنامەنوسیی تریش بەکاربێن یان بەکاربهێنرێنەوە، وەك ئەوەی ڕۆژنامەوانێك لە پەراوێزی ئەو گفتوگۆیانەی دەیکات، گۆشەو ستونی پڕزانیاریی دەنوسێت، یاخود بەدواداچون‌و لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنوسیی لە سەر زانیارییە دەستکەوتووەکان دەکات[٥١٣].

## ٦. ئەنکێتەکردن

هونەرێکە لە نێوان ڕاپرسیی‌و گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسییدا، ڕۆژنامەنوس پرسیارێکی دیاریکراو ئاراستەی چەند کەسێکی شارەزاو پسپۆڕو ئەزموندار لە بوارێکی تایبەتدا دەکات‌و ئەوانیش دور لەڕای کەسیی خۆیان زانستییانە وەڵامدەدەنەوەو تێگەیشتنی بابەتییانەی خوێنەر لە بابەتێکی دیاریکراودا فەراهەمدەکەن.

## ٧. ڕیپۆرتاژ (Reportage)

لە هەندێك سەرچاوەشدا بە لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنوسییش ناودەبرێت، بریتییە لە هونەرێکی تەواوکارییانەی ڕۆژنامەنوسیی کە تیایدا گێڕانەوەو گفتوگۆو لێدوان‌و گەڕانەوە بۆ ئەرشیڤ‌و گواستنەوە لە نێوان چەند کەسێك‌و چەند شوێنێکدا بەشداردەبن‌و پێویستی بەتوانستێکی نوسینی ئەزمونگەرانە هەیە، مەبەست پێی لێکۆڵینەوەیە لە بابەت یان ڕوداوێك لە هەموو ڕووەکانییەوە، بەبەشدارییپێکردنی هەموو ئەو کەس‌و شوێن‌و کات‌و زانیاریی‌و ڕوداوانەی کە هەریەك لە لایەکەوە پەیوەندییان بە بابەت یان دۆز یان ڕوداوە بنەڕەتییەکەوە هەیە. ئەم هونەرە بەبابەتیترین هونەری ڕۆژنامەنوسیی دەزانرێت[٥١٤]، چونکە ڕیپۆرتاژنوس تەنها تاوانبار ناهێنێت بەڵکو تاوانلێکراوو شایەت‌و دادگاو پۆلیس‌و هەموو

---

[513] بڕوانە: روبیرت ل. هیلییرد (٢٠٠٣ : ٢٥٣).

[514] بڕوانە: د. فاروق ابو زید، د. لیلی عبدالمجید (٢٠٠٠ : ١٨٣).

پەیوەستەکانی تر بەبابەتەکەوە زیرەکانە دەخاتە خزمەتی ڕایەڵەی سەرەکیی بابەتەکەوە.
ڕیپۆرتاژ وابەستەی هەنوکەیی ڕوداوەکان نابێت[٥١٥]، ڕیپۆرتاژنوس دەتوانێت بەکارامەیی خۆی هەر شتێك بکاتە کەرەستەیەکی بەهاداری ڕیپۆرتاژلەسەرکراو، بەپێی ئەو میتۆدی گەڕانو کنەکردنو پشکنینو دۆزینەوەو توێژینەوەو شیکردنەوانەی کە دواجار لەگەڵ ناونیشانو ناونیشانە لاوەکییەکانو وێنە زیندووەکاندا لێکۆڵینەوەکە دەکەنە لێکۆڵینەوەیەکی شیاوی سەرنجڕاکێشەرانەی وەها کە جێی بایەخی هەر خوێنەرێك بێت.
ڕیپۆرتاژ بەو هونەرە دەوترێت کە هەواڵو دۆزو ڕاو سەرنجو ئایدیاکان بەشێوەیەك لە باسکردنو نوسینو درێژەپێدانی بابەتییانەو بەپشتبەستن بە ئامارو زانیارییەکانو ڕا جیاجیاکان دادەڕێژرێت، بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا ڕاستیگەلێکی وا بخەنە بەر دیدی خوێنەر تابتوانێت بڕیارێك بدات یان چارەسەرێك یان هەڵوێستەکردنو ڕادەربڕینێك لەسەر بابەتەکە بکات[٥١٦]، یان دەوترێت: (( ڕیپۆرتاژ لەسەر بنەمای ئەزمون یان بیرێك یان گرفتوکێشەو دۆزێکی دیاریکراو دادەمەزرێتو ڕیپۆرتاژنوس دەستدەکات بە کۆکردنەوەی هەر بابەتو مادەیەك کە بەڕاستەوخۆیی یان ناڕاستەوخۆیی پەیوەندییان بە بابەتە سەرەکییەکەوە هەبێت))[٥١٧]. لە ڕیپۆرتاژدا شیکردنەوەو ڕاڤەکردنو گوزارشتکردنو پرۆسەی هەواڵگەرییو شێوازی ئەدەبیی کۆدەبنەوە، تا بە هەموویان بابەتێك پێکبهێنن کە کاریگەرییەکەی هێندەی کاریگەریی هەموو هونەرەکانی ترە، بۆیە زۆرجار دەوترێت کارامەیی ڕۆژنامەوان لە ڕیپۆرتاژدا دەردەکەوێت نەك لە هونەرەکانی تردا[٥١٨]، چونکە ئەم هونەرە پێویستی

---

[515] بڕوانە: د. عبداللطیف حمزة ( ١٩٥٨ أ : ٣١٢).

[516] بڕوانە:د. عبدالعزیز شرف (٢٠٠٠ : ٣١٢).

[517] د. فاروق أبو زید، د. لیلی عبدالمجید (٢٠٠٠ : ١٨٢).

[518] بڕوانە: د. محمد الدروبي (١٩٩٦ :٢١٥).

بەتوانستی بۆنکردنی زۆرو گومانو رامانو پرسیارکردنو زیرەکیی و وردیی و بێلایەنیی و بێباکیی ونەفەسدرێژیی و ڕاستگۆیی و باکگراوندی زانیاریی و ئاشنایەتیی سەرچاوەکانو...تاد، هەیە، (( ئەگەر ڕیپۆرتاژ بۆ ڕۆژنامەوان بایەخداربێت، ئەوا بۆ ڕۆژنامەکان بایەخدارترو بەهادارترەو یەکێکە لەو هونەرانەی کەلە ئەمڕۆی ڕۆژنامەوانییدا ڕۆژنامەکان کێبڕکێی ڕۆژانە لەسەر بڵاوکردنەوەی دەکەن))[519] و (( ڕیپۆرتاژنوس لەرێی ئەم هونەرەوە زیندوێتیی بە جەستەی میدیاکان دەبەخشێت))[520]، ڕیپۆرتاژ لەو شوێنەوە دەستپێدەکات کە هەواڵ کۆتایی دێت[521]، بۆیە هەواڵ بەسەرچاوەیەکی گرنگی بابەتە ڕیپۆرتاژلەسەرکراوەکان دادەنرێت، ڕیپۆرتاژ زانستە قورسو ڕوداوە سەختو تاوانەگەورەو کارەساتە مەزنەکانو کەسایەتییە ناودارەکان و بەرهەمە ئەدەبییە باڵاکان و داهێنانە ناوازەکان بەجۆرێك بۆ خوێنەری ڕۆژنامەکان ئاساندەکات کە نەك هەر تێیبگەن بەڵکو هەڵوێستو بڕیاریشی لەسەربدەن، (( ئەرکی سەرەکیی و بنەڕەتیی ڕیپۆرتاژ، گەڕانە بەدوای ڕاستییەکاندا و خستنەڕویەتی بە شێوازێکی بێلایەنانەی هونەرییانەی بابەتییانە))[522].

ئەگەر هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانی تر وەکو خواردنێك وابنو بەپێپەڕبونی کات خراپ ببن، ئەوا ڕیپۆرتاژ وەکو دراوێکی ئاڵتونیی وایە کە هەمیشە بەهاوبایەخی خۆی هەیەو لە هەر شوێنێك بڵاوبێتەوە بەهێند وەردەگیرێت[523]، لە ئەمڕۆشدا گەشەی تەکنۆلۆژیاو سیستمی جیهانگەریی و کرانەوەی سنورەکان وایانکردووە، ئەم هونەرە لە چوارچێوەیەکی داخراوی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوەوە بپەڕێتەوە بۆ پانتایی هەموو زەوی و ڕیپۆرتاژە بەهادارەکانی وەك: ڕیپۆرتاژی پۆلیسیی، یان دەرخستنی گەندەڵیی، یان فەزاییح، یان دەرخستنی ڕاستییەکان، یان

---

[519] د. محمود أدهم (١٩٨٥ : ٥).

[520] د. أ. بوريتسكي (١٩٩٠ : ١٣٥).

[521] بڕوانە: د. إبراهيم إمام ( ١٩٩١: ١٣٨).

[522] د. محمود فهمي (١٩٦٤ : ١١٧).

[523] بڕوانە: Melvin Mencher (2001:161).

دەرخستنی نهێنییە هەواڵگرییەکان لە ئاستێکی جیهانیدا بڵاودەکرێنەوە، بۆیە لە دنیای ئەمڕۆدا (( پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیارییەکان لە وردترین و ئاڵۆزترینی ئەو بنەمایانە دەبن کە هەر بڕیارێکی سیاسیی وابەستەیان دەبێت))[524] و ڕیپۆرتاژیش دەبێتە ئەو هونەرە لوتکەیەی کە لەم پرۆسەیەدا ڕۆڵی ئەکتیڤی دەبێت.

لە ڕیپۆرتاژدا کۆك و ناکۆکەکان، تەباو دژەکان، دۆست و دوژمن، دەسەڵاتدارو بێدەسەلات، داگیرکەرو داگیرکراو، تیرۆریست و قوربانییەکان و ...تاد، وەك تانوپۆی ڕایەڵەکانی بابەتێکی ڕۆژنامەنوسیی کۆدەکرێنەوە، بۆ ئەوەی جەستەیەکی سێ ڕەهەندیی ئاشکراو دیار بخەنە بەر دیدی خوێنەر.

## ٨. دیمەن (View)

بریتییە لە وێنەیەکی فۆتۆگرافیی یان هێڵکاریی یان نەخشەو دۆکۆمێنتی وێنەگیراو یان کۆپیکراو یان پۆستەر یان وێنەی بەیانیی و کێرڤ و ئامڕازە یاریدەدەرەکانی تری نوسین لە ڕۆژنامەنوسییدا کە لە ڕێیانەوە دەق و واتا تەواودەکرێن و جوانیی و هاوسەنگیی و شیکردنەوەو ڕاستگۆییش دەبەخشنە بابەتە نوسراوەکان و ئەم جۆرانە دەگرێتەوە:

ا. وێنەی فۆتۆگرافیی (Photographs):

بەیەکێك لە ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی ڕۆژنامەنوسیی دادەنرێت و زیندوێتیی و بڕواو جوانیی و کاملبوون دەبەخشێتە بابەتە نوسراوەکان[525]. ئیدراك خاڵی بەیەکگەیشتنی مەعریفەیە لەگەڵ واقیعدا، وێنەی فۆتۆگرافیی لە ڕۆژنامەدا جگە لەوەی ئیدراك و تێگەیشتنی خوێنەر زیاددەکات، لەهەمان کاتیشدا زانیارییە وەرگیراوەکانی ئاوێتەی واقیع دەکات[526]، چەندین لێکۆڵینەوەی زانستیی لەسەر

---

[524] د. مؤيد عبدالجبار الحديثي (٢٠٠٢ : ١٥٨).

[525] بڕوانە: د. ممدوح حماده (٢٠٠٠ : ٣٣).

[526] بڕوانە: د. محمد عبدالحميد، د. السيد بهنسي (٢٠٠٤ : ١٧).

کاریگەریی وێنەی ڕۆژنامەنوسیی یان ئەوەی ئەمڕۆ بە (فۆتۆجۆرنالیزم) ناودەبرێت، کراون، هەموو ئەوانە جەخت لەسەر بایەخی گەورەو کاریگەری دیاری وێنە لەسەر هەستو هۆشی خوێنەر دەکەنەوە، تائەوەی لە ئەمڕۆدا دەشێ لە نیوە زیاتری پانتایی ڕۆژنامەکان بەوێنە پڕبکرێنەوە[٥٢٧]، خەسڵەتی بنەڕەتیی وێنەی ڕۆژنامەنوسیی ئەوەیە کە لە گۆشەنیگایەکی وەهاوە گیرابێت توانای دروستکردنەوەی یان وێناکردنەوەی دینامیکیانە لە هزری خوێنەردا دروستبکاتەوەو ببێتە تەواوکەری بابەتە سەرەکییەکە، (ماریان واشتەر) دەڵێت: (( هەندێك لاپەڕە دەگەنە شوێنی خۆیانو ڕاتدەگرنو کێشت دەکەن بەلای خۆیاندا، ئەمەش بۆ ئەو وێنانە دەگەڕێتەوە کە لە لاپەڕەکەدا ئامادەییان هەیەو پەیوەندیی ئۆرگانیی و گیانیی لەگەڵ خوێنەردا پێکدەهێنن))[٥٢٨]، وێنە ڕۆژنامەگەرییەکان لەگەڵ بەشێکی زۆری هونەرەکاندا دەردەکەون تائەوەی دەبنە بەشێك لە بنیاتی هەر هونەرێك لەو هونەرانەی وێنە لەگەڵیاندا دادەبەزێت.

ئەم جۆرەش دابەشدەبێت بۆ :

- وێنەی زیندو.
- وێنەی ئەرشیڤی.
- وێنەی ڤیدیۆچاپ.
- وێنەی وەرگیراو.
- وێنەی کۆپیکراو.
- وێنەی دەستیی.
- وێنەی زەینی.
- وێنەی کۆلاژکراو.
- دەستنوس.
- ئۆریگناڵ.
- دۆکۆمێنت.

---

[527] بڕوانە: www.en.wikipedia.org/wiki/photograph

[528] Marina Wachter (1988 : 122).

ب. هونەرە هێڵکارییەکان (Graphic Arts):

هەموو ئەو وێنەو هێڵکاریی‌و نوسین‌و چاپکراوانە دەگرێتەوە کە لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێنەوە، ئەوانەیان کە پەیوەندییان بە وێنەی ڕۆژنامەنوسییەوە هەیە بریتی دەبن لە:

- پۆرترێت: وێنەیەکی کەسییە زیاتر ڕوکارەکانی دەموچاوی ئەو کەسەی تیادەردەخرێت‌و بەدەستدەکێشرێت[٥٢٩].
- سکێچ: وێنەیەکی دەستکردی کەسێك یان ڕوداوێك یان شوێنێکی دیاریکراوە، زۆرجار وێنەی دادگایکردنە داخراوەکان بەم جۆرە دەکێشرێن‌و هونەرمەندێکی شێوەکار بە تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی ڕوداوەکە لەسەر بنەمای وەسف‌و توانستی زەینیی خۆی وێنەی دەکێشێت[٥٣٠].
- وێنەی بەیانی (Graphics): هێڵکارییەکە ئامارو ڕێژەو ژمارەکان ئاشکرادەکات‌و دەخاتەڕو.
- زەخرەفە (Adornment).
- نەخشە (Map): بڵاوکردنەوەی نەخشەی سیاسیی یان ئیداریی یان ...تاد، شوێنێك پیشاندەدات.
- مۆتیف (Motif): وێنەکردنێکی هێڵکارییانەی سەر کارێکی هونەریی یان ئەدەبیی یان مۆسیقییە[٥٣١].
- کێرڤ (Curve): هێڵکارییەکی ماتماتیکیانەیە، ئاستی بەرزبونەوە یان دابەزینی دوو پۆلی سەرەکیی بابەتێك دەردەخات[٥٣٢].

---

[529] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٧٥٢).

[530] سەرچاوەی پێشوو (٨٨٣).

[531] سەرچاوەی پێشوو (٦٣٢).

[532] سەرچاوەی پێشوو ( ٢٤٩).

- هێد (Head): بەبەشی سەرەوەی لاپەڕەی یەکەمی هەر ڕۆژنامەیەك دەوترێت‌و تیایدا ئالأی ڕۆژنامەکەو دروشم‌و ناساندنەکەی‌و هەردوو گوێچکەی ڕۆژنامەکەو گەردنی ڕۆژنامەکە دادەنرێت‌و بە"سەری ڕۆژنامە" ناودەبرێت کە گوزارشتکەری دیاری کەسێتیی ڕۆژنامەیە[٥٣٣].
- ئالأ (Flag): ئالأی ڕۆژنامەیە بە لۆگۆی ڕۆژنامەش ناودەبرێت، ناوی ڕۆژنامەکەیە بەو شێوە نوسینە جێگیرەی کە بەئاسانیی ڕێ بەگۆڕینی نادرێت‌و لە زۆربارد‌ا بەخەتی دەست دەنوسرێت‌و ناوی ڕۆژنامەکە دەکاتە وێنەیەکی وەها کە ببێتە چاوی ڕۆژنامەکە، ئالأ لەگەڵ ناسنامەی ڕۆژنامەکەو دروشمی ڕۆژنامەکەدا پلێتی ناونیشان (Nameplate) پێکدەهێنن کە بەبەشی سەرەکیی هێدی ڕۆژنامە دەزانرێت.
- گوێچکەی ڕۆژنامە (Ears): هەر ڕۆژنامەیەك لە هێدەکەیدا گوێچکەی لای چەپ‌و گوێچکەی لای ڕاستی هەیە، کە دەکەونە سەرەتاو کۆتایی ئالأی ڕۆژنامەکەوەو تیایدا ڕیکلامێکی بەهادار یان هەواڵێکی گرنگ کە لە دواساتەکانی دەرچونی ڕۆژنامەدا دەگاتە ڕۆژنامە، یان ئەندێکسی لاپەڕەکانی ناوەوە بلأودەکرێنەوە.
- گەردن (Dateline): بەو شریتە دەوترێت کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی هێدی ڕۆژنامەو لە ژێر ئالأی ڕۆژنامەکەدا دادەنرێت‌و تیایدا ژمارەی ڕۆژنامەکەو ڕۆژو مانگ‌و ساڵ‌و خولی دەرچون‌و ئەو شوێنەی ڕۆژنامەکە دەردەکات‌و هەندێکجار نرخەکەیشی بە زمانێك یان چەند زمانێك تێدادەنوسرێت. ئەم گەردنە لەلاپەڕەی ناوەوەدا دەچێتە جێی

---

[533] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٤٥٣).

هێدو تەنها بچوکراوەی لۆگۆی ڕۆژنامەکەو ژمارەی لاپەڕەو ژمارەی ڕۆژنامەکەو ڕۆژو مانگ‌و ساڵ‌و خولی دەرچونەکەی‌و هەندێکجار تایبەتمەندیی‌و بواری لاپەڕەکەیشی تێدادەنوسرێت.

## ٩. ناونیشان (Title)

ناونیشان لە ڕۆژنامەدا بەو تاکەدێڕە یان کۆمەڵە دێڕە دیاریکراوە دەوترێت کە دەکەوێتە پێش هەر بابەتێکی ڕۆژنامەنوسییەوەو هەڵگری ناوەڕۆکی بابەتەکەی خۆی دەبێت[٥٣٤]، سەربەخۆیی‌و کەسێتیی‌و دیاریکراویی‌و تایبەتمەندیی دەداتە هەر بابەتێك، پوختەی گرنگترین بەشە پێکهێنەرەکانی بابەتێکە بۆیە بەکەمترین وشەو زۆرترین مانا ناوەڕۆکی بابەتەکە دەردەبڕێت‌و خوێنەر بۆ خوێندنەوەی ڕادەکێشێت[٥٣٥]. ((سەرنجڕاکێشیی‌و کورتبڕیی‌و سادەیی‌و ڕونیی‌و تیشکدانەوەو بابەتیبون‌و تەرکیزو گوزارشتکەریی، لە دیارترین بنەماکانی ناونیشانن))[٥٣٦]، یان دەوترێت: ناونیشان پوختەی گرنگترین مەبەستەکانی بابەتێکە کە بەشێوەیەکی وردو ڕۆشن خرابێتەڕو[٥٣٧]، زاراوەگەلێکی تێدا بەکاردەهێنرێت کە لای خوێنەر دیارو ئاشکران[٥٣٨]، هەموو ئەو بابەتانەی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاودەکرێنەوە، جگە لەسەردێڕی هەواڵەکان بە ناونیشانێك جیادەکرێنەوەو تایبەتمەندیی بەهەر بابەتێکی ڕۆژنامەنوسییش دەبەخشێت[٥٣٩]، ((ڕۆژنامەنوسیی بایەخگەلێکی گەورە لەسەر ناونیشان دادەنێت‌و بەڕۆحی بابەتەکان‌و زانیارییە دڵنیاکان‌و نوێیەتیی

---

[534] بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٨أ : ١٢٩).

[535] بڕوانە: ڕەزا حاجی ئابادی (٢٠٠٤ : ١٦٣).

[536] د. محمود فهمي (١٩٦٤ : ٨٣).

[537] بڕوانە: ڕەزا حاجی ئابادی (٢٠٠٥ : ٦٩).

[538] بڕوانە: میلفن مینتشر (١٩٩٢ : ١٠٠).

[539] بڕوانە: فریبا سەیاد-د. عەلی ئەکبەر فەرهەنگی (٢٠٠٦: ٤٥).

بابەت‌و تایبەتمەندێتیی، دادەنرێت))[540]، ناونیشانەکان چوار ئەرکدەبینن: بابەتەکان کورتدەکەنەوە، بەپێی بایەخیان پلە بۆ بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان دادەنێن، ڕەگەزێکی ئاشکراو دیاریان لە نەخشی لاپەڕەکاندا دەبێت، سەرنجی تەماشاکارانی ڕۆژنامەکە ڕادەکێشن‌و پەلکێشیان دەکەن ببنە خوێنەر[541].
ناونیشانە ڕۆژنامەنوسییەکانیش دابەشدەبن بۆ:

ا. مانشێت: ئەو ڕستە کورتە پیت گەورەیەیە کە لەلاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەدا دەنوسرێت[542]، ئەم زاراوەیە لە وشەی (Manchette)ی فەرەنسییەوە هاتووە کە بەمانای سەرقۆڵی کراس دێت[543]، مەبەست پێی دەرخستن‌و ئاشکراییەو دەربارەی ڕوداو یان بابەتێکی گرنگ‌و بایەخداری پلە یەك بەلای ڕۆژنامەکەوە، دەنوسرێت.

مانشێت، ناونیشانی سەرەکیی ڕۆژنامەیە کە لەبەشی سەرەوەی لاپەڕە یەکدا لەژێر هێدی ڕۆژنامەدا دەنوسرێت‌و لە زۆربارد‌ا گوزارشتکەردەبێت لە هەموو لاپەڕەکە[544]، هەندێکجاریش لاپەڕەی یەکەم بەتەواویی بۆ مانشێتەکان تەرخاندەکرێت‌و ناوەڕۆکەکانیان دەبرێنە لاپەڕەکانی ناوەوە.

ب. ناونیشانی سەرەکیی: هەندێکجاریش بە تایتڵ یان سەردێڕیش ناودەبرێت[545]، ناونیشانی هەر بابەتێکی دیاریکراوە لە ڕۆژنامەدا، واتە هەر بابەتێك هەڵگری ناونیشانێکی تایبەت بەخۆیەتی کە هەڵگری بیرو مەبەست‌و ئامانج‌و ناوەڕۆکەکەیەتی، یەکەم وێستگەیەکە کە خوێنەر دەچێتە سەری‌و دەروازەی گەیاندنی خوێنەرە بە بابەتە نوسراوەکان، (( هەرچەندە لە سەرەتای هەر بابەتێکدا دەنوسرێت، بەڵام لە زۆربارد‌ا دواهەمین نوسینێکە کە ڕۆژنامەنوس

---

[540] د. سامي ذبيان (١٩٨٧ : ٢٠٤).

[541] بڕوانە: مالکۆڵم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ١٢٣).

[542] بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧: ٦٤).

[543] بڕوانە: د. سامي ذبيان (١٩٨٧ : ١٥٥).

[544] بڕوانە: د.كرم شلبي (١٩٩٤ : ١٠٢٣).

[545] بڕوانە: مالکۆڵم ئێف. مالێتی (٢٠٠٣ : ١٦٣).

له دوای تەواوبونی بابەتەکەی دەینوسێت))[546]، ناونیشانی بابەت خوێنەر ڕادەکێشێت و بە کورتبڕییەکی بابەتییانە هاوکاریی خوێنەر دەکات بۆ هەڵبژاردنی ئەو بابەتەی گەرەکییەتی، یان خواستییەتی بیخوێنێتەوەو کەسێتییەکی تایبەتیش بەڕۆژنامەکە دەبەخشێت.
قەبارەی فۆنتی ناونیشانی سەرەکیی هەر بابەتێك لە قەبارەی فۆنتی مانشێتی ڕۆژنامەکە بچوکترە، بەڵام لە ناونیشانە لاوەکییەکان گەورەترە.

پ. ناونیشانی لاوەکیی (Subhead): ئەو دێڕ یان دێڕانەیە، کە بە قەبارەیەکی بچوکتر لە ناونیشانی سەرەکیی و گەورەتر لە قەبارەی فۆنتی بابەتەکە لە نێوان بڕگەکانی بابەتێکی دیاریکراودا دەنوسرێت، بەمەبەستی کەمکردنەوەی بێزاریی خوێنەرو ڕێ خۆشکردن بۆ ڕێنیشاندانی خوێنەر بەو پەرەگراف و بڕگەیەی کە خواستی خوێندنەوەی دەکات و لایەنێکی جوانکارییش دەبەخشێتە دیزاینی بابەتەکە[547]، (( ناونیشانە لاوەکییەکان ئەو ناونیشانانەن کە لەدوای ناونیشانی سەرەکیی بابەتێکەوە دەنوسرێت، کورتە ناونیشانێکن ئاماژە بۆ گرنگترین ناوەڕۆکە پێکهێنەرەکانی بابەتێك دەکەن))[548]، ئەم جۆرە ناونیشانە لە بابەت و وتارە درێژەکان و ڕیپۆرتاژو چیرۆکە ڕۆژنامەوانییەکاندا زیاتر دەردەکەوێت[549] و هەناسەیەك بۆ پشودان و بواری گواستنەوە لە بیرۆکەیەك بۆ بیرۆکەیەکی تر دەداتە خوێنەر.

---

[546] د. حسني نصر، د. سناء عبدالرحمن (٢٠٠٤ : ٢٠٠).

[547] بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ :٦٥).

[548] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٩٢٤).

[549] بڕوانە: د. محمود فهمي (١٩٦٤ : ٨٤).

### ١٠. ڕاڤەکردن (Explanation)

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەو هەواڵو بابەتو ڕوداوانەیە کە لە بەر ئاڵۆزیی خودی ناوەڕۆکەکانیان بێت، یان لەبەر سەختیی ململانێو ناکۆکییەکانی ڕوداوەکانیان بێت، لێتێگەیشتنیان لای خوێنەر ئاسان نابێت[550]، بۆیە لەڕێی ئەم هونەرەوە کە بواری گەڕانەوە بۆ ڕابردوو خوێندنەوەی پێشخانی ڕوداوو دۆزینەوەی جۆری پەیوەندییەکان پەیڕەودەکات، لایەنە شاراوەو ئاڵۆزەکان شیدەکاتەوە.

### ١١. چیڕویدا (Events)

ئەم هونەرە لە زمانی عەرەبییدا بە (ماجریات) ناسراوەو لە دوو بەش پێکهاتووە (چی) لەگەڵ (ڕویدا)، کە پێکەوە گوزارشت لە گواستنەوەی ئەو ڕوداوانە دەکەن کە لەکۆڕو کۆبوونەوە گرنگەکاندا ڕودەدەن[551]، ئەوەی ماجەرا لەوانی تر جیادەکاتەوە ئەوەیە، ماجەرا تایبەتیترەو لایەنەکانی ڕوداوەکە لای ڕۆژنامەوانەکە نادیارنو زیاتر لە ڕوداوە هەنوکەییو گەرمەکان دەدوێت، زیاتر جەخت لەسەر دەستخستنی وەڵامی پرسیاری (چی) دەکاتەوەو هەموو پرسیارەکانی تر دەخاتە خزمەتی ئەم پرسیارەوە.

### ١٢. پامفلێت (Pamphlet)

بڵاوکراوە، یان نامیلکەیەکی بچوك، یان کوڕاسەیەك یان کەتەلۆگێکە کە لەگەڵ ڕۆژنامەکەدا دەردەچێت، بابەتێك یان ڕوداوێك یان لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆژنامەوانیی یان ڕیکلامی کۆمپانیا بازرگانییەکانی سەربەخۆیانە تێدا بڵاودەکرێتەوەو بەبەشێك لە ڕۆژنامەکە ئەژماردەکرێت[552].

---

[550] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٣٤٦).

[551] بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة ( ١٩٥٨ أ : ٣١٩).

[552] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٧٠٩).

پامفلێت بنەمای دروستبونو دەرکەوتنی ئەو جۆرە ڕۆژنامەیەی ئەمڕۆیە کە بە ڕۆژنامەی (میترۆ) دەناسرێتو قەبارەی A4و بەچەند لاپەڕەیەك هەواڵو ڕیکلامەکان بڵاودەکاتەوەو بەخۆڕایی دابەشدەکرێتو سەرەتا لە وڵاتانی ئەسکەندەناڤییەوە بە تایبەتیش لە سویدو نەرویجەوە دەرکەوتووەو ئێستا خەریکە تەواوی کایە ڕۆژنامەنوسییەکانی ئەوروپا داگیردەکات.

## ١٣. دروشم (Slogan)

ڕستە یان گوزارشتێکی کورتە، هەندێکجار لە ڕۆژنامەکاندا لە جێی مانشێتدا دەنوسرێت، لە هەندێك باریشدا دەخرێتە سەر لۆگۆی ڕۆژنامەکەوە، ڕێنمایی خەڵك دەکات بۆ پرۆسەیەك یان هەڵمەتێك یان ڕوداوو بۆنەیەکی دیاریکراو، یاخود هانی خوێنەر دەدات بەو ئاراستەیەدا بڕوات کە لەو دروشمەدا ئاماژەی پێدەکرێت، یاخود بایەخپێدانی ڕوداوێکە کە ڕۆژنامەکە لە هەر بابەتێکی تری ناو ڕۆژنامەکە بەگرنگتری دەزانێت، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا بەوە لە مانشێت یان ناونیشان جیادەکرێتەوە کە بابەتو ناوەڕۆکی ڕاستەخۆی لە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەدا نییە، (( هەندێکجار بۆ پروپاگەندەو هەندێکجار بۆ بەرزکردنەوەی گیانیی نەتەوایەتیی، یان حیزبیی یان مرۆیی،...تاد، بەکاردەهێنرێت))[٥٥٣].

## ١٤. وەرگێڕان (Translation)

هونەرو پرۆسەی گواستنەوەی واتای دیمەنو وێنەو بابەتو داتایەکی زەینیی یان نوسراوە[٥٥٤] بە هەموو پێکهاتەکانی دەقە بنەڕەتییەکەیەوە، یان لێوەرگرتنی بەشێکی دەقێك یان لێدوانێکی دیاریکراو بۆ سەر ئەو زمانەی ڕۆژنامەکەی پێدەردەچێتو بەشێکی بنەڕەتییو گەورەی پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی پێکدەهێنێت، یاخود (( وەرگێڕان بابەتێکە بۆ بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامەدا و

---

[553] بڕوانە: د.کرم شلبي (١٩٩٤ : ٨٨٦).

[554] سەرچاوەی پێشوو (٩٧٢).

پەیڕەوی شێوازێکی ساناو بەکارهێنانی وشەگەلێکی وا دەکات کە لای خوێنەران ئاسانبن بۆ تێگەیشتن))[555] و جیهانی دەرەوە بە ڕۆژنامەکەو خوێنەریش بە جیهانی دەرەوە دەبەستێتەوەو تایبەتمەندییەکی جۆریی دەبەخشێتە ڕۆژنامە.
هەموو وەرگێڕانێك لە ڕۆژنامەنوسییدا دەقاودەق وەرناگیرێت، بەڵکو بەپێی سیاسەتی ڕۆژنامەکە لە هەندێکباردا وا پێویست دەکات بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخی سروشتیی ڕوداوەکانی ناو دەقە وەرگیراوەکە، بەتایبەتیی لە هەواڵو ژانرەکانی هەواڵدا، واتە هەواڵەکە بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخی زانیاریی (ئەو دۆخەیە کە هێشتا ڕوداوەکەی تێدا نەبووەتە هەواڵ)، تا سەرلەنوێ بنوسرێتەوە، یاخود بۆی زیادبکرێت، یاخود پەیوەندیی بۆ دروستبکرێت، یان دەشکرێت وەکو خۆی بڵاوبکرێتەوە ئەگەر جۆری هەواڵەکە ڕێی دا، بەڵام زۆربەی وتارو لێدوانو دیدارو ڕیپۆرتاژەکان و چەند هونەرێکی تریش دەکرێت وەکو خۆیان وەربگێڕدرێن.

## ١٥. خزمەتگوزاریی ڕۆژنامەنوسیی

بەو زانیارییانە دەوترێت کەوەك خزمەتێك پێشکەش بەخوێنەران دەکرێنو لە زۆر ڕۆژنامەدا ڕوبەرێکی دیاریان بۆ تەرخاندەکرێت، نمونەی ئەم هونەرەش بڵاوکردنەوەی کاتی گەشتکردنو ناونیشانی شوێنە گشتییەکانی وەك نەخۆشخانەو ئوتێلو پارك بانكو...تادو، چۆنێتیی دروستکردنی خواردنو، جیاوازی کات لە نێوان وڵاتانو شارەکانو نرخی دراوو زانیارییە کەشناسییەکانو، ...تاد.

---

[555] سەرچاوەی پێشوو (٥٣٠).

### ١٦. پانۆراما

بڵاوکردنەوەی زنجیرە ڕوداوێکی یەك لە دوای یەکە کە بەهەموویان پێکەوە گوزارشت لە ماوە یان سەردەم یان ڕوداوێکی دیاریکراودەکەن، وەك فیلمێکی نوسراو لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێتەوەو زۆرجاریش پشت بەوێنەی فۆتۆگرافیی وەها دەبەستێت کە بە پاڵپشتی دەقە نوسراوەکە کەرتە ڕوداوەکان پێکەوە دەبەسترێن‌و لە ڕوبەرێکی دیاریکراوی ڕۆژنامەدا زانیارییگەلێکی زۆر دەخاتە بەردەستی خوێنەر.

## ١/٣) پەیوەندیی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسی

گۆڕانی کۆمەڵگا لە کۆمەڵگای کشتوکاڵییەوە بۆ کۆمەڵگای بازرگانیی و دروستبونی شار بەچەمکی نوێ و هاتنەکایەی چاپ و ڕێنسانس و شۆڕشی ئایدیالیستیی هیگڵیی و شۆڕشی فەرەنسیی و شۆڕشی پیشەسازیی و تا بەئێستا دەگات کە قۆناغی کۆمەڵگای زانینگەراییە، لەهەریەك لەم قۆناغانەدا ئەدەب تەکانێکی گەورەی بەقەد جۆرو ئاستی گەشەی ئەو کۆمەڵانە کردووە کە گۆڕانە جەوهەرییەکان تیایاندا ڕویانداوە، هەر ئەمانەیش ڕێبازگەلێکی زۆریان لە ئەدەبدا هێناوەتەکایەوە، پێداویستیی کۆمەڵایەتیی و پەیوەندیی شارو ئەرکی ئەدەبیش وایانکردووە کە گۆڕانکاریی و تێکەڵاوبون، پوکانەوەو گەشەکردن، لە هونەرەکانی ئەدەب و ڕۆژنامەنوسییشدا بێنەکایەوە، بەشێوەیەك کە ئەوە تەنها هونەرەکانی ئەدەب نین تێکەڵی یەکتر دەبن، یان هەر هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکان نین ئاوێزانی یەکتری بوون، بەڵکو ئەدەب و ڕۆژنامەنوسییش لەم سەردەمی زانینگەرییەدا لە هەندێك ڕەوگەدا تێکەڵ دەبن، وەك ئەوەی بەشی هەرە زۆری هونەرەکانی ڕۆژنامەنوسیی لە سێبەری تێزە ئەدەبییەکاندا دەنوسرێن و لە خودی ئەدەبیشدا هونەری وەك (هەواڵە شیعر) دێتەکایەوە کە گوزارشتێکی هەواڵییانەیە لە شێوەی شیعردا، یاخود (پۆستەرەشیعر)، کە لە ئاوێزانبونی شێوەکاریی و شیعرەوە دروستدەبێت، یان شیعر دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگی مێژویی بەتایبەتیی لەو جۆرانەیاندا کە ڕاستگۆیانە ڕوداوەکان دەگێڕنەوە، ((ڕۆژنامەنوسیی کۆرپەی ئەدەبە، هەرچەندە گەشەی زۆری کردووە، بەڵام نەیتوانیوە باوکایەتیی لە ئەدەب بسێنێت))[556]، هەندێك ڕایش هەن پێیان وایە ((ڕۆژنامەنوسیی تا نیوەی سەدەی نۆزدەیەم بەشێك بووە لە ئەدەب و دواتر لە داهاتنی ڕۆژنامەنوسیی نوێدا لێی جیابۆتەوە))[557]، بەڵام ئەم جیابونەوەیە ناکاتە ئەوەی ڕەگەزو بنەماگەلێکی زۆری ئەدەبی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابێت. (( ڕۆژنامەنوسیی بەهەوڵ و چالاکیی شاعیرو

---

[556] د. مختار الوكيل (١٩٥٤ : ٧).

[557] د. عبدالستار جواد (١٩٩٩ : ٧).

نوسەرو ئەدیبو ڕۆشنبیران سەری هەڵداوەو گەشەی سەندووە، ئەوان بونەتە پێشەنگو پێشڕەوی ئەم پیشە شارستانییە))[558].

کەواتە لە سەردەمی بەرجەستەبونی پەیوەندییو ئاڵوگۆڕە جاڵجاڵۆکەییەکاندا کە تیایدا هەموو نەتەوەو ئایینو مەزهەبو ڕەگەزو...تاد، تێکەڵاوبون، ناشێت ئەدەبو ڕۆژنامەنوسیی تێکەڵاونەبوبن، بەڵام ئەم تێکەڵاوبونە واقیعییەش ناکاتە ئەوەی کە چیدی تایبەتمەندیی جیاکارییانەی خۆیانیان لەدەستدابێت، بەڵکو بە جیاوازیی خۆیان تەلاری مرۆڤایەتیی نوێ تەواودەکەن، کە هەر یەکەیان بازنەیەکی گرنگی پرۆسەیەکنو هەریەکەشیان نیوەی تیرەکەیان چەقیوەتە نیوەی ئەویتریانو لەم لێئالانەشدا چەندین هونەری ناوازەی ئەدەبییو ڕۆژنامەنوسیی وەك لە بەشەکانی تردا باسکران، هاتونەتە کایەوە.

ئەدەب وەك ئەو دنیا فراوانەی بواری دەربڕینە مرۆییە باڵاکان، توانیویەتی تەمەنێکی درێژ بە ڕەوتی مێژوویی خۆی بداتو، ئەو زمانە بێت کە کۆمەڵە مرۆییەکان لێیەوە کەلتوری زاتی خۆیان، دواتر کۆمەڵەکەیان، دواتر ناوچەکەیان بەزیندویی بهێڵنەوە.

ڕۆژنامەنوسیی لە دایکبووی ئەو دنیا ئەدەبییە فراوانەیەو لە سەرەتاکانی مێژووی خۆی دا بەردەوام ئەدیبەکان بونەتە دەستپێکی کاروانەکەی.

جەنجاڵی ژیانو زۆری دانیشتوانو هاتنە کایەی تەکنیك لە ئاستێکی باڵاداو هەوڵدان بۆ بەخێرایی گەیاندنی پەیامەکان، لە دورترین شوێنەوەو بەخێراترین شێوەو بەکەمترین تێچوونو بۆ زۆرترین خەڵكو ڕوبەری جوگرافیی، وایان کردووە کە ئیدی تەنها زمانی ئەدەبو ژانرەکانی ئەدەب نەتوانن لەم بوارەدا کاربکەن، هەر لێرەوە تەرزێکی نوێی نوسین کە نوسینی ڕۆژنامەنوسییە هاتۆتە کایەو ڕۆژنامەکان لە دایکبوونو خزمەتێکی گەورەیان بە بوارە جیاجیاکانی ئەدەبو بڵاوکردنەوەی دەقە ئەدەبییەکان کردووە.

---

[558] د. محەمەد دلێر ئەمین میسری (٢٠٠٤ : ١١٨).

دەقە ئەدەبییەکان لە دەرونی زاتی هەر مرۆڤێکەوە نزیکترن وەك لە دەقە ڕوتەکان (ئەبستراکتەکان)، لێرەوە سەرەتاکانی مێژووی فەرهەنگی کەلتوری مرۆڤایەتی بە گونجاندنی ناخو زار، بیرکردنەوەو دەربڕین، جوانی شێوازو ئاخاوتن دەستپێدەکات. ساکاریی هزری مرۆڤە بەراییەکان، یان مرۆڤە خاوەن توانستی وەرگرتنە دیاریکراوەکان، پێویستیان بە بوونی جۆرە ئاوازێك هەبوو لە دەستەواژەو ڕستەو دەربڕینەکانیاندا، تا بتوانن شیاوانەتر لە بیریاندا هەڵیبگرنو بیلێنەوە. بۆیە ئیدی لێرەوەو لە نەبوونی توانستەکانی تۆمارکردندا بە نوسین "شیعر" وەك سەرەتایەکی بەهادار دەرکەوتو، توانی تا سەردەمانێکی ئێجگار زۆر ڕێبەری شێوازی دەربڕینو نوسین بکات لەسەر تاسەری دنیادا.

## ٣/١-١) تایبەتمەندییەکانی ئەدەب

دیارە مێژوو، یان ڕەهەندەکانی مێژوو بە قازانجی تەرزە ئەدەبیەکاندا دەکەونەوە، هەروەهاش بیرمەندو فەیلەسوفەکانیش هێندەی لەسەر ئەدەب وەستاونەتەوە هێندە لەسەر بابەتێکی دی نەدواون، بۆیە تەرزە ئەدەبییەکان ئەوەیان بۆ خۆیان تۆمار کردووە کە بونێکی تۆمارکراوی دورتریان هەیە لە بابەتەکانی تری کایە مرۆڤایەتییەکان.

هەرچەندە لەسەرەتاکانی شارستانێتی یۆناندا هەر لە سوکراتەوە تابە ئیفلاتۆنو دواتریش ئەرستۆ دەگات بەئاستو لە گۆشە نیگای جیاجیاوە باس لە ئەقلانییەتو وەلاوەنانی سۆزو گەڕانەوە بۆ هۆشی مرۆڤ دەکەن، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵانەشدا تەرزە ئەدەبییەکان لە بنەماکانی (بیرو سۆزو ئەندێشەو شێوان)دا یەکدەگرنەوە، دەقە ئەدەبییەکان ئەو کالایەیان بەبەردا کراوە کە ناشێ دوور لە ئەندێشەو سۆز، دەقەکان بتوانرێت بەبیرو شێوازێکی ورد بنوسرێنەوە[559]. بۆیە سۆزو ئەندێشە لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی ئەدەبن، بە دوایاندا ڕیتمو شێوازی نوسینو کێش، تا سەردەمێکی زۆریش سەرواو

---

[559] بڕوانە: یا. إی. ایلسبوغ (١٩٨٠ : ١١).

لاسایکردنەوە نەك (کۆپیکردنی ڕوداوەکان) بووبوونە بنەما سەرەکییەکانی ئەم بوارە، لێرەدا چەند تایبەتمەندییەکی تری دەق و تێزە ئەدەبییەکان دەستنیشاندەکەین[560] کە بریتی دەبن لە:

١.دەقە ئەدەبییەکان نەمرییان تێدایەو زمان و زەمەن و زەمینە کەمتر دەتوانن کۆنیان بکەن و بەردەوام لەمانەوەدا دەبن، ڕەگەزی نەمریی (خلود) لە دەقە ئەدەبیەکاندا وا دەکات دەقەکان بە زیندوویی بمێننەوەو بپارێزرێن، چ لە ئاستی ناوەوەی دەقەکەدا چ لە ئاستی دەرەکیی دەقەکەدا، ئەدەب هەڵگری ئەم نەمرییە دەبێت و بەپێی ئاستی هونەریی بەرهەمەکەش لایەنی نەمریی تیایدا بالاتر دەبێت، (( ئەدیبەکان نەمریی دەدەن بەبیرو ڕاو پەیامەکان، خۆیان دەڕۆن بەڵام گەوهەرێك بۆ مرۆڤایەتیی بەزیندویی جێدەهێڵن))[561].

٢.کات یان ڕەگەزی زەمەن لە ئەدەبدا نوسەری دەق دیاریدەکات و دەتوانێ زەمەنی ئەمڕۆ بگەڕێنێتەوە بۆ هەر زەمەنێکی مێژویی یان بەر لە مێژوو کە خۆی گەرەکی بێت، هەر وەك چۆن دەتوانێ دەرگای زەمەن بەرەو پێشەوەش والا بکات و، لە ڕەوتی بەرهەمەکەیدا دەست بۆ ئایندەی کاتەکانیش بەرێت و لە داهاتوو بدوێ، یان کاتەکان ڕابگرێت بایی ئەوەی خۆی دەیەوێ تیایدا ڕوداوێك دروستبکات کە گەرەکییەتی.

٣.شوێن دیسانەوە یەکێك دەبێت لەو ڕەگەزانەی تایبەتێتی دەدات بە ئەدەب، بەوەی دەقەکان خۆیان بەشوێنێکی دیاریکراوەوە نابەستنەوە، یا بۆ شوێنێکی دیاریکراو نانوسرێن، بۆیە لە زۆر شوێندا بەخوازراوو شیاو دەبینرێن، ئەمە وەك شوێنی دەق لای وەرگر، وەك شوێنی لەناو دەقیشدا بەتایبەتی لە (شکسپیر)ەوە ئیدی (یەکێتی شوێن) بەو شێوازەی پێش خۆی نەماو سنوری جوگرافیایەکی درامی دەقەکانی لە شوێنێکی دیاریکراوەوە بەرەو جوگرافیایەکی کراوە گواستەوە.

---

[560] بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٢ : ١٥-٢٢).

[561] د. مختار الوكيل (١٩٥٤ : ٤).

٤.دەقە ئەدەبییەکان لەگەڵ سۆزی بەرامبەردا دەدوێن‌و دەیانەوێ لە ڕێی بزاوندنی سۆزی بەرامبەرەوە، ڕوداوەکان بە ئاقاری مەبەستی کەسی نوسەردا بەرن، نوسەر (( هەوڵدەدات بیری خوێنەر بەئاراستەی ڕامان‌و بیرکردنەوەدا بەرێت))[٥٦٢].

٥.کەسی نوسەر ڕێڕەوی ڕوداوەکان‌و کاراکتەرەکان‌و جۆری پاڵەوانەکەو زەمەن‌و شوێن‌و گرێو هەر بابەتێکی تری ناو دەقەکە دیاریدەکات، نەك واقیعییەتی ڕووداوەکان.

٦.ناوەڕۆکی دەقە ئەدەبییەکان ئەوەندەی لە نەستەوە (لاشعورەوە) سەرچاوە دەگرن کەمتر لە ئاستە هۆشمەندییەکاندا بەرجەستەدەبن، چونکە نوسەر گەرەکییەتی زۆرجار ئەوەی لە ناوەوەی خۆیدا لە بەرامبەر (خودو منی باڵا)دا ناتوانێت ڕاڤەیان بکات، لەناو دەقەکانیدا دەریانبڕێت‌و ئەکتەری وەهمییان بۆ دروستبکات، کە لە زۆر باری سایکۆلۆژیدا ڕەوتی دەقەکان بەدەرنین لە کەسێتیی ناوەوەی نوسەرەکانیان.

((هونەر چالاکییەکە لە ناوەوەرا بە فریای ئادەمیزاد دەکەوێت.. بۆیە کاتێك ڕوخان لە دەرەوە را دەست پێدەکات، بنیادنان لە ناوەوەدا، لە قوڵاییەکانی دەروندا دادەمەزرێت..))[٥٦٣] ناوەوە دەرەوە دروستدەکات باهەندێکجار لەژێر کاریگەریی دەرەوەشدا بێت، بەڵام بەوەی نوسەر خۆی دەیەوێت دەینوسێت، نەك ئەوەی کە لە ڕاستەقینەدا وابێت. ((هەموو بنچینەو بنەماکان لە ڕۆحەوە سەرچاوە دەگرن‌و هەر لەوێشەوە دەتوانین ئەو شتە بەدیبکەین کە پێی دەڵێین واقیع..))[٥٦٤].

---

[562] توفيق الحكيم (١٩٧٣ : ١٨٠).

[563] کەمال مەمەند میراودەلی (١٩٧٩ : ٨).

[564] جاکوب کورك (١٩٨٩ : ٢٤).

٧.شێوازی نوسینی دەقەکان‌و ئاوێزانکردن‌و مەبەستی بابەتەکان لە زۆربەیدا بەشێوەی هەرەمێکی وەستاو دەوەستنەوە، (گرێ) وەك ڕەگەزێکی دیار بەکاردەهێنرێت‌و بەخێرایی مەبەست نادات بەدەستەوە[٥٦٥].

٨.بەرهەمە ئەدەبییەکان ئەوەندەی دەربڕینی لایەنی خودیی‌و خود بەگەورە دەرخستن‌و باسکردنە لە تایبەتێتی زاتی کەس (تاکەکەس) ئەوەندە ڕەنگدانەوەی واقعی کۆمەلایەتیی‌و (کۆمەڵ)نییە، بۆیە ئەزموونی کەسی نوسەر ڕۆڵی گەورە دەبینێ لە بنیاتنانی دەقەکەداو هەر ئەویشە ڕوبەری ئەندێشە دیاریدەکات‌و لێیەوە وێنەو جوانکارییە ئەدەبییەکان دێنە کایەوە[٥٦٦]، لە زۆر باردا نوسەر وەلامی دەرونی خۆی دەداتەوە[٥٦٧].

٩.بنەماو بنچینەی بابەتەکان زۆربەیان لە دنیای واقیعدا ڕوییانەنەداوە یان واقعییەتبوون لە بابەتەکاندا کزدەبینرێت، چونکە ڕەهایی بیرکردنەوەو فراوانیی بیری نوسەر دوور لە هەر ڕێگرییەك هەنگاو بەرەو ئەو ئامانجانە دەنێت کە خۆی گەرەکیەتی و دەبێ ببێت، نەك ئەوەی هەیە، هەر ئەمەش وادەکات لە ئەدەبدا ئاسان بێت پەل بۆ گێڕانەوەی ئەندێشە ئامێزیش بهاویژرێت‌و زیاتر لە واقیع دووربکەوێتەوە[٥٦٨]. ((ئەدیب ئازادە لەوەی چ بابەتێك دەکاتە کرۆکی نوسینەکەی، جاری واهەیە دیمەنێکی سروشت، ناسکی گوڵێك، شنەبایەکی بەیانیانی وەرزی بەهار هەستی شاعیر دەجولێنێ))[٥٦٩].

١٠.لە ئەدەبدا بەگشتی لایەنی زاتیی بەسەر لایەنی بابەتیدا زاڵ دەبێت[٥٧٠]، وابەستە بوون بە بنەماکانەوە پەرەدەسێنێت وەك (ڕێبازە ئەدەبیەکان)، (( ئەدیب دەیەوێت خوێنەران بۆ ئاستی داهێنەرانەی خۆی بەرزبکاتەوە))[٥٧١].

---

[565] بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٨: ٢٠٦).

[566] بڕوانە: سعدو اسود خضر (١٩٨٥ : ١٣).

[567] بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٨: ١٧٣).

[568] سەرچاوەی پێشوو (١٧٤).

[569] ئەرسەلان بایز ئیسماعیل (٢٠٠١: ٢٨).

[570] بڕوانە: د. صالح مهدي شريدة (١٩٧١ : ٣).

١١.له ئەدەبدا زۆرتر شێوازی مامۆستایی له دەربڕینەکاندا پیادەدەکرێتو نوسەر گەرەکییەتی مۆدێلێکی وەك ئەوەی خۆی گەرەکییەتی، یان نەوەیەك یان خەڵکێکی، یان جیهانێکی وەك ئەوەی ئەو وێنای دەکات بێنێتەبوون، هەر هیچ نەبێت ئەم بارە لەدەقەکانیدا بەرجەستەدەکات.

١٢.بەرامبەر یان وەرگر لەدەقە ئەدەبییەکاندا بایەخێکی ئەوتۆی پێنادرێت. بەوەی هیچ ئەژمارێك بۆداب و نەریت و ئاستە کۆمەڵایەتییەکان ناکرێت و گوێ بەشوێنی بلاّوبونەوەی دەقەکەنادرێت.

١٣.ڕیکلام و ئاگانامەکان لەئەدەبدا نین ، بەلاّم پیاهەڵدان بەکەسەکاندا هەن و دیسانەوە داشۆرینی کەسەکانیش هەن ، واتە گرنگی بەکەس دەدرێت نەك بەتەکنیك و فۆرمی بەرهەمو بابەتەکان ((گەلێك جارلەمێژودا ئەدەبیش وەك کالاّیەکی پروپاگەندە بەکارهاتووە... تەنانەت له ئەوروپاشدا گەلێکجار وابووە ،بەرهەمی شاعیرێك هێندەی چەندین بەیاننامەی سیاسی دەوری بینیوە لەخۆراگری و بەرگریکردندا...))[٥٧٢] لەتێڕوانینی تریشدا ئەوەدەبینرێت کەهەندێك له ڕەخنەکاران دەڵێن ئەدەبیش وەك هەر هونەرێکی دی، بەشێك لەپروپاگەندەکردنی تێدایە، ئیدی بۆبیرێکی سیاسی بێت یان ئایدۆلۆژیا، یان کۆمەڵایەتیی، یان هەربواریکی دی، جۆرج ئۆرێڵ دەڵێت: ((هەرهونەرێك پروپاگەندەکردنە بۆ هەنێك شت...))[٥٧٣].

١٤.ئەدەب بەرهەمێکی زەینیەو زانستێك نییە کەخەڵك بەدیراسەکردن فێری ببێت، زۆرترینی (هونەرە بۆ هونەر)و دەقەکان بەئاسانی ناتوانرێت لەیەکتر وەربگیرێن، یەککەس لەپشت نوسینییەوە هەیەو دەینوسێت، (( ئەدەب هەوڵدەدات چێژی گشتیی دروستبکات))[٥٧٤].

---

[571] د. شوقي ضيف (١٩٦٢ : ٢٠٢).

[572] ئەرسەلان بایز ئیسماعیل (٢٠٠١: ١٥).

[573] أ. ب. فولكيس (١٩٨٦: ٩).

[574] توفيق الحكيم (١٩٧٣ : ١٨٦).

١٥.هونەرەکانی ڕەوانبێژیی و جوانکاریی و ڕازاندنەوە کاریگەریی گەورە دەکەنە سەر فۆڕمی سەرەکیی بەرهەمەکان و وادەکەن ئاساننەبێت هەرکەسێکی ئاسایی لەناوەڕۆکی دەقەکان بگات، ((زمانی ئەدەب زمانی هێماو وێنەو مەجاز و خەیاڵە، تارادەیەك ئیختیساسیەو مەرج نیە هەموو خوێندەوارێك لێی تێ بگات، تەنیا ئەوانە نەبێت کە موتابەعەی ئەدەبیان هەیە ..))[575].

١٦.لەدەقە ئەدەبییەکاندا نوسەر هێندەی دەیەوێت لە ڕێی وێناکردنی کەس و ڕوداوەکانەوە بەدیمەنەکانمان ئاشنابکات، ئەوەندە وابەستەی پیشاندانێکی فۆتۆ گرافییانەی دیمەنەکان نابێت، بۆیە نوسەری دەقە ئەدەبییەکان دەکرێت لەهەر سات و شوێنێکدا کەلەگەڵ خولیاکانیاندا تەریب بێت بنوسن و کەرەستە و ئامێری وەهایان گەرەك نییە کەبۆ بوارەکانی تری نوسین بەتایبەتیش ڕۆژنامەنوسیی پێویستن. دەشێت تێڕوانینی نوسەرێك بۆ ڕوداوێك بالەواقعیشدا بوبێت، تەواو جیابێت لەگەڵ نوسەرێکی دیداو ((لێرەوە تێدەگەین بواری کاری ئەدەبیی تەواو جیاوازە لەگەڵ بوارە سروشتیەکانداو بەرهەمە ئەدەبییەکان زادەی پەیوەندیی نوسەرن و دەوروبەر و ناوەوەی خۆی و هەست و نەستی خۆی و درککردن و ڕامانی ئەون بەرامبەر بەشتەکان. بەڵام دیارە دەشێت دوزانا وەکو یەك لەبواری زانستە سروشتیەکاندا بنوسن و جیاوازی لەمەبەستی نوسینەکانیاندا نەبێ ..))[576].

١٧. (ڕا) یان دەربڕینی بۆچوون لەسەر شتەکان ، زاڵە بەسەر بوارە ئەدەبیەکانداو لەزۆر باردا بەرهەمەکان لە دەربڕینی بیروڕا تێپەڕ ناکەنو ئەو زانیارییانەش کە لەدەقەکاندا دەبن ئەوەندەی زانیارییەکن خزمەت بە (ڕاکان) دەکەن ، ئەوەندە زانیارییەکی زانستی نین کە توانای چەسپاندنو بەردەوامییان هەبێت.

---

[575] ئەرسەلان بایز ئیسماعیل (٢٠٠١: ٢٧).

[576] د. شوقي ضيف (١٩٦٢ : ٦٩).

١٨.بەرهەمە ئەدەبییەکان ئەو بابەتانەت دەداتێ کە خۆی گەرەکییەتی، نەك ئەوەی ئێمە دەمانەوێتو پرۆسەی فیدباك (عملية استرجاعية) لە ئەدەبدا بەدەگمەن دەبینرێتو، وەرگر هەرچەندە دەتوانێت لە خەیاڵی خۆیدا خۆی بەیەکێك لە کارەکتەرەکانی بزانێت، بەڵام ناتوانێت هیچ لە ڕەوتی بابەتەکە بگۆڕێت.

١٩.دەقە ئەدەبییەکان هەبوونی توانستی هونەرییان گەرەکە لای کەسی نوسەر، چەندە بتوانێت شیاوانە وشەکان ئاوێزانی یەك بکاتو جوانتر وشەکان بچنێتو ڕێکیان بخاتو تەبایان بکات لەگەڵ ڕەوتی مەبەستەکانی خۆیدا، ئەوەندە بابەتەکە لە ڕوی شێوازەوە جوانتر دەکات، هەر ئەم بنەمایەش وا دەکات کە لایەنی جوانیی زاڵبێتو لە بەرامبەر جوانکاریی دەقەکەدا وەرگر خۆی ببینێتەوەو هەوڵی تێکەڵاوبوونو پێکگەیشتن، لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا بدات.

٢٠. زمانی ئەدەبیی، زمانێکە وابەستەی داهێنانو وێنە هونەرییەکانە، نوسەر مەبەستی نییە بەسادەیی بیرەکانی خۆی لە شێوازێکی ساکاری دەربڕینەکاندا بخاتە ڕوو، بەڵکو وەك نیگارکێشێك دەیەوێت کارامەیی خۆی لە بەکارهێنانی ڕەنگەکاندا پیادەبکاتو گەمە بە بنەما چەسپاوەکان بکات لە پێناوی داهێنانێکی وەهادا کە توانای مانەوەی هەبێتو هونەرێکی باڵای ئەدەبیی لێبکەوێتەوە ((زمانی ئەدەبی، لە ڕاستیدا، یاری پێدەکرێتو گەلێك جار لە زمانی باڵاو دەستورەکانی لا دەدات..))[٥٧٧].

ئامانجی نوسەر بەرهەمهێنانی بەرهەمێکی ئەدەبییەو گرنگ نییە بەلایەوە هەموو کەسێك لە ناوەڕۆکەکەی بگەن، یان نا.

٢١.بەرهەمە ئەدەبییەکان پرۆسەیەکی تاکەکەسیینو لە ئەنجامی هەوڵی تاکەوە دێنە بەرهەمو گوزارشت لە ئایدیای کەسیی، یان ئایدۆلۆژیای پەسەندکراوی لای تاك دەکەن، هەرچەندە لە زۆربارردا سەرەتاکانی ئەم بەرهەمانە

---

[577] د. محەمەدی مەحوی (٢٠٠٣ : ١٠).

لەناو بزاوتەکانی کۆمەڵەوە سەرچاوە دەگرن، بەڵام دواتر وەك تاك گوزارشتیان بۆ دادەنرێت.

٢٢.یەکێتی بابەت لە ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی بەرهەمە ئەدەبییەکانەو هەر بابەتێکی لاوەکیش لە دەرەوەی ئەو بابەتە سەرەکییەوە بێتە ناویەوە لە پێناوی خزمەتگەیاندن بە بابەتە سەرەکییەکەدا دەبێت.

٢٣.بەرهەمە ئەدەبییەکان لە ڕوی بڵاوکردنەوەیانەوە وابەستەی زەمەنێکی دیاریکراو نابن، لێرەشەوە چاپکردنی بەرهەمێکی ئەدەبی خۆی بۆ خۆی گرفتی کاتی دەرچونێکی خولیی ڕێکخراوی نییە.

٢٤. چەشنە دیارەکانی ئەدەب خۆیان لە "شیعرو پەخشان"دا دەنوێنن و هەریەك لەم چەشنانەیش بۆ چەند جۆرێك بەش دەبن.

وەك یەکێك لە هونەرەکانی پەخشانیش "ڕۆژنامەنوسیی" دێتەکایەوە لێرەوە ئەوە دەسەلمێت کە ڕۆژنامەنوسیی لەسەر بناغەی ئەدەب بنیاتنراوەو لە بنەما سەرەکییەکانیدا یەکێکە لە لێکەوتەکانی ئەدەب ((نێوانی ئەدەب و ڕۆژنامە وەك نێوانی شانۆو سینەما وەهایە، سەرەتا سینەما لەسەر شانی ئەکتەرو دەرهێنەرانی شانۆ کەوتە سەرپێ، چونکە شانۆ پێش سینەما هەبووە، ڕۆژنامەیش لەسەر دەستی ئەدیبەکان گەشەی کرد. ئەوان دەیانبرد بەڕێوەو بۆیان دەنوسی))[578].

ئەوەی دەشێ وەك سەرەتایەك بۆ هەبوونی بنەماکانی ڕۆژنامەنوسیی لەو سەردەمانەدا دابنرێت و بەو بنجانە بزانرێت کە لێیانەوە ڕۆژنامەنوسیی ئەمڕۆ سەرچاوەی گرتبێت، بریتی دەبن لە تێڕوانینەکانی سوکرات کە ئیفلاتۆن لە (ئایۆن)دا دەیانوسێت و دواتر لە کۆماردا (ڕیپەپلێك)، بنیاتیان لەسەر دەنێت و لە گرنگیدان بە (( زانین و پرسیارکردن و وتووێژو بایەخدان بەبەهامۆراڵییەکان و گرنگیدان بەڕاستیی، تاقیکردنەوەی ژیان، پەروەردەو فێرکردن، خودناسی، ڕەتکردنەوەی ڕەوانبێژی، وەرگرتنی زانیاریی لە بەرامبەر، خود هۆشیاریی،

---

578 محەمەد فەریق حەسەن (١٩٩٨: ١٤).

ئازادیی، ڕاکێشانی خەڵکی ئاسایی بۆ بیرکردنەوە لە مەعریفەی بچوکەوە بۆ مەعریفەی گەردونی، دادوەریی، خەمخۆریی بۆ کارەکتەری مرۆڤ ،باسکردن لەشتەکان وەك ئەوەی کە هەن، هەوڵدان بۆ ڕیفۆرمکردنی خەڵك، دانانی مرۆڤ بەپێوەری هەموو شتەکان، ئازایەتیی، هاوسەنگیی، دلێریی، چاکە، ئۆقرەگرتن، جیاکاریی، ڕێکخستنی جیهان، تا دەگات بەوەی دەڵێت: ژیانی چاك بریتییە لە ئەرکی تاك لە بەرامبەر ئەوانی تردا،... تاد))[579]، بۆیە کاتێك ڕۆژنامەنوسیی لە جەستەی ئەدەب جویێ دەبێتەوە، زۆرێك لەم بنەما گرنگانە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت و لەناو خۆیدا بەرجەستەیان دەکات.

## ٢-١/٣) جیاکردنەوەی ئاستەکان و هاتنە ناوەوەو جیابونەوەی ڕۆژنامەنوسیی

### ١-٢-١/٣) جیاکردنەوەی ئاستەکان

بەهاتنی (میشێل دی مۆنتێن ١٥٣٣-١٥٩٢) و لەسەردەمی ئەودا ئیدی ڕۆژنامەنوسیی بە شێوازێکی گەشەکردووتر لە پێش خۆی هاتەکایەوە، هەرچەندە ئەوروپا ڕۆژگارەکانی چەرخی تاریکی خۆی لە ژێر تارمایی کەنیسەو تەختی پاشاو دەسەڵاتدارە خاوەنزەوییەکاندا بەڕێدەکرد، بەڵام هێدی هێدی شێوازو ئاستەکانی نوسین باشتر دەچەسپان.

هەر لەم ماوەیەدا چاپخانە بەرەو گەشەکردن دەچوو، مۆنتێن کۆچیکرد، بە دوایدا ئەوروپا ڕووی لە داهێنانێکی کۆمەڵایەتی نوێکرد کە (ڕۆژنامە) بوو، لە ساڵی ١٥٩٧دا یەکەم ڕۆژنامەی چاپکراو لە (ئەنفرس) لە بەلجیکا بڵاوکرایەوە[580]. زانست و ئەزمونگەرێتیی چوونە ئاستێکی باڵاترەوە، بۆیە لێرەوە لایەنی بابەتی کەوتە نوسینەکانەوە، (بایکۆن ١٥٦١-١٦٢٦) دەستی بەو نوسینانە کرد کە بە وتاری بابەتیی ناو دەبرێن. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا شۆڕشی

---

[579] ویلبریس. سکوت (١٩٨١: ٧).

[580] بڕوانە: د. صابر فلحوط، د. محمد البخاري (١٩٩٩: ١٢٦).

فەرەنسیی دەرگای ڕوناکییەکان والآکردو ڕۆژنامەو نوسراوو چاپکراوەکانی دیش چوونە قۆناغێکی نوێوە ((وتاری ڕۆژنامەنوسیی ، لەسەر دەستی زۆرێك لە نوسەران پەیدابوو، دواترینیشیان نوسەری ئینگلیزیی (دیڤۆ)و (وستیل)و..تاد، بوون))[581] هەر لێرەوە ئاستەکانی نوسین بۆ سێ ئاست پۆلێنکران[582]:

**یەکەم: ئاستی ئەدەبیی:**

ئەو ئاستەیە ئەدیبەکان تیایدا گوزارشت لە هەستو سۆزی خۆیان دەکەنو لەگەڵیدا ئەزموونی مرۆیی خۆیان ئاوێزانی نوسینەکانیان دەکەنو توانستەکان بە گۆڕانی کەسی نوسەرو شوێنو کاتو سەردەمەکانیان دەگۆڕێن. (ڕا) زاڵە بەسەر فەزای گشتیی بابەتەکاندا.

**دووەم: ئاستی زانستیی:**

ئەو ئاستەیە کە زاناکان لێیەوە گوزارشت لەڕاستییە زانستییەکان دەکەن، ئیدی زانستەکانی گەردون بن، یان مێژوو، یان ئەدەب، جیاوازی ئەوتۆیان لە شێوازی نوسیندا نابێت. لەم ئاستەدا کەسی نوسەر ئەو دەربڕینو واژانەی بەکاریان دەبات دەشێ ڕونو دیاربنو دەربڕینەکان لە ئاستی واتاکاندا بن، دیارە کەرەستەی سەرەکیی پرۆسەکەش بەڵگە زانستییەکان دەبێت و(مەعریفە) زاڵە بەسەر بابەتەکاندا.

**سێیەم: ئاستی کرداریی:**

ئەو ئاستەیە کە تیایدا ڕۆژنامەنوسان کاردەکەنو هەواڵەکانی ڕۆژانەو ڕووداوەکانی ئەو دۆخو ژینگەیەی تیایدان بۆ خەڵك دەگوێزنەوە. دێنو لە ڕێی بڵاوکردنەوەی

---

[581] بڕوانە: د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨: ١٦٥).

[582] سەرچاوەی پێشوو (١٦٤).

ڕوداوەکەوە (هەواڵ) دەنوسن و دواتر زانیاری ڕونتر لەسەری دەردەخەن و پاشان قسەو باسی لەسەر دەکەن و لێدوانی لەسەر دەنوسن.

ئەو زمانەی لە نوسیندا بەکاریدەهێنن زمانێکی بەکارهێنراوی شیاوی بێپێچوپەنای ساکاری وەهایە کە خوێنەر بەخێرایی لێی دەگات، بۆیە مەرجەکانی هەست و سۆزو خەیاڵ و جوانیی دەربڕین، هەروەها دیاریکردن و لە قاڵبدانی زۆری دەربڕینەکان کە لە دوو ئاستەکەی تردا هەبوون، لێرەدا نابنە پێکهاتەی سەرەکی نوسینەکان[٥٨٣].

(ڕاو مەعریفە) پێکەوە بنیاتی گشتیی ئەم ئاستە دەنێن.

ئەگەر بە مێژووی (نوسین)ی هەر نەتەوەیەکدا بچینەوە دەبینین سەرەتا بە ئاستی یەکەم دەستی پێکردووە کە ئاستی ئەدەبییە، دواتر ئاستی زانستی هاتۆتە کایەوەو بە دوای ئەویشدا ئاستی کرداریی هاتۆتەئاراوە، کە ڕۆژنامەنوسییە ((بەڵام دیارە ئەم ئاستانە کۆتایی بەبوونی یەکتر ناهێنن بەڵکو لەناویەکداو زۆرجار لەگەڵ یەکداو دەشێ لە دەرەوەی یەکتریشدا بەکار بخرێن))[٥٨٤].

[583] بڕوانە: د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٨: ١٦٥-١٦٦).

[584] هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٢ب : ٢٧).

## ١/٣-٢-٢) هاتنه ناوەوەی ڕۆژنامەنوسیی

مێژووی نوێی ڕۆژنامەنوسیی بە دۆزینەوەی پیتی چاپ لە ساڵی ١٤٣٦دا لەلایەن گۆتەنبەرگەوە دەستپێدەکات (( ڕۆژنامەنوسیی ڕاستەقینە دەکەوێتە دوای شۆڕشە گەورەکەی گۆتەنبەرگەوە))[٥٨٥] ، بۆیە مێژووی نوسین لەناو ڕۆژنامەدا وابەستەدەبێت بەو سەردەمە نوێیەی ئەو کاتەوە.

بەهاتنی ڕۆژنامەو داهاتنی تەکنیکی چاپو زیادبوونی ڕووبەری بڵاوکراوەکانو زیادبوونی تیراژو دانە چاپکراوەکانی هەر نوسراوێکی وەك ڕۆژنامە، ئیدی ڕۆژنامە بایەخی خۆی پەیدا کردوو، بووە ئەو مینبەرەی کە تیایدا ئاڵوگۆڕی بیرو ڕاکان دەکران. سەردەمانی پێشوو بەرێژەیەکی زۆر لەناو چینە ڕۆشنبیرەکەدا (ئەدیب)ی بەرهەمهێنابوو، بۆیە ئەدیبەکان بەرەو ناوەڕۆکی ناوەوەی ڕۆژنامەکان کشان، زاڵبونی دەسەلاتی پاشاو دەسەلاتی پاپاو، دەسەلاتی ئەرستۆکراتەکان، بە تایبەتی لە ئەوروپادا بووە مایەی ئەوەی دەربڕینەکان بەشێوەیەك بن کە گەر نارەزایی دەربڕینی دژی ئەوانیشی تیابێت شاراوەو داپۆشراو بن، بۆیە جارێکی تریش ڕێگا بۆ دەربڕینە ئەدەبییەکان لەناو ڕۆژنامەکاندا سازبۆوە. (بێڵ) دەڵێ: ((لەکاتی نەمانی ئازادیی ڕۆژنامەنوسییدا بەتایبەتی لە ئەرورویادا، ڕۆژنامە ئەدەبییەکان زیادیاندەکرد))[٥٨٦] ، (ڤۆلتێر)یش دەڵێت: ((لەو دەمەدا لە ئەوروپا ١٧٣ ڕۆژنامەی ئەدەبیی لەمانگێکدا دەردەچوون))[٥٨٧] ، ئەمە جگە لەوەی خەڵك تا ئەو کاتە لە ئاستێکدا نەبوون کە تەنها بەس بێت بە کرداریی ڕووداوەکانیان لە ڕێی وشەوە بۆ بگێڕرێتەوە.

---

[585] د. مختار الوكيل (١٩٥٤ : ٥).

[586] أميل بوافان (١٩٤٩: ٢٤-٢٥).

[587] سەرچاوەی پێشوو (٢٥).

## ٣-٢-١/٢) جیابونەوەی ڕۆژنامەنوسیی

لە ساڵی ١٧٨٩دا شۆڕشی فەرەنسی کەمەری بیری ڕزیوی ئەوروپاییەکانی شکاندو بە ڕووی دنیایەکی نوێدا کرانەوە، لێرەوە دنیای سۆزگەرایی ژێر کاریگەری (پاشاو ئایین‌و دارایی)، گۆڕا بە دنیای هۆشگەرایی و ڕەهاکردنی تێزە فەردییەکانی مرۆڤ لە ئەوروپادا.

سەرلەنوێ هەموو بوارەکانی ژیانی خەڵك پێویستیان بەداڕشتنەوەو زاخاوکردنەوە هەبوو، لەگەڵ ئەمانەشدا ئەمریکا ساڵانێکی بەڕێکردبوو بەرەو چەسپاندن دەچوو، لەوێدا ڕۆژنامەوانیی لیبراڵ و هەواڵدەری سیاسیی دور لە تێزەکانی سۆزگەرایی ئەوروپایی هاتبووە ئاراوە، بۆیە ئیدی وایدەخواست جیاوازی و جیاکاریی لەنێوان ئەدەب و ڕۆژنامەنوسییدا بێتە کایەوە، سەدەی هەژدەیەم بووە ئەو دوڕیانەی لێیەوە ڕۆژنامەنوسیی لەئەدەب جیابێتەوە.

دۆخ و سەردەمی نوێ وادەکات خەڵکەکان بێ هیچ هاوبەشییەکی کەلتوری لەیەکدی نزیکببنەوە، گوندنشینەکان لەسایەی شۆڕشی پیشەسازیی و تەکنۆلۆژییدا لەگوندەوە بۆشارو لەشارەکانەوە بۆ میترۆپۆڵەکان، ڕەودەکەن، زمان دەبێتە زمانی تەکنیك و تەکنۆلۆژیا: ڕۆبۆت پەی بەتوانستەکانی مرۆڤ دەبات و زمانێکی نوێ لەسەر بنەمای (0,1) دروستدەبێت، ئیدی سۆزو خەیاڵ و وێناکردنی دیمەنەکان دەکەونە پەراوێزی ماندوبونی زۆری مرۆڤەکانەوە کە بەڕۆژ بەدوای ژیان و بژێوی و بە شەو بەدوای شوێنی حەوانەوەدا دەگەڕێن. هەرلێرەدا ئیدی زمانی کرداریی(کەدەبێتە ماکی ڕۆژنامەنوسیی) وەك جەستەیەکی بێگیان. لەگیانی زیندوی ئەدەب دێتەدەرەوە.

پێداویستی سەردەمەکە وادەکات کە ((ئەگەر ڕۆژنامەوانەکانی پێشەنگ لەدەرگای ئەدەبەوە هاتبنە ناوەوە، ئەوا سەردەم وەها پێویست دەکات ڕۆژنامەنوسانی نوێ ڕاستەوخۆ لەدەرگا فراوانەکەی ڕۆژنامەوە بێن))[٥٨٨]، بەڵام دیارە تا ئەمڕۆش بەهۆی ئەوەی ڕۆژنامەنوسیی پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی

---

[588] محەمەد فەریق حەسەن (١٩٩٨: ١٥).

پیرۆزەو لە ڕاستی ڕوداوەکان‌و ڕوداوەکانی ئێستاو تێزو دەرکەوتە نوێیەکان دەدوێت، زۆرێك لەو کەسانەی لە بازنەی ئەدەبدا ماونەتەوە هەر خۆیان بە نوسەری بواری ڕۆژنامە دەزانن، بێئەوەی بەئاگاییەوە لە جیاوازیی‌و لێکچونەکانیان بگەن ((زۆربەی ئەوانەی لە بواری چاپەمەنیدا لە بڵاوکراوەیەکدا، لە گۆڤارێکی ئەدەبیدا کاریان کردووە، خۆیان بە ڕۆژنامەنوس دادەنێن، بڵاوکراوەشیان دەخەنە ڕیزی ڕۆژنامەگەرییەوە))[589].

هەندێکی دیش پێیان وایە ئەدەب‌و ڕۆژنامەنوسیی بەشێوەیەك تێکەڵاوی یەکبوون کە ناتوانرێت بەئاسانیی جیابکرێنەوە، بێئەوەی جیاوازیی لە نێوان بۆ ڕۆژنامەنوسین‌و لەناو ڕۆژنامەدا بەڕێوەبردنی کاری ڕۆژنامەوانیی بەڕونیی جویَ بکەنەوە، یان لە بەرامبەر بڵاوکردنەوەی دەقێکی ئەدەبییدا ڕایبگرن کە خۆی بۆ خۆی لە سودگەیاندنی ڕۆژنامەوە دێت بە ئەدەب، دوای ئەو قۆناغەی کە ڕۆژنامە توانی ببێتە کەناڵێك بۆ پەخشکردنی بەرهەمە ئەدەبیەکان.

((بەمجۆرە دەبینین کەپەیوەندی ئەدەب بەڕۆژنامەگەرییەوە لەگەڵ یەکەمین هەنگاوی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوە دەست پێدەکات و هەردوکیان ئاوێتەی یەکتربون..))[590].

ڕۆژنامەنوسیی وەك یەکێك لەهونەرەکانی پەخشان و دواتر ئەدەب هاتۆتەکایەوە، بەڵام توانیوێتی بەخێراییی گەشەبکات و بەهۆی هاتنەکایەی پەخشانی داڕشتنیشەوەو دواتر پەخشانی کردارییەوەو چوونە بازاڕو کارلێکە ئابوری و کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکانەوە زیاتریش گەشەی کردووە، تەکنیك کە لە سەدەی ڕابردودا گەشەیەکی دیاری کرد، وایکرد دەست بەسەر دەربڕینەکانیشدا بگرێت‌و لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوشەوە بە تەواوی (سۆزی ڕووت)ی پەراوێز خست‌و تەکنیك هەموو بوارەکانی داگیرکرد، (بۆدهۆڵ) دەڵێت: ((زمانی تەکنیك توانیویەتی دزە بکاتە نێو ڕەهەندە زهنییەکانی

---

[589] ڕەوف حەسەن (١٩٩٩: ١١).

[590] ئەرسەلان بایز ئیسماعیل (٢٠٠١: ٣٣).

خۆرئاواوەو چیدی دنیای ئەدەبو دەربڕینە دەروونییەکان بەدەرنابن لەو گەشە تەکنۆلۆژییانەی لە خۆرئاوادا هەموو پێکهاتەی کۆمەڵی خۆرئاواییان داگیرکردووە))[591]، بۆیە ڕۆژنامەنوسیی بووە ئەو مینبەرەی کە لێیەوە دەقە ئەدەبییەکان بەخەڵكو وەرگر بگەیەنێتو چیدی لە فراوانبوونی جیهاندا، (ئەدەب) هەر خۆی بۆ خۆی نەتوانێت بگاتە هەموو کەسو شوێنێك گەر تەکنیكو ڕۆژنامەوانی لەتەکدا نەبن یان لە پشتییەوەنەبن. بۆیە ئیدی ڕۆژنامەنوسیی وەك داهێنراوێکی نوێی ناو زانستە مرۆییەکان دەردەکەوێتو تایبەتێتی خۆی دەبێتو لێرەوە ئەوە دەسەلمێنێ کە ڕۆژنامەنوسیی لێکەوتەی بواری ئەدەب بووە، بەڵام لە ئەمڕۆدا ئەو هۆکارەیە کە بەهۆیەوە ئەدەب دەگاتە خەڵك. هەندێ لە نوسەرو بیرمەندانیش بەتایبەتی ڕوسەکان پێیان وایە دەشێ بەرهەمە ئەدەبییەکان لەناو لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بخوێنرێنەوە، چونکە ((ناکرێ بوارێکی گرنگی وەك ئەدەب لەکۆی خەڵك دابڕکرێت، بەتایبەتیش گەر ڕەنگدانەوەی ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئایدۆلۆژیی ئەوان بێت))[592]، هەندێك ڕای تریش پێیان وایە ((ئەدەب هونەرێکی بالایەو ناکرێ تێکەڵ بە ڕۆژنامەوانیی و ڕۆژنامەکان بکرێت دەشێ لە سیاسەتیش جوێ بکرێتەوە نەك هەر لە ڕۆژنامەوانی))[593] ئەم ڕایە پێی وایە ئەدەب گەر تێکەڵ بەو کایانەی پێشەوە بکرێن جوانییەکانی خۆی لەدەستدەداتو لە پرۆسەیەکی جدییەوە دەبێتە پرۆسەیەکی بازاڕیی و ئیدی ڕۆشنبیری بە بازاڕیی دەکرێت، ڕایەکی تریش هەیە کە ئێستا لەناو ڕۆژنامەوانییدا کاری خۆی دەکاتو پێی وایە ئەدەب لەگەڵ تایبەتێتی خۆیدا دەتوانێت لەناو ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا جێی بێتەوە، بەتایبەتیش کە جگە لەوەی جوانیی و هێمنیی و هاوسەنگیی بەهەمەڕەنگیی بابەتەکان دەبەخشێت، لەهەمان کاتیشدا بەهۆی ئەوەی ئەدەب تەنها لە دەقو بەرهەمە

---

[591] بۆدهۆڵ (۲۰۰۱ : ۱۲۲).

[592] السکندر بلوك (۱۹۷۷: ٤٥).

[593] سەرچاوەی پێشوو (٤٦).

ئەدەبییەکاندا نەماوەتەوەو ڕەخنەو لێکۆڵینەوەو ئەدەبی بەراوردکاریی و بەراوردی ئەدەبی و هەڵسەنگاندنی بۆ زیاد بووە، بۆیە دەشێ بەشێك بێت لە ڕۆژنامەکان یان گۆڤاری تایبەت بە بوارەکانی ئەدەبیان هەبێت ((تەماشا دەکەی ئێستا لەوڵاتە پێشکەوتووەکاندا چەندە بایەخ بە وەرگێران دەدرێ لە جێگایەکی وەکو یەکێتی سۆڤیەت، یا ئەمەریکاو ئینگلتەرا، یا فەرەنگستان، یا ... زوربەی هەرە زۆری بەرهەمە گەورەو نەمرەکانی هەموو نوسەرە بلیمەتەکانی جیهانی بە زمانی خۆیان هەیە، گۆڤاری تایبەتیان هەیە ئەدەبی جیهانی بە زمانی خۆیان بڵاودەکاتەوە، لەهەمان کاتیشدا گۆڤاری تایبەتیان هەیە بە زمانێك یا چەند زمانێکی زیندوی جیهانی دەری دەکەن‌و بەرهەمی بەرزی خۆیانی تێدا بڵاودەکەنەوە))[٥٩٤]، یان دەوترێت: ((بەشێوەیەکی گشتی ئەدەب لە ڕۆژنامەگەری کوری دا زۆرترین لاپەڕەی بەردەکەوێت، تەنانەت زۆربەی زۆری ئەو ڕۆژنامانەی لەم دە پازدە بیست ساڵەی دوایی دەرچوون مۆرکی ئەدەبیان لە بابەتە ڕۆشنبیرییەکانی تر زیاتر پێوە دیارە))[٥٩٥].

## ٣-١/٣) تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەنوسیی

ئەگەر لە ڕوانگەی کاری ڕۆژنامەنوسیی ئەمڕۆوە سەیر بکەین ئەوا مێژووی ڕۆژنامەنوسیی لە دنیادا مێژوویەکی نوێترو تەمەنێکی کەمتری هەیە لە بوارە ئەدەبییەکان، دیارە دەشێ بەم تێڕوانینەش تەماشا بکرێ بەهۆی ئەوەی ڕۆژنامە لەگەڵ گرنگیی و بایەخی خۆیدا لەساتە وەختی داهێنانیدا، بەڵام وەك هۆیەکی ڕێکخراوو وەك ڕایەڵێك لە ڕایەڵەکانی پرۆسەی کۆمۆنیکەیشن باسدەکرێت و ناشێت هەر پەیوەندییەکی کۆمەڵە مرۆییە بەراییەکانیش بەپەیامی ئاراستەکراوو ڕێکخراو و ڕێککراوی ڕۆژنامەنوسیی بزانین، بەڵکو هەموو ئەوانە بەشێك دەبن لە پەیکەری گشتیی پرۆسەی کۆمۆنیکەیشن‌و دواتریش بە گەشەکردنیان دەبنە

[594] عەزیز گەردی (١٩٨٧: ٤٠).

[595] نەژاد عەزیز سورمێ (١٩٩٩: ٢١٩-٢٢٠).

بەشێك لە پرۆسەی ڕاگەیاندن، ئەگەر توانرا پەیامەکان بگەیەنرێنە ژمارەیەکی زۆری خەڵك، واتە پرۆسەی گەیاندنەکە بوو بە پرۆسەی بەکۆگەیاندن (ماسکۆمۆنیکەیشن) کەواتە لێرەدا باس لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەنوسیی دەکەین وەك ئەو مێژووەی هەیەتی و وەك ئەو زەمەنەی لە تەمەنی خۆیدا بڕیویەتی، نەك وەك ئەو مێژووەی دەبێت وابووایە. بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان وابەستەی هەبوونی بزاوتێکی ناو کۆمەڵن یان ناو کۆمەڵگاکانن، کە لە (کەس، یان شوێن، یان ڕووداو) لە زەمەنێکدا بەواقعیی ڕوودەدەن‌و دەبنە زانیاریی‌و زانیاریش دەبێتە بنەما بۆ بینیاتنانی هەر پرۆسەیەکی ڕۆژنامەنوسیی (ئیدی بە هەر جۆرە هونەرێك لەهونەرەکانی ڕۆژنامەنوسیی بنوسرێتەوە). کەواتە لە ڕۆژنامەنوسییدا بابەتەکانی دەرەوە یان (ڕوداوەکانی دەوروبەر) کار دەکەنە سەر کەسی ڕۆژنامەوان‌و لە زۆر باردا پێویستبوونی تۆمارکردن وا دەکات کە دەبێت بنوسرێت‌و دوور لە هەر خواستێکی (تاك- کەس) تۆمار دەکرێت‌و، وا دەبێت کە کەسی ڕۆژنامەوان بەدەر لە هەر نەستێکی خودیی بەدوای تۆمارکردنی ڕووی ڕاستی ڕوداوەکاندا بچێت، کەواتە پێکهاتەی ناوەکیی بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان دوور لە هەژاندنی خودیی‌و سۆزو ئەندێشەو خواستە تایبەتییەکان دەنوسرێنەوەو ڕوداوەکان پەیوەندیی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی ژیانییان لەگەڵ خەڵکدا دەبێت.

لێرەوە بە پێی بەراوردکردنێك لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی ئەدەبدا (کە لە وەچەپاری یەکەمی ئەم پارەدا ئاماژەمان بۆکردن) دەچینە سەر تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەنوسیی:

١.بەشێکی زۆری بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان وابەستەی "کاتن"، واتە (کاتی ڕودانی ڕوداوەکە)، بە تێپەڕبوونی کات بەسەردەچن‌و ڕەگەزی نەمرییان تێدا نییە، ((ڕۆژنامەنوسیی ئەدەبێکە نەمریی تیا نییە))[٥٩٦]، شوێن‌و کات بەتەواوی دەیانگۆڕێت‌و ئاستی بایەخیان گەمە پێدەکات ((ئەو هەواڵەی لە مۆسکۆ زۆر

---

[596] د. عبداللطيف حمزة (١٩٥٥: ٣).

گرنگی پێ دەدرێت، لەوانەیە لە هیند هەر شیاوی بڵاوکردنەوەش نەبێ))[597]، ڕۆژنامەکان بزاوتەکانی ڕۆژانەی کۆمەڵگاکان تۆماردەکەن‌و سودێکی گەورە بە ئەرشیف دەگەیەنن، دەبنە بەڵگەنامەی ناڕاستەوخۆ بۆ لێکۆڵینەوە مێژوویی‌و کۆمەڵایەتییەکان‌و دەتوانرێت بەپێی ڕۆژنامەکانی ئەو دەمانە لەڕابردووی (شوێن، کەس، ڕوداو) بکۆڵرێتەوە. "ئەدمۆمبرگ" دەڵێت: ((ڕۆژنامە مێژووی ڕۆژانەی هەموو جیهانە... بۆیە دەبێت بە ئەمانەت‌و ڕاستییەوە ڕوداوەکانی تۆماربکەین))[598] یان دەوترێت: ((ڕۆژنامە سەرچاوەیەکە لە هەموو کاتێکدا خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە سەری، بەڵگە نامەیەکی مێژووییە بۆ کێشەو ڕووداوەکان..))[599].

٢.ڕەگەزی کات لە ڕۆژنامەنوسییدا، ڕۆژنامەوان دیاریی ناکات، بەڵکو لە بنەڕەتەوە ((لەکاتی ڕودانی ڕوداوێکەوە سەرچاوە دەگرێت..))[600]، کە بۆ دوو جۆر دابەشی دەکەین کە یەکەمیان کاتێکی زانراوەو پێشوەخت ڕۆژنامەوانی لێئاگادارکراوەتەوە وەك کردنەوەی پیشانگایەك لە هۆڵێکی دیاریکراوداو لە کاتێکی دیاریکراودا کە پێشوەخت ڕۆژنامەوانی لێئاگادار کراوەتەوە.

دووەمیان کاتێکی نەزانراوەو ڕودانی ڕوداوێك لە ناکاودا، بێ هەبوونی کاتێکی زانراوی پێشوەخت دەبێتە سەرەتا بۆ ئەو ڕوداوە، وەك (تەقینەوەی ئۆتۆمبیلێکی بەمینچێنراو). خۆ کاتێکیش لەنێو وتارێکی ڕۆژنامەنوسییدا ڕەگەزی کات بریتی بێت لە کاتی بڵاوکردنەوەو گونجاندنی بەکاتی ڕووداوو پێشهاتەکان، ئەوا کاتێك دەبێت کە وابەستەی تەمەنی کورتی ڕوداوەکە دەبێت کە دیسانەوە ڕوداو دەیهێنێتەکایەوە نەك کەسی ڕۆژنامەوان.

---

597 هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ :٥٥).

598 د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨: ١٠٧).

599 هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧ :٧٩).

600 د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨: ٦٦).

هەروەها لە ڕۆژنامەنوسییدا هەندێ بیرو ڕاو شیکار نەبێت کە بەپێی پشتبەستن بە ڕابردوو باس لە ئاینده دەکەن شتێك نییه پێش زەمەن بکەوێت و باس لە داهاتوو بکات و ئەو بابەتانەشی ئاماژەیان بۆ چارەنوسی ڕووداوەکان تێدا بێت وەك ڕای کەسی وەردەگیرێن نەك وەك زانیارییەکی چەسپاو.

٣.ڕەگەزی شوێن لە گرنگترین ڕەگەزەکانی بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان دەبێت، هەر لێرەوە ((شوێن وابەستەی شوێنی ڕوداو دەبێت))[601]، ئەمەش وادەکات سنورێك بۆفراوانیی ئەندێشەی وەرگر لەتێڕوانینی شوێندا دیاری بکات و تایبەتمەندی بداتێ و، لێیەوە بایەخی زانیاریەکان بەپێی شوێنی ڕوداو گۆڕنکاریی بنەڕەتی بەخۆیانەوە دەبینن.

٤. بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان وەك بەشێکی دانەبڕاو لەڕاگەیاندن دێنەکایەوەو تەنها لەناو توخمی سۆزداریدا ناڕسکێن ، بەڵکو بەپێی جۆری ڕوداو ، ڕۆژنامەوان لەنێو کارامەیی کەسیی خۆی و سیاسەتی کەناڵەکەیەوە ڕوویەك یان هەموو ڕووەکانی ڕوداوێك پیشاندەدات، کەلەهەمووبارێکدا جۆرێك لەڕاستیی تێدادەبێت و مەبەستی کەسی ڕۆژنامەوان نابێتە پێوەریی بنەڕەتیی بۆنوسینی بابەتەکان. هەرلێرەوە قوتابخانەی میونخی ئەڵمانیی ڕاگەیاندن بۆجۆرەکانی( خۆڕسکی ، ڕۆژانە ، سۆزداریی ، هۆشمەندیی ) بەش دەکات[602]، ئێمەش جۆری پێنجەم زیاددەکەین کەبریتی دەبێت لەتێکەڵاوکردنی ئەم جۆرانە پێکەوە یان چەند دانەیەکیان بەیەکەوە لەناو بابەتێکی ڕۆژنامەنوسیی دیاریکراودا[603]. کەسی ڕۆژنامەوان ڕێڕەوی ڕوداوەکان و کاراکتەرەکان و پاڵەوان و قوربانی و زەمەن و شوێن و ناسۆری و شادییەکان، یان هەر تەرزێکی تری ناو بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان دیاریی ناکات، بەڵکو واقعییەتی ڕوداوەکە خۆی هەموو ئەمانە

---

601 د. عبداللطیف حمزة (١٩٥٨: ٦٨).

602 بڕوانە: د. عبداللطیف حمزة (١٩٦٥: ٣٠).

603 بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٢پ: ١٢-١٣).

پێکدەهێنێت ((ڕۆژنامەوان ڕایەڵەیەکە لە نێوان ڕوداوەکانو وەرگرداو، ڕوداوەکان بۆ وەرگر دەگوێزێتەوە))[٦٠٤].

٦.ناوەرۆکی بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان بەپلەی یەکەم لە ئاستە هۆشمەندییەکانەوە سەرچاوە دەگرنو بریتی دەبن لە درکو خوێندنەوەو وێناکردنی واقیعییانەی بزاوتەکانی دەوروبەرو ڕوداوەکان. هەندێکجاریش بۆ دەستنیشانکردنی گرفتو تێڕوانینەکانی دی بەتایبەتی لە نوسینی ڕیپۆتاژو چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەنوسییەکاندا، ڕۆژنامەوان بۆ (ناوەوەی خود) دەگەڕێتەوە، نەك بۆ ئەوەی وەڵامێکی کۆنکرێتی بۆ خواستەکانی خۆی بەرجەستە بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی لە ڕێی ئەزموونی کەسییەوە، وەڵام بۆ پرسی ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان وەربگرێت، لێرەوەش ڕۆژنامەوان ئەکتەر دروست ناکات، بەڵکو ڕەگەزی کەس لە ڕۆژنامەنوسییدا وابەستەی ڕوداو دەبێتو بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان لە ئەنجامیاندا وەڵامدانەوەی پرسی (کۆ)ن نەك هی (خود)، ((وەرگر بڕوای وایە کە ئەو بابەتانەی ڕۆژنامەوانێك ئامادەی دەکات ڕاستو تەواوو پڕ وردەکارییە، ئەمەش دەچێتە خانەی ئەو ڕێکەوتنەی (بێ هەبوونی بەڵێننامەیەك) لە نێوان ڕۆژنامەوانو وەرگردا پێك دێتو خەڵك (وەرگر) لەسەر بنەمای ئەوەی وەری دەگرن هەڵسوکەوت دەکەن..، بۆیە زۆر گرنگە ئەو ڕێککەوتنە بپارێزرێت))[٦٠٥].

٧. ڕۆژنامەنوسیی لەگەڵ هزری مرۆڤدا دەدوێتو، داڕشتنەکان زۆربەیان بەشێوەی هەرەمێکی هەڵگەراوە دەنوسرێن و(گرێ) زۆربەکەمی بەدیدەکرێت وئەرکی ڕۆژنامەوان بریتی دەبێت لەکردنەوەی ئەو گرێیانە بۆوەرگر، نەك دانانی گرێ بۆسەرسامکردنی هزری وەرگر.

٨. بەرهەمە ڕۆژنامەنوسییەکان دەربڕینی خواستەکانی کۆمەڵنو لە هەوڵی ئەوەدا دەبن کە گرنگی بە لایەنی (کۆ) بدەنو خۆیان لە (تاکەکەس) دورخەنەوە، لە بارێکدا نەبێت کە تاکەکەس یان ڕەفتاری تاکەکەس کاردانەوەی لەسەر کۆ هەبێت

---

604 ملفن مینتشر (١٩٩٢: ٥).

605 ملفن مینتشر (١٩٩٢: ٥).

یان وابەستەی کۆمەڵ بێت، هەر لێرەوە ئەزموونی کەسی ڕۆژنامەوان هەرچەندە بابەتێکی گەورەی لە جوان خستنە ڕووی بابەتەکاندا دەبێت، بەڵام نابێتە فاکتەری بنەڕەتیی بۆ پیشاندانی ڕوداوێکی دیاریکراو، چونکە ڕاستەقینەیی ڕوداوەکە لە زۆربارردا خۆی دەبێتە ناوەڕۆك‌و فۆڕمی گشتیی بابەتەکە، ڕۆژنامەوان تەنها وەك تۆمارکەرێك تۆماریان دەکات‌و دەیانگوێزێتەوە، ڕۆژنامەوان وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە لە هزری وەرگردان ((کاری یەکەمی ڕۆژنامەگەریی ئاگادارکردنەوەی جەماوەرە بەو ڕوداوانەی کە ڕوو دەدەن..))[606].

٩.بنەمای هەموو بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان لە واقیعی ژیانی مرۆڤەکاندا هەن‌و ڕویانداوە، واتە ڕوداوێك ڕوودەدات دواتر دەبێتە بابەت، یان بابەتێك ڕایەڵەکانی خۆی بە ڕابردوو پێشینەی ڕوداوێکەوە دەبەستێتەوە ئینجا لەئەمڕۆ یان سبەی دەدوێت. واتە بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان خستنەڕووی ڕوداوەکانە وەك ئەوەی هەیە یان بووە، بۆیە سنورەکانی ئەندێشە بەتەواوی لە نوسینی بابەتەکاندا کزن یان تەواو دیاریکراون، کەواتە ڕۆژنامەوان لە زۆرباردا ئازاد نییە لەوەی چی گەرەکە بیکات‌و بینوسێت، بەڵکو وابەستەی ڕوداوەکان دەبێت کە ڕوودەدەن (واقیعیەتبوون لە سیما دیارەکانی ڕۆژنامەگەرییەو ڕووداوەکان هەموویان گێڕانەوەن لەو واقیعەی کە بەڕاستی ڕویداوە))[607].

١٠.لە ڕۆژنامەنوسییدا لایەنی بابەتی بەسەر لایەنی زاتییدا زاڵدەبێت، زانای ئەڵمانی (ئوتوگرۆت) لە پێناسەی ڕۆژنامەنوسییدا دەڵێت: ((بریتییە لە تەعبیرێکی بابەتیانە بۆ هۆشمەندی جەماوەر..، تەعبیرێکی بابەتیانە مەبەست پێی ئەوەیە کە تەعبیرێکی زاتی نییەو لەسەر بنەمای ڕاستیەکان بنیاتدەنرێت))[608]، ڕۆژنامەوان دادەبەزێتە ئاستی خەڵك‌و خوێنەرە ئاساییەکانەوەو بەزمانی ئەوان دەدوێت[609].

---

606 جون ل. هاتلنج (بلا: ١٣١).

607 هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٢ب : ٢٧).

608 د. عبداللطيف حمزة (١٩٦٥: ٢٣).

609 بڕوانە: د. شوقي ضيف (١٩٦٢: ٢٠٢).

١١. له ڕۆژنامەنوسییدا شێوازی هاوڕێیەتی له نوسینەکاندا پیادەدەکرێتو ڕۆژنامەوان گەرەکییەتی ڕوداوێك بخاتەڕوو وەکو ئەوەی کە بووە بۆ وەرگری بگێڕێتەوە، دیارە له هەندێکباریشدا پەتێتیی ڕوداوەکان وادەکەن کە تەبا نەبن بەسیاسەتی کەناڵێكو یان بێدەنگ بن لێی، یان بیشێوێنن کە دواتر له ڕۆژنامەنوسییەوە دەبێتە (پڕوپاگەندە)و مەبەستە باڵاکانی خۆی له دەستدەدات.

١٢.وەرگر جێی گرنگیپێدانی ڕۆژنامەکانەو بایەخێکی گەورەی پێدەدرێت، بەوەی هەموو پەیامەکان له پێناوی سەرنجڕاکێشانو کارتێکردنی وەرگردا دەبنو باری کۆمەڵایەتیی و کاتو شوێنی بڵاوکردنەوەی بابەتەکان گرنگییەکی زۆریان پێدەدرێت.

١٣ڕیکلامو ئاگانامەکان له کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی ڕۆژنامەنوسیین، لێرەوە بایەخێکی ئاڵوگۆڕکارییانە بەبەرهەمو تەکنیكو دواتر ئاوێزانکردنی بە کەس (کەسی گشتی) دەدرێت.

١٤. ڕۆژنامەنوسیی دەشێ وەك زانستێك بخوێنرێت و بەکاراکردنی کارامەیی کەسەکانو ئاوێتەکردنیان بە ئەزمونگەرێتی دیراسە بکرێتو خەڵك فێربکرێن لەسەر چۆنێتی ڕاڤەکردنو ئەنجامدانی . لایەنە جوانکارییەکان تێدا زۆرتر هونەرێکی کردارییین واتە (هونەرە له پێناو ژیاندا)، کەناڵەکان بە ئاسانیی دەقو بابەت له یەکتری وەردەگرنو چەند کەسێك بەشداردەبن له نوسینەوەو ئامادەکردنیاندا، (( ڕۆژنامەنوسیی له هەوڵی دروستکردنی ڕای گشتییدایە نەك چێژی گشتیی)) [٦١٠].

١٥. هونەرەکانی ڕەوانبێژیو جوانکارییو ڕازاندنەوە زیاد له سنوری دیاریکراو زیان بەواتاو لۆژیکی بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان دەگەیەنن، چونکە ئاسان نابێت هەموو کەس وەکویەك لێیان تێ بگات ((خزمەتکردنی ڕاستی ئەرکی سەرەکی ڕۆژنامەوانە)) [٦١١]، نوسینی ڕۆژنامەنوسیی بەئاسانییو ڕونییەوە دەنوسرێتو

---

[610] توفیق الحکیم (١٩٧٣ : ١٨٦).

[611] جون ل. هاتلنج (بلا: ١٣١).

واتاگەلێك لە وشەكاندا بەرجەستەدەكات كە ئاشكرابن‌و هەموو جەماوەر تێی بگەن[612].

١٦. لە بابەتە ڕۆژنامەنوسییەكاندا، ڕۆژنامەوان دەیەوێت ئاشنامان بكات بەو دیمەنەی كە خۆی دیویەتی‌و تۆماریكردووە، تا هەمان وێنەی فۆتۆگرافیی گیراو لە هزری وەرگردا بچەسپێنێ. كەواتە ڕۆژنامەوانەكان لە تۆماركردنی ڕوداوێكدا بەتایبەتی لەئامارو زانیاریی ژمارەیی‌و دەرخستنی بنەڕەتییەكانیدا هەموو تەبا دەبن لەوەی هەمان زانیاری وەرگیراو پەخشدەكەنەوە، بێ هەبوونی جیاوازی بنچینەیی لە ناوەڕۆكەكانیاندا.

١٧. ڕۆژنامەكان تەنها (بیرو ڕا) پەخش ناكەن، بەڵكو لەتەك دەربڕینی بیرو ڕادا زانیاریش بڵاودەكەنەوەو ڕاكانیش پێویستە خزمەت بەزانیارییەكان بكەن، زانیارییەكانیش لە ئاستێكدا دەبن كە توانای چەسپاندنیان هەیە.

١٨. بابەتە ڕۆژنامەنوسییەكان دابڕناكرێن لەخواستەكانی خەڵك، لێرەوە ئەو بابەتە دەخرێتە پێشەوە كە وەرگر بەلایەوە گرنگە، ((پرۆسەی فیدباك لە ڕۆژنامەنوسییدا ئەو پرۆسەیە دەبێت كە ماكی زیندوویی‌و بەردەوامیی بەنێوانی وەرگرو نێرەردەبەخشێ))[613]، وەرگر دەتوانێت بەتەواوی ڕەوتی ڕوداوەكان بگۆڕێت‌و بەشداری هەبێ لەپرۆسەی گۆڕیندا.

١٩. ڕۆژنامەوان سەلیقەو توانست‌و كارامەیی وەرگرتنی داتاكانی گەرەكە تا بتوانێت هێمای هاوبەش‌و شیاویان بۆ هەڵبژێرێت‌و بۆ جارێكی دی وێنای دیمەنی ڕوداوە بینراوەكانی پێ بكاتەوە، بەشێوەیەك كە لە توانای وەرگردا هەبێ هەمان وێنە لە ڕێی خوێندنەوەی بابەتەكانەوە لە هزریدا بخەملێنێت، بۆیە هاتنی دەستەواژەكان لەچۆنیەتی ڕووداوەوە سەرچاوە دەگرن‌و لەهەموو بارێكدا وابەستەی خواستە هونەرییەكانی خودی ڕۆژنامەوان، نابن.

---

[612] بڕوانە: د. عبدالستار جواد (١٩٩٩ : ١١).

[613] جون ر بیتنر (١٩٩٠: ٢٢).

٢٠. زمانی ڕۆژنامەنوسیی، زمانێکی هاوبەشە لەگەڵ زمانی ئاخاوتنی خەڵکداو ئامانجی تێگەیاندنی هەموو خەڵکە بە ئاستو پلە باڵاو نەوییەکانی کۆمەڵەوە، زمان بۆ گەیاندنی بیرو زانیارییەکانە وەکو خۆیان بە وەرگرو دوور لە هەر بەکارهێنانێکی گرانی وشەو دەستەواژەکانو، دەیەوێت بەخێراترین شێوەو بە کەمترین دەربڕین بەرامبەر لە ناوەڕۆکی پەیامەکەی بگەیەنێت ((ڕۆژنامەوان زاراوە گرانو سەختو قورسەکان دەگۆڕێ بە زاراوەیەك کە بگونجێت لەگەڵ باری کرداری ژیانی ئاسایی خەڵکدا))[٦١٤].

٢١. ڕۆژنامەنوسیی لەئەنجامی کاری پرۆسەیەکی بەکۆمەڵەوە دێتە کایەوەو چەند کەسێك لەبەرهەمهێنانیدا بەشداردەبن، وەك (هەواڵدەر، پەیامنێر، نوسەر، بەرپرسی بەش، ستافی نوسین، سەرنوسەر...)و لە زۆر باردا ئەوەی دەنوسرێت گوزارشت لە بۆچوونی خودی نوسەرەکەی ناکات، ئەوەندەی گوزارشت لەسیاسەتی کەناڵەکە، یان سیاسەتی زاڵ بەسەر کەناڵەکەدا دەکات ، بەتایبەتی (هەواڵو سەروتارو لێدوانەکان).

٢٢. لە ڕۆژنامەدا هەمەڕەنگیی لە بەکارهێنانی چەندێتییو چۆنێتیی بابەتەکاندا هەیە بۆ ئەوەی ئەو بازاڕە گەورەیە بێت کە پێداویستی هەر کەسێکی تێدا بێت کە دێتە ناویەوە، بەهیچ جۆرێك لە کۆنتێکستی گشتی ڕۆژنامەکەدا (یەکێتی بابەت)، نییە.

٢٣. ڕۆژنامە وابەستەی زەمەنە لێرەشەوە وابەستەی کاتی دەرچوون دەبێت، هەر ئەمەش چۆنێتی ئەو بڵاوکراوەیە دیاریدەکات بەوەی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەیە یان هەفتانەیە، یان مانگانەیە،...تاد.

٢٤.چەشنە سەرەکییەکانی نوسینی ڕۆژنامەنوسیی بریتی دەبن لە چەشنە خودییو بابەتییەکان.

---

[614] طلعت همام (١٩٨٨: ١٢).

## ٢/٣) پیرەمێرد، ئەدیب و ڕۆژنامەوان

### ٢/٣-١) پیرەمێردو کورتەیەکی مێژویی

ناوی "تۆفیق" کوڕی "مەحمود ئاغای کوڕی هەمزاغای مەسرەف"ە، هەمزاغا سەرۆك وەزیرانی ئەحمەد پاشای دوا حوکمداری بابان بووە، لە ساڵی ١٨٦٧ز، دا لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوەو لەتەمەنی حەوت ساڵییدا خراوەتە قوتابخانەی مەلا حسێنە گۆجە، دواتر چۆتە فەقێیەتیی و سەرەتا لە مزگەوتەکەی خۆیانەوە (مزگەوتی هەمزاغا) دەستی بەعەرەبیی خوێندن کردووە، چەند مزگەوتێکی سلێمانی کردووەو دواتر سەردانی "بانە"شی کردووە[٦١٥].

لێرەوە بڕگەی یەکەمی قۆناغی سەرەتایی وابەستەبونی پیرەمێرد بەبوارەکانی تێگەیشتن و خوێندن و فێربونی زمان و ئایینەکان دەستپێدەکات، پیرەمێردی خاوەن میراتی هەمزاغای خاوەن دەسەڵاتداریێتیی و حوکمڕانیی، تێکەڵ بەتێگەیشتن لە ئایین و فێربونی زمانی عەرەبیی و دۆزینەوەی جیاوازیی نێوان ئەو مزگەوتانەی لێیانەوە بنیاتی ڕۆشنبیریی خۆی لەسەریان داناو تێکەڵاوبون بەخەڵك، ئەزمونگەلێکی بەرایی بوون بۆ کەسێك کەساتەوەختەکانی ژیانی خۆی بەبێهودەیی و بێکارییەوە بەسەرنەبردووەو بەدوو ئاراستەی تەریب، خوێندن و زانست لەگەڵ ئەزمون و تاقیکردنەوەکانی ژیان، پەرەی بەتوانستەکانی خۆی داوە. لەساڵی ١٨٨٢دا دەبێتە کاتبی نفوسی سلێمانی، دواتر بەکاتبی زەبت، لە ساڵی ١٨٨٣دا دەبێتە کاتبی ئەملاکی هۆمایۆنی لە هەڵەبجە، لە ١٨٨٦دا دەبێتە باشکاتبی مەحکەمەی شارباژێڕ، لە تشرینی یەکەمی ١٨٩٥دا دەبێتە معاون مدیری شاری "کەربەلا"، هەندێك سەرچاوەی تریش دەڵێن: ((پۆستەکەی جێگری دادوەری گشتیی کەربەلا بووە))[٦١٦] ، بەڵام ناچێت و دەست لەکاروباری میریی دەکێشێتەوە[٦١٧] ، لەم ماوەیەدا (شێخ مستەفای نەقیب) کردویەتی بەوەکیلی خۆی

---

[615] بڕوانە: عەلائەدین سەجادی (١٩٧١: ٤٥٧).

[616] بڕوانە: مالمیسانژ (٢٠٠٧: ٩٨).

[617] عەلائەدین سەجادی (١٩٧١: ٤٥٨).

بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی[618]. دەشێت ئەمە بەبڕگەی دووەمی قۆناغی یەکەمی ژیانی پیرەمێرد دابنرێت، کە ئاشنابوونو تێکەڵاوبوونو فێربوونو دۆزینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان خەڵكو یاسا، دەسەڵاتو یاسا، کێشەکانی خەڵك، ژیانی ڕۆژانەیان، بینینی شوێنی جۆراوجۆر، خەڵکی جۆراوجۆر، ئەزمونی جۆراوجۆری لێکەوتۆتەوە، کە هەموو ئەمانە لە تەوەری ئاوێزانبونی زانستو ئەزموندا خۆیاندەبیننەوە.

لەساڵی ١٨٩٨دا قۆناغی دووەمی ژیانی پیرەمێرد دەستپێدەکاتو دەچێتە تورکیاو ساڵی دواتر دەچێتە حەجو لەو ساڵەوە دەبێتە "حاجی تۆفیق"و لەلایەن پاشای عوسمانییەوە پلەی "بەگ"ێتیشی دراوەتیو بووە بە "حاجی تۆفیق بەگ"[619]و لە ١٤ی ئەیلولی ١٨٩٩دا فەرمانی شاهانەی بۆ دەردەچێتو دەبێتە ئەندامی مەجلیسی عالی ئەستەمبوڵ[620].

ئەمەی سەرەوەش بڕگەی یەکەمی ئەم قۆناغە پێکدەهێنێت، تیایدا ئەزمونگەریی بەردەوامە، بینینی ئەستەمبوڵو حەجو پێکهێنانی سێگۆشەیەك لە نێوان: سلێمانی-ئەستەمبوڵ-مەککەداو گۆڕانی وەرگرتنی زانیاریی لە سنورێکی داخراوی شارێکی بچوکی وەك سلێمانییەوە بۆ ئەستەمبوڵی پردی نێوانی ئەوروپاو ئاسیاو خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، بۆ سەنتەرێکی جیهانیی وەك مەککە، کەلێیانەوە دنیابینینێکی زیاتر بۆ پیرەمێرد فەراهەمدەبێت، دواتر گەڕانەوەی پیرەمێرد بەو کەلتورو میراتەی هەمزاغاوە بۆ ناو کایەکانی حوکمڕانیی، بەڵام ئەمجارەیان حکومڕانییەك لە دەسەڵاتێکی ئیمپراتۆرگەریی وەك عوسمانیدا.

پیرەمێرد دێتەوە سەر تەوەری خوێندنو وزانست، لەساڵی ١٩٠١دا لە کۆلیژی حقوق وەردەگیرێتو لەساڵی ١٩٠٥دا بڕوانامەی حقوق بەدەستدێنێت[621]، لە تەموزی ١٩٠٥دا کە بانگی مەشروتیەت دەدرێت مەجالیس تێکدەچێت، لە ساڵی

---

[618] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٤٩).

[619] بڕوانە: عەلائەدین سەجادی (١٩٧١: ٤٥٨).

[620] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٤٩).

[621] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو( ٧٧).

١٩٠٧دا (کۆمەڵەی کورد) بەنهێنیی بەسەرۆکایەتیی (شێخ عەبدولقادری شێخ عەبدوڵای شەمزینی) پێکدێت، پیرەمێرد یەکێك دەبێت لە ئەندامەکانی، تا ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەمبوڵ بەپیشەی پارێزەریی و نوسین و دەرکردنی گۆڤارو ڕۆژنامەوە خەریك دەبێت[٦٢٢].

لەساڵی ١٩٠٩دا دەبێتە قایمقامی چۆڵەمێرگ[٦٢٣]، لە نیسانی ١٩١٢دا دەبێتە قایمقامی قەرەمورسل، لە شوباتی ١٩١٥دا دەبێتە قایمقامی بالاوا، لە ئەیلولی ١٩١٦دا بەهەمان پلە دانراوە بۆ (بیت الشباب)، لە مارتی ١٩١٧دا تادەبێتە مەتەسەڕیفی شاری ئەماسیە، چەند شوێنێکی کردووە[٦٢٤]، ((لە نیسانی ١٩١٨دا دەبێتە مەتەسەڕیفی ئەماسیە))[٦٢٥] و تاساڵی ١٩٢٣ لەوێ بووە*، کە حکومەتی عیراق لە ساڵی ١٩٢٣-١٩٢٤ دادەمەزرا، لە تورکیاوە گەڕایەوە بۆ بەغداو لە وێوە بۆ شاری سلێمانی و لە کانونی دووەمی ١٩٢٥دا گەیشتەوە سلێمانی[٦٢٦].

بڕگەیەکی تری بەهاداری ژیانی پیرەمێرد لە قۆناغی دووەمدا، تێکەڵاوبوونە بەئەدەب و ڕۆژنامەگەریی، کەنەك تەواوکەری بڕگەکانی تری ژیانییەتی بەڵکو ئەو ئەنجامەن کە لەهۆکاری بڕگەکانی ترەوە هاتۆتەکایەوە، یاخود ئەو جوڵەیەیە کە بڕگەکانی تر بەژیانی پیرەمێردیان بەخشیوە، واتە تێکەڵاوبون و هاوڕێیەتیی دەسەڵاتدارو یاساناس و تێکۆشەرو خوێندەوارو ئەدیب و زاناو جێگۆڕکێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، خەرمانی زاتیی پیرەمێردیان بابەتییانە دەوڵەمەندکردووە، بۆیە داری پیرەمێرد لەلایەك ئەدەب و لەلایەکی تریەوە ڕۆژنامەنوسیی دەردەکات.

---

[622] سەرچاوەی پێشوو (٥٠).

[623] بڕوانە: د.معروف خزنەدار (٢٠٠٠: ١٥٣).

[624] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥٠).

[625] د.معروف خزنەدار (٢٠٠٠: ١٥٣).

* عەلائەدین سەجادی (١٩٧١: ٤٥٩)و د. مارف خەزنەدار (٢٠٠٠: ١٥٣)، ڕایان وایە پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٢٠دا لە حەڵەبەوە گەڕابێتەوە بۆ عیراق و دواتر بۆ سلێمانی، بەڵام ڕای ئەم بەڕێزانە هەڵەیە، چونکە بەخێرهاتنەوەکەی پیرەمێرد لە ژمارە (١٤)ی ڕۆژنامەی ژیانەوەدا بڵاوکراوەتەوەو ناوەڕۆکەکەی ئەوەی ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥٠) دەسەلمێنێت. بڕوانە: پاشکۆی (أ :١).

[626] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥٠).

## ٢-٢/٣) پیرەمێردو ئەدەب

پیرەمێرد لە دنیا فراوانەکەی ئەدەبەوە هاتۆتە کایە ڕۆشنبیرییەکەوەو هەر لەوێشەوە تێکەڵ بەڕۆژنامەنوسیی بووە، ئەو دەڵێت: (( لە بیرمە معلم ناجی مەرحووم لە قیسمی ئەدەبیاتی ترجمانی حقیقتدا سەرپەرشتی ئەکرد، لێرەوە پەنجا ساڵ لەمەوپێش (١٨٨٣ز)، مەنزوومەیەکم نووسیبوو دەرجی غەزەتەی کردبوو....تاد))[٦٢٧] ، تاچونی پیرەمێرد بۆ ئەستەمبوڵ بەرهەمێکی دیاری ئەدەبیی ئەو نابینرێت، تەنها هەندێك هەوڵ و گێڕانەوە هەن کە بۆ قۆناغی سەرەتایی ژیانی پیرەمێرد دەگەڕێنەوە[٦٢٨] ، پیرەمێرد دەنوسێت: ((پێش ئەوەی بچمە ئەستەمووڵ، کەشکۆڵێکم نووسیبوو بەکاغەزی زەردو شین و سوورو مۆر، هەرچی شاعیرێ کە بیستبووم چەند غەزەلێکی نایابی ئەوم نووسیبوو، خەڵك و خوا ئەیان برد لە بەریان ئەنووسیەوە. تاقەتیان نەدەبوو، هەر لاپەڕەیەکی شیعری خۆشی تیا بوایە ئەیان پچڕی و دەریان دەهێنا، تا دوایی سوێنم خوارد بە کەسی نەدەم، بەوەیش وازیان لێ نەهێنام، ناچار لە ژووری ئەو خوارە چاڵە گەنمێکی ساڵی گرانیمان مابوو خستمە چاڵەکەوە، بەسەریا ڕۆییم بۆ ئەستەمووڵ، خوا ئەیزانێ لەو چاڵەدا وەك قامیشە نەیەکەی کە مەولانای ڕۆمی مەسنەوی لەسەر داناوە، چەند بۆ خۆی شەرحی جودایی داوە تا نەماوە))[٦٢٩] ، دەربارەی ئەزمونی خۆیشی لەگەڵ شیعرو شاعیراندا دەنوسێت: ((نازانم چ دەردێك بووبە منەوە نووسابوو هەر لە منالییەوە دڵم دابوە شیعرو گۆرانی. دەنگی خۆشم لە بەر شیعری خۆش، دەویست. هەتا (مەولەوی)م نەناسیبوو (نالی)م لەلا پێغەمبەری شیعری کوردی بوو))[٦٣٠] ، ((لە منداڵییەوە ئولفەتم لەگەڵ شیعرو ئەدەبیاتی ئێران دا بوو کە ئێران جیلوەگاهی

---

[627] بڕوانە: ژیان (١٩٣٣: ژ ٣٧٥: ٣)، پاشکۆی (أ : ٢).

[628] بڕوانە: محمد رسول هاوار (١٩٧٠: ٩٤)، عەلائەدین سەجادی (١٩٧١: ٤٦٢)، ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥١).

[629] بڕوانە: ژیان (١٩٣٨: ژ ٥٤٧: ١)، پاشکۆی (أ : ٣).

[630] سەرچاوەی پێشوو.

شیعر بوو))[٦٣١]، پیرەمێرد هەر خۆی دەنوسێت: ((لە هەڵەبجە بووم خووم دابووە ئەوەی بزانم ئەو شارە کۆنانەو ئەو هەڵبەستە خەرافاتە، کەی بوون؟ لە کوێوە هاتوون؟ وەك ئەمەی –کۆی ئاتەشگا– کە زۆرتر مەولەوی لە گۆرانیەکانی خۆی دا ناوی بردووە))[٦٣٢].

(عەلادین سەجادی) پێی وایە پیرەمێرد لە تەمەنی دە ساڵییەوە سەلیقەی شیعر وتنی هەبووە[٦٣٣]، (محەمەد ڕەسوڵ هاوار)یش دەڵێت: ((هەر لە منالییەوە نیشانەی ئەم بەهرەیەی تیا دیاری دابوو،...ئەوە بوو لەگەڵ مامۆستاکەیدا لەسەر شیعرێکی خواجە حافیز تێك ئەچێ))[٦٣٤]، (( هەر لەو ماوەیەدا شیعرێك بە فارسی بۆ دروستکردنی خانووەکەی وەسمان پاشای جاف دەنووسێ، دەبێت ئەو سەردەمە پیرەمێرد تەمەنی (١١،١٢) ساڵان بووبێت))[٦٣٥].

ئەستەمبوڵ بەهرەکانی پیرەمێرد دەبوژێنێتەوە، جگە لەو هەموو نوسینو شیعرانەی لەسەردەمی ئەستەمبوڵدا لە بڵاوکراوە جیاجیاکاندا بڵاویکردونەتەوە، بەهاتنەوەشی بۆ سلێمانیو بەدانانی چاپخانەکەی بایەخگەلێکی گەورەتری بەبواری ئەدەب داو ڕۆڵێکی دیاری لە مێژوی ئەدەبو ڕۆشنبیریو ڕۆژنامەنوسیی کوردییدا بینی، بۆیە جگە لە بەرهەمە ڕۆژنامەنوسییەکانی ئەم بەرهەمانەیشی نوسی[٦٣٦]:

١. دیوانی مەولەوی (ئەسڵو ڕۆح)، ساڵی ١٩٣٥، لە چاپخانەی ژیان بەدوو بەرگ لەچاپی داون.

---

631 بڕوانە: ژین (١٩٤٩: ژ ٩٦٧: ١)، پاشکۆی (أ : ٤).

632 بڕوانە: ژین (١٩٤٢: ژ ٦٨٩: ١)، پاشکۆی (أ : ٥).

633 بڕوانە: عەلائەدین سەجادی (١٩٧١ : ٤٦٢).

634 بڕوانە: محمد رسول هاوار (١٩٧٠ :٩٤).

635 سەرچاوەی پێشوو.

636 بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٦١–٦٢).

٢. مەمو زین، چیرۆکێکی تراژیدیی دڵدارییە، پیرەمێرد لە شێوەی شانۆنامەدا ئامادەیکردووەو لەساڵی ١٩٣٥دا لە چاپخانەی ژیان چاپیکردووە.

٣. چیرۆکی دوانزەسوارەی مەریوان، ساڵی ١٩٣٥ نوسیویەتی.

٤. چیرۆکی مەحمود ئاغای شیوەکەڵ، لەساڵی ١٩٤٢دا نوسیویەتی.

٥. گاڵتەوگەپ، ساڵی ١٩٤٧.

٦. ڕۆمانی کەمانچەژەن، ساڵی ١٩٤٢ لە تورکییەوە کردویەتی بە کوردی.

٧. دیوانی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی، بە زنجیرە لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاویکردۆتەوە.

٨. بەشێکی زۆری شیعرەکانی وەلی دێوانەوبێسارانی، لە هەورامییەوە کردون بە شێوەزاری سلێمانیو، چەندین شیعری شاعیرانی هەورامانو زەنگنەشی گۆڕیوەتە سەر شێوەزاری سلێمانی.

٩. نوسینی کۆمەڵێك پەخشانی هونەریی جوان.

١٠. نوسینی چەندین زنجیرە وتار دەربارەی مێژوی کورد، مێژوی میرنشینی بابان،...تاد.

١١. نوسینی هەزاران بەیت شیعر، کە دواتر لەسێ بەرگی قەبارە گەورەدا، کە کۆی هەرسێکیان (١١٠٠)لاپەڕەیە چاپکراون[٦٣٧].

١٢. نوسینی ٦٤٤٨پەندی پێشینان بە شیعر، کە دوای هەوڵەکانی کاکەی فەللاح، بەم دواییانە، لەسێ بەرگی قەبارە گەورەدا بە (٩١٢)لاپەڕە بڵاوکراونەتەوە[٦٣٨].

١٣. نوسینی چەندەها بەندو بەیتی فۆلکلۆرییو چیرۆکی فۆلکلۆرییو چیرۆکی منداڵانو مەتەڵ.

---

[637] بڕوانە: دیوانی پیرەمێرد: (١٩٩٠: ب١)،(٢٠٠١:ب٢)،(٢٠٠١:ب٣).

[638] بڕوانە: پەندەکانی پیرەمێرد: (١٩٩٥: ب١)،(١٩٩٥:ب٢)،(١٩٩٦:ب٣).

پیرەمێرد لە بایەخدان بە کلتورو فۆلکلۆری نەتەوە دریغیی نەکردووە، هەر ئەمانەیشی کردۆتە کەرەستەیەکی بەنرخی بەرهەمە ئەدەبییەکانی، بەلام تائەمڕۆیش پیرەمێرد وەك پێویستە بایەخی پێنەدراوەو وەك ئەوەی هەبووە نەخوێندراوەتەوە، (( لە باسی پیرەمێرددا زۆرجار نووسەرو ڕەخنەگران ئەو هەوڵو تەقەلایەی پیرەمێرد داوی یە بۆ نوێ کردنەوەی ئەدەبی کوردی بەجوانی لایان دەرنەکەوتووە، ئەگەرچی پیرەمێرد خاوەنی قوتابخانەیەکی ئەدەبی نەبوو. بەلام یەکەمین ئەدیبێك بووە کە پێشڕەوایەتی ئەم ڕێبازە نوێیەی کردووە (ڕێبازی ڕۆمانتیکیی)، لە ڕووی نەتەوەییەوە، لە زمان دا گەڕانەوە بۆ کەلەپوری میللیو هەڵگرتنی دروشمی نووسینی کوردی پەتی، خۆیو گۆرانی شاعیر* بەبێ وچان بەدوای زاراوەو وشەی کوردی پەتی دا وێڵ بوون، زۆرجار شۆڕدەبوونەوە بۆ ناو سامانو کەلەپووره میللییەکان، ڕۆژ بەڕۆژ هەوڵی پاك کردنەوەی زمانی ئەدەبییان دەدا لە وشەو زاراوەی بێگانە، بەم هۆیەشەوە سەرگوزشتەو گۆرانیو داستانی میللی بوژایەوە، بووە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ شاعیرو نووسەرانی کورد))[٦٣٩]، لە بواری شیعردا شیعرەکانی پیرەمێرد بەپێی ڕێبازە ئەدەبییەکان بەسەر شیعری کلاسیکیو ڕۆمانتیکییو ڕیالیزمییدا دابەش بوون[٦٤٠]، وەك شاعیرانی تر پیرەمێردیش بە لاسایکردنەوەی شاعیرانی کلاسیك دەستی پێکردووە، بەلام دواتر بۆتە یەکێك لە شاعیرە دیارەکانی ڕۆمانتیکیی کوردیی.

لە بواری چیرۆکنوسینیشدا چەند چیرۆکێکی هونەرییو جوانی هەیە، کە بابەتەکانیان کۆمەلایەتییەو لە کەلەپوری کۆنی کوردەوارییەوە دروستی کردون، هەموو ئەم چیرۆکانەی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بلاوکردۆتەوە، بەشێکی زۆریان

---

* ئەم لێکدانەوەیە بەم جۆرە هەڵەیەو غەدرکردنێکی ترە لە خودی پیرەمێرد، چونکە پیرەمێرد نەك هەر دیارترین پێشڕەوانی ئەدەبی ڕۆمانتیکییو ڕیالیزمیی کورد بووە، بەڵکو مامۆستای گۆرانیش بووە.

[639] خورشید ڕەشید ئەحمەد (١٩٨٩ : ٦).

[640] بڕوانە: خورشید ڕەشید ئەحمەد (١٩٨٩ : ١٦٢).

دەچنە خانەی کورتە چیرۆکی کوردییەوە[٦٤١].((ئەو شاعیر بووەو لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەنووسێك بووە کە دەبوا هەرچۆنێك بێت ڕۆژنامەکەی لە کاتی خۆیدا دەرچێت، وتارو شیعرو وەرگێڕانو بابەتەکانی تری ڕۆژنامەکە ئامادەبکات، هەموو تەرکیزو کاری ئەدەبیو بیرکردنەوەی بۆ شیعر نەبووە. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٣٢دا شیعرێکی ڕۆمانتیکی دەنووسێتو لە ١٩٥٠دا وەك لە ژمارەکانی دوایی "ژین"دا دیارە شیعرێکی لاسایی شاعیرە کلاسیکییەکانی نووسیوە. بە پێچەوانەوە، لە ساڵی ١٩٤٨دا سروودێکی بەرزی بڵاوکردۆتەوەو تەواو بۆتە شاعیرێکی ڕیالیزمیو شۆڕشگێڕ، بەڵام لە نیوەی سییەکاندا لاسایی مەولەوی کردۆتەوەو بۆتە دەروێشو دیوانەی خەڵوەتگاهێكو پەنا دەباتە بەر مەزاری پیاوچاکێك و لێی دەپاڕێتەوە کە نەتەوەکەی ڕزگار بکاتو بکەونە سەر ڕێی یەکگرتنو پێشکەوتن))[٦٤٢].

زمان کە بەهادارترین ئامڕازی گوزارشتکردنی ئەدەبو ڕۆژنامەنوسییشە دەستەمۆی بەهرەمەندیی پیرەمێرد بووە، زۆرجار خۆی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە (( زمانی کوردی هەموو شتی لێ دەردێتو هەموو مانایەکی پێ پێکدێت))[٦٤٣].

پیرەمێرد یەکێکە لەوانەی کە چەندین زاراوەو وشەی نوێی هێناوەتە ناو فەرهەنگی نەتەوەییمانەوە، وەك وشەکانی (ئاغەڵ، ئافەراندن، بردە، بنەجووت، بوارپێدان، بۆشیی، بەشدار، بێکەسخانە، پەخشان، پەڕاگەندە، پەروەردە، پیاسە، پیت، تراژەدی، تۆپبازی، تەندروستی، تیپ، تیپەن تیپەن، جوانکاری، زانین، سپای زۆربگیر، سروشت، سەرپەڕە، سەربەند، سەرستون، سەرەتا، سەیرکەر، فرەلق، کارخانە، کردوکۆش، کردە، کرێکار، کەمتەرخەمی، لق، گوڵەوەچنی،

---

[641] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٦٢-٦٣).

[642] ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٦٤).

[643] سەرچاوەی پێشوو(٦٣).

منالّخانه، نووسیار، نموونەنمایی، نوێنه، هونەرنمایی، وردەبین، وەرگێڕان، دەستدار، سووتەنی، مێخ،...تاد)[٦٤٤].
له بواری پەخشانی هونەریشدا ((قەڵەمی پەخشان نووسینی بێ وێنەیە))[٦٤٥]، پیرەمێرد وەك خۆی دەڵێت زمانەکانی تورکیی و فارسیی و عەرەبیی بەچاکیی زانیوە، هەر ئەمەش وایکردووە بوارێکی گرنگی وەك (وەرگێڕان) بایەخپێبدات. له بواری ئەدەبی بەراوردکاریشدا ئەگەرچی له پێش پیرەمێرددا، له ڕۆژنامەی "تێگەیشتنی ڕاستی" ساڵی ١٩١٨و له کتێبی "ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد"ی ئەمین فەیزیدا بەکورتیی هەوڵێك بۆ بەراوردکردنی شیعری کوردیی و فارسیی و تورکیی دراوە، بەڵام وەك پیرەمێرد بەئاشکراو ناوهێنانی و دەستنیشانکردنی دیارینەکراوە، پیرەمێرد له ساڵی ١٩٣٦دا له ژێر ناوی " بەراوردی ئەدەبیاتدا"[٦٤٦]، کورتە باسێکی ئەم بەراوردە دەکات، شیعرێکی عەرەبیی و کوردیی و تورکیی و فارسیی، واتە ئەدەبیاتی چوار نەتەوە بەراورددەکات، کە هەر چواریان بۆ یەك بابەت وتراون، ئەمەش ڕۆڵی ئەو له ئەدەبی بەراوردکارییدا دەردەخات[٦٤٧].

---

644 بڕوانه: ڕەفیق ساڵح، سدیق ساڵح (٢٠٠٥: ٦-٩).

645 ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٦٣).

646 بڕوانه: ژیان (١٩٣٦: ژ ٤٦٣: ٥)، پاشکۆی (ا : ٦).

647 بڕوانه: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٧٣).

### ٣-٢/٣) پیرەمێردو ڕۆژنامەنوسیی

قۆناغی ئەستەموڵی پیرەمێرد، قۆناغی تەقینەوەی بەهرەی هونەرمەندانەی پیرەمێردو بەرجەستەبوونی بەخشش‌و بەرهەمەکانییەتی، ئاوێزانبوونی پیرەمێردێکی ئەدیبی ئەزمونگەری زاتیی‌و زانستییە، گۆڕانی پیرەمێردە لە زاتەوە بۆ بابەت، لە تاکەوە بۆ گشت، لە ئەدەبەوە بۆ ڕۆژنامەنوسیی، بەجۆرێك کە شەقڵی هەریەکەیان لەم پرۆسەی ئاوێتەکردنەدا دەپارێزێت، پیرەمێرد دەڵێت: ((ئێمە زۆرترمان لە وێوە لە ئەستەمووڵەوە پێگەیشتووین))[٦٤٨]، لێرەوە پیرەمێرد دێتە کایەی ڕۆژنامەنوسییەوە، لەخوارەوە ڕیزبەندێکی کورتی ئەو بڵاوکراوانە دەکەین کە پیرەمێرد یان خاوەن یان سەرنوسەر یان دەستەی نوسەران یاخود نوسەرێکی هاوکار یان بەشداربووە تیایاندا[٦٤٩]:

١. گۆڤاری (ڕەسملی کاتب)، لە ئەستەموڵ دەرچووە، خاون ئیمتیازی حاجی تۆفیق بەك بووە، (هیچ زانیارییەك دەربارەی ئەم گۆڤارە دەستنەکەوتووە).
٢. خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەی کورد تەعاون تەرەقی غەزەتەسی[*] بووە، کەڕۆژنامەیەك بووە بە کوردیی‌و تورکیی لە ئەستەموڵ دەرچووەو کۆمەڵەی کورد تەعاون‌و تەرەقی دەریانکردووە[٦٥٠]، ژمارە یەکی لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٠٨دا دەرچووەو دواژمارەی کە ژمارە (٩)بووە، لە

---

[648] بڕوانە: ژین (١٩٤٧: ژ ٨٩٣).

[649] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥٤-٥٥).

[*] ئەم ڕۆژنامەیە ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بووە، دەربارەی وادەی دەرچونی (ئومێد ئاشنا :٢٠٠١: ٥٤) بەهەڵە ڕۆژی دەرچونی ژمارە یەکی بە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٨و دوا ژمارەی بە حوزەیرانی ١٩٠٩ دیاریکردووە، هەردوو ئەم مێژووانە هەڵەن، ڕاستەکەی ئەوەی سەرەوەیەو بۆ دڵنیابوون، بڕوانە : کرد تعاون و ترقی غزتسی (١٩٠٨: ژ ١: ٢)، پاشکۆی (أ : ٧)، یان : نەوشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠١ : ٧٨).

[650] بڕوانە: مالمیسانژ (٢٠٠٧: ٢١).

١٧ی کانونی دووەمی ١٩٠٩دا دەرچووە[٦٥١]. ئەم ڕۆژنامەیە بە دووەم ڕۆژنامەی کوردستان‌و بەیەکەم بڵاوکراوەی کورد لە ئەستەموڵ دادەنرێت[٦٥٢]. بایەخی ئەم ڕۆژنامەیە لەوەدایە کە جگە لەوەی پیرەمێرد بە هەردوو شێوەزاری کرمانجی سەروو خوارو بابەتی تیانوسیوە، لەهەمانکاتدا یەکەم ڕۆژنامەی کوردییە لە مێژوی ڕۆژنامەنوسیی کوردییدا کە وێنەی بڵاوکردبێتەوە[٦٥٣]

٣. لەگەڵ (فائق صبری بەگ)دا ڕۆژنامەی (مصور محیط)یان دەرکردووە[٦٥٤].

٤. لە زۆربەی ژمارەکانی گۆڤاری (ژین)[٦٥٥]ی ئەستەموڵدا بابەتی هەیە،ئەم گۆڤارە ژمارە یەکی لە ١٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٨دا دەرچووەو ژمارە(٢٥)ی لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩١٩ ئەستەموڵ بە کوردیی‌و تورکیی (٢٥) ژمارەی لێدەرچووە[٦٥٦]. لەم بڵاوکراوەیەدا پیرەمێرد ڕۆڵی دیاری هەبووەو بەچەندین ناوی جیاجیاوە بابەتی نوسیوە، لەو ناوانەیش کە هەموویان بۆ پیرەمێرد دەگەڕێنەوە: (سولەیمانیەلی تەوفیق، سولەیمانیەلی وداد، سولەیمانیەلی مەحمود نەژاد، م. نەژاد، ویداد، س. ت، پیرە کورد)[٦٥٧].

---

[651] بڕوانە: نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠١ : ٧٨).

[652] بڕوانە: نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠١ : ٢٤).

[653] بڕوانە ئۆریژناڵی لاپەڕەیەکی ژمارە (یەك)ی (کرد تعاون و ترقی غزتسی): پاشکۆی (أ : ٨).

[654] بڕوانە: عەلائەدین سەجادی (١٩٧١ : ٤٥٨).

[655] بڕوانە ئۆریژناڵی لاپەڕەیەکی ژمارە (یەك)ی (ژین): پاشکۆی (أ : ٩). هەندێك سەرچاوە دەڵێن لە ٢٥ ژمارە زیاتری لێدەرچووە، (نەشیروان مستەفا ئەمین :٢٠٠٢: ٤٢) دەنوسێت: تا ژمارە ٣٤ی وەك گۆڤار دەرچووە، لەوە بەدواوە بەشێوەی ڕۆژنامە دەرچووە، تا ساڵی ١٩٨٥ هیچ ژمارەیەکی دیارنەبووە، تا ئەو کاتەی (محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان) ژمارەکانی (١-٢٥)ی هێناوەتە سەر ڕێنوسی لاتینیی‌و لە ساڵانی ١٩٨٥-١٩٨٧ بەلێکۆڵینەوەیەکی درێژەوە لەگەڵ ئۆریژناڵەکانیدا لە ئۆپسالای سوید لە پێنج بەرگدا بڵاویکردونەتەوە.

[656] بڕوانە: نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢ : ٣٠).

[657] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (١٩٩٨: ٦)، نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢ : ٣٢).

٥. چەندین نوسینی لە ڕۆژنامەی (شەمس)دا بڵاوکردۆتەوەکە لە تاران دەردەچو، پیرەمێرد دەڵێت: ((گەلێ خزمەتی غەزەتەی شەمس-م ئەکرد کە سەید حسێنی ئێرانی خاوەندی بوو))[٦٥٨].

٦. لە گۆڤاری (فەرهەنگ)و ڕۆژنامەی (شەفەقی سورخ)دا بابەتی بڵاوکردۆتەوە، پیرەمێرد دەڵێت: ((ئەو سەردەمەی کە ڕۆژنامەی (شەفەقی سورخ)و مجلەی (فرهنگ) لە تاران دەردەچوو هەمیشە من لە ئەستەمووڵەوە مەقالەو شیعرم بۆ ئەناردن))[٦٥٩]و زۆرجار سەروتاری بۆ ڕۆژنامەی (إقدام)و (حريت)یش دەنوسی، (عەلادین سەجادی) دەڵێت: (( لەم ماوەیەدا نوسینی بۆ ڕۆژنامەی "إقدام*"و "سەربەستی"[٦٦٠] لە ئەستەمولّ، وە "فەرهەنگ"و "شەفەقی سورخ" لە تاران ئەنووسی))[٦٦١].

٧. لەماوەی نێوان ١٩٠٤-١٩١٢دا کە گۆڤاری (إجتهاد) لە ئەستەموڵ دەردەچو، پیرەمێرد بەرهەمی خۆی تێدا بڵاودەکردەوەو لەم بارەیەوە دەڵێت: ((عەبدولّا جەودەت لە پاش مەشروتیەت کە لە ئەورووپاوە هاتەوە، لە ئەستەمووڵ بوو، زۆرتر لە هەموو کەس من لە خزمەتیا بووم خۆمو نەژادی کوڕم (بە نظم و نثر) لە مجلەکەیدا خزمەتمان هەیە))[٦٦٢].

٨. لە چەندین ڕۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەی ناو تورکیاو دەرەوەیدا بەشیعر یان بەنوسین بەشداریکردووە، وەك: ڕۆژنامەی (ترجمانی حقیقت)ی معلم ناجی، ڕۆژنامەی (تان)ی فەرەنسیی.

---

[658] بڕوانە: ژین (١٩٤٧: ژ ٨٥٥).

[659] سەرچاوەی پێشوو.

* بڕوانە یەکێك لەو بابەتانەی کە پێشتر پیرەمێرد لە ڕۆژنامەی ئیقدامی ئەستەمولّدا نوسیویەتی : پاشکۆی (أ : ١٠).

[660] بڕوانە: مالمیسانژ (٢٠٠٧: ١٢١-١٢٢).

[661] عەلائەدین سەجادی (١٩٧١ : ٤٥٨).

[662] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥٥).

ئەمانەی سەرەوە بۆ ڕۆژگاری خۆیان بەخشش و سەرخانێکی دیاری پیرەمێرد بوون، بەهاتنەوەی بۆ سلێمانی هەموو ئەمانە لەتەك ئەو برگانەی لە قۆناغی بەراییدا باسکران دەبنە ژێرخانێکی بەهادار بۆ ئەوەی لەگەڵ هاتنەوەی بۆ سلێمانی، تەلاری ڕۆژنامەنوسیی کوردیی ڕازاوەترو بڵندتر بکات.

ڕۆژنامەنوسیی کوردیی لە سەنتەرگیریی سلێمانیدا، مێژویەکی بەنرخی مێژوی ڕۆژنامەنوسیی کوردییە، ئەم شارە کەوەك شارێکی نوێ بنیاتنرا، دوو پایەکەی تری گەر بەساکارییش بێت لەگەڵ خۆیدا خەملاند کە (بازرگانیی و پیشەسازیی)ن، ئەوروپاییەکانیش ڕایان وایە کە ڕۆژنامەنوسیی نوێ بەرهەمی سەرمایەدارییەو لە ئاوێزانبوونی شارو بازرگانیی و پیشەسازییەوە دەخەملێت[٦٦٣]. بۆیە لەساڵی ١٩٢٠وە بەبەردەوامیی ڕۆژنامە لەم شارەدا دەرچووە، لە کاتێکدا سلێمانی لە ساڵی ١٧٨٤دا دروستکراوە، ئەگەر ئەمە بەراوردبکەین بەشارێکی مەزن و دێرینی وەك هەولێر کە هەزاران ساڵە دامەزراوەو یەکەمین شارە لە مێژوودا، ئەوا لە بەر ئەوەی شارێکی کشتوکاڵیی بووە نەك پیشەسازیی و بازرگانیی، ڕۆژنامەنوسیی تیایدا تا (( ساڵی ١٩٣٥ کە گۆڤاری ڕوناکی دەردەچێت))[٦٦٤]، دواکەوتووە.

((کەمن ئەوانەی وەك پیرەمێرد بەپلانێکی شیاو کاریان لەسەر خۆیان کردووە، ئەو ڕابردووەی پیرەمێرد هەرچەندە زۆری دیارنییە، بەڵام ڕابردویەکە پڕە لە بیرکردنەوەو ڕامان و خوێندنەوەو تێگەیشتن لە ژیان و بوارەکانی ژیان، سلێمانی کە پێگەی یەکەمی ژیانی پیرەمێرد بووە، ناتوانرێت جیابکرێتەوە لە ڕۆڵی دەوروبەر لە پێگەیاندنیدا، چونکە سلێمانی کەوەك شارێکی نوێ دروستدەکرێت، خەسڵەتە بەراییەکانی شارێکی پیشەسازیی پێوەدیاردەبێت و تیایدا بزوتنەوەی ئەدەب و ڕوشنبیریی دەگاتە قەڵا پۆپەو، بازرگانییش بنەمایەکی تری پەیوەندییە ئابورییەکانی شار پێکدەهێنێت، لە مێژوی نوێشدا ئەم جۆرە شارانە کە لە

---

[663] بڕوانە: د. تودوروف (١٩٩٠: ٧).

[664] بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد (١٩٧٨: ٢٣٥).

ئەنجامی تێکەڵاوبونی کەلتورو ڕەهەندو خەڵك‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی‌و ئابورییە جیاجیاکانەوە دێنەکایەوەو، کۆمەڵگای کشتوکاڵیی ڕووەو کۆمەڵگای پیشەسازیی‌و بازاڕەکان دەگۆڕن، ڕۆڵیان لە داهێنانی ڕۆژنامەگەریی‌و پەرەپێدانی ڕۆشنبیرییدا دەبێت[٦٦٥])).

ئەم پەیوەندییەی نێوان (پیرەمێردو سلێمانی)یش، کە ئەنجامەکەی بەکارکردن لە ڕۆژنامەو دەرکردنی ڕۆژنامە کۆتایی پێدێت، دەبێتە قۆناغی سێیەمی ژیانی پیرەمێرد. پیرەمێرد لە ٣٠ی کانونی دووەمی ١٩٢٥دا دەگاتەوە سلێمانی، لەو کاتەدا ڕۆژنامەی "ژیانەوە" لە سلێمانیدا دەردەچێت‌و هەواڵی گەیشتنەوەی پیرەمێرد بڵاودەکاتەوە: ((جەنابی تۆفیق بەگی مەحمود ئاغا کە ٢٣ ساڵە لە وەتەن دور کەوتۆتەوە شەوی ٣٠ی کانونی دووەمی ١٩٢٥ تەشریفی هاتەوە...))[٦٦٦].

"ژیانەوە" ژمارە (١)ی لە ١٨ی ئابی ١٩٢٤دا بڵاوکراوەتەوە[٦٦٧]، دوا ژمارەی کە ژمارە (٥٦)ە لە ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٢٦دا دەرچووە[٦٦٨]، ((هێزی عیراق‌و ئەفسەرانی ئینگلیز ڕۆژی ١٨ی تەموزی ١٩٢٤ هاتنە سلێمانییەوە، لە دەشتی کانی ئاسکان بارەگای (فەرماندەیی ناوچەی ڕۆژهەڵات-امریة المنطقة الشرقیة)یان دامەزراند، کەوتنە ڕێکخستنەوەی کاروباری بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکەو، سلێمانی کرا بە لیوایەکی، دەزگای بەڕێوەبەرایەتی تازەی سلێمانی، کە لەژێر چاودێریی موفەتیشی ئیداریی ئینگلیزدا کاری ئەکرد، بڕیاری بڵاوکردنەوەی حەفتەنامەی "ژیانەوە"ی دا))[٦٦٩]. لەژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا نوسراوە: ((ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتییە هەفتەی جارێك دەردەچێ)[٦٧٠]،

---

[665] بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٥: کوردش میدیا).

[666] بڕوانە: ژیانەوە (١٩٢٥:ژ١: ٤)، پاشکۆی (أ ١:).

[667] بڕوانە: ژیانەوە (١٩٢٤: ژ١:١)، پاشکۆی (أ ١١:).

[668] بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە (٢٠٠٠).

[669] بڕوانە: نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢أ : ٣٤٣).

[670] بڕوانە: پاشکۆی(أ ١:).

له ژماره(١٨)ی ٢٦ی شوباتی ١٩٢٥دا، ناسنامەکەی دەگۆڕێت بۆ ((ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتماعییە هەفتەی دووجارێك دەردەچێ*))[٦٧١].
لەم ڕۆژنامەیەدا لەگەڵ ئەوەی کەسە نزیکەکانی پیرەمێردی وەك (جەمیل سائیب و مستەفا سائیب و عەلی عیرفان) کاریان تێدا کردووە، بەڵام پیرەمێرد بەئاشکرا هیچ بابەتێکی لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاونەکردۆتەوە، بۆ نمونە شیعرێکی پیرەمێرد لە ژمارە (٣٤)ی ژیانەوەدا بێ ناوی خۆی بڵاودەکرێتەوە[٦٧٢].
((حاجی تۆفیق لە گەیشتنەوەیەوە بۆ سلێمانی توخنی هیچ کارو فەرمانێکی دەوڵەت نەکەوت و هەموو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتی ئەدەبی کوردی))[٦٧٣]، بەڵام لەلایەك ئامادەیی کەسێکی وەك پیرەمێرد هەیە، لەلایەکی کەیش ئامادەییەکی بابەتیی وەك دروستبوونی ژینگەیەکی گونجاو بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە لە شارەکەدا هەیە، بارودۆخیش ئەو وانانەیان داوە بە زاتێکی وەك پیرەمێرد کە ئەوە نوسین و ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی و هونەرەکانی ترن کە سەروەریی وڵات و نەتەوەیەك دەهێڵنەوە، نەك شتێکی تر، ئەزمونی دوورودرێژی ئەو لەگەڵ بارودۆخەکاندا ئەوەی لاپرسکاند کە بۆ پێشخستنی نەتەوەو هاندانیان و ڕۆشنکردنەوەی مێژوویان و بەهادارکردنی ڕۆڵی ژنان و خوێندکاران و خوێندن و خوێندەواریی و کۆکردنەوەیان لە دەوری بۆنە نەتەوەیی و میللییەکان، بەپلەی یەکەم ڕۆژنامەیە، دیارە بە تێڕوانینە ئەورووپاییەکەی نەك بە گرتنەدەستی دەسەڵات بێت بەتێڕوانینە خۆرهەڵاتییەکەی.
ڕاستەوخۆ دوای ڕاگرتنی "ژیانەوە"، وەکو درێژکراوەی ئەو، ڕۆژنامەی"ژیان" ژمارە ١ی لە ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٢٦دا دەرچو[٦٧٤]، پیرەمێرد ناوەناوە بابەتی

---

* لە (نەشیروان مستەفا ئەمین: ٢٠٠٢أ : ٣٤٣) دا، بەهەڵە ژمارە (١٩) بەژمارەی گۆڕان لە ناسنامەی ڕۆژنامەکەدا دانراوە.

[671] بڕوانە: ژیانەوە (١٩٢٥: ژ١٨: ١)، پاشکۆی (أ ١٢:).

[672] بڕوانە: ژیانەوە (١٩٢٥: ژ٣٤: ١-٢)، پاشکۆی (أ ١٣:).

[673] ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥٨).

[674] بڕوانە: نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢ب : ٩).

بۆ دەنوسی، تا لە سەردەمی (حسێن نازم)دا دەچێتە ستافی ڕۆژنامەکەوەو پۆستی بەڕێوەبەری نوسین وەردەگرێت*.

پیرەمێرد یەکەم بابەتی بڵاوکراوەی لە "ژیان"دا، دەقێکی شیعرییە بەناوی (بەنەشئەی نەتقەکەی مەندوبی سامی)یەوە لە لاپەڕە (٣)ی ژمارە (٩)ی ١٨ی مارتی ١٩٢٦دا بڵاوکراوەتەوەو نازناوی (کوردی) لە ژێردا نوسیوە[٦٧٥]، "کوردی"و "حاجی تۆفیق بەگ" هەردوو ناوەکە هەر "پیرەمێرد"ن[٦٧٦]، بۆیەکەمجار " حاجی تۆفیق بەگ" لە شیعری (بەیانی بوو لە خەو هەستام کەڕوانیم بەفرە باریوە)داو لە ژمارە ٣١٢ی ساڵی ١٩٣٢ی "ژیان"دا ناوی ڕۆژنامەنوسیی و ئەدەبیی خۆی دەکاتە "پیرەمێرد"[٦٧٧].

---

* دەنوسرێت: هەر لەسەرەتای دەرچونی ڕۆژنامەی "ژیان"ەوە، پیرەمێرد سەرپەرشتی دەکرد (ئومێد ئاشنا :٢٠٠١: ٥٨)، یان دەوترێت: کاتێك کە پیرەمێرد دێتەوە بۆسلێمانی ڕۆژنامەی "ژیان" لەسەر حسابو چاپخانەی بەلەدیە، لە ٢١ی کانونی یەکەمی ١٩٢٦دا دەرئەکرا، ئەم ئیدارەکەی گرت بەدەستەوە (عەلائەدین سەجادی : ١٩٧١: ٤٥٩)، هەندێکی تر ڕایان وایە کە هەر لەگەڵ دامەزراندنی "ژیان"دا (حسێن نازم)بەرپرسیاری بووە (جەبار جەباری: ٢٠٠٤: ٨٦-٨٧)،(حەمەساڵح فەرهادی: ١٩٨٨: ٧٠)،(وریا جاف: ١٩٩٨: ٤١): ئەم زانیارییانە هەموو هەڵەن، چونکە ژمارەیەکی "ژیان" لە ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٢٦دا دەرچووە، بڕوانە: پاشکۆی (أ : ١٤)، لە (ئومێد ئاشنا :٢٠٠١: ٥٩)یشدا بەهەڵە نوسراوە ١٩٢٦/١/٢٦، هەروەها پیرەمێرد تا سەردەمی (حسێن نازم) لە ڕۆژنامەکەدا کاری نەکردووەو سەرپەرشت نەبووە، تەنها بە بابەت بەشداریکردووە، (مستەفا ساڵح کەریم) دەڵێت: ((لەسەردەمی حسێن نازمدا لەسەرداوای حسێن نازم پیرەمێرد پۆستی بەڕێوەبەری نوسینی "ژیان"ی وەرگرتووەو بەمردنی حسێن نازم پیرەمێرد کەکەسی دووەمی ڕۆژنامەکە بووە لەو کاتەدا بۆیە حکومەت بەرپرسیارێتیی ڕۆژنامەکەیان پێ سپاردووە)) (مستەفا ساڵح کەریم: ٢٠٠٦: چاوپێکەوتن). حسێن نازمیش دوای هەریەك لە جەمیل سائیبو محەمەد ئەدیبو عەلی عیرفان بەرپرسیارێتی ڕۆژنامەکەی وەرگرتووە، بڕوانە: نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢ب : ١١-١٥).

[675] بڕوانە: ژیان (١٩٢٦: ژ٩: ٣)، پاشکۆی ( أ : ١٥).

[676] بڕوانە: ڕەفیق ساڵح، سدیق ساڵح (٢٠٠٢: ١١).

[677] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٥٨).

له ژماره ٣٢١ی ڕۆژی ١٩ی مایسی ١٩٣٢داو پاش مردنی "حسێن نازم*"، "پیرەمێرد" دەبێتە بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی "ژیان"[٦٧٨].

له ژماره (٣٢١) تا ژماره (٤٠٦)** پیرەمێرد سەرپەرشتو بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە بووه[٦٧٩]، بەڵام ڕۆژنامەکە هەر بەناوی شارەوانیی سلێمانییەوه بوو، ئینجا له ١٤ی ئابی ١٩٣٤دا، چاپخانەکەی له بەلەدیه گرت به ئیجارەو ئیمتیازی ئەم ڕۆژنامەیەی بۆخۆی دەرکرد، له ١٦ی ئابی ١٩٣٤دا ژماره (٤٠٧)ی بڵاوکردەوه، له ٣٠ی ئابی ١٩٣٧***دا ژمارەکانی گەیشتنه (٥٣٨)، مۆڵەتی چاپخانەکه کۆتایی هاتو بۆیان نویٚ نەکردەوه، ناچار خۆی چووه ژێر ئەم ئەرکەوەو چاپخانەیەکی گەورەتری له ٢٠ی ئەیلولی ١٩٣٧دا کڕی[٦٧٩]و ژماره (٥٣٩)ی پێدەرکرد*، حکومەت بۆ

---

* له (ئومێد ئاشنا :٢٠٠١: ٥٨) دا بەهەڵه نوسراوه (له ساڵی ١٩٢٣دا حسێن نازم کۆچی دوایی دەکات)، ڕاستەکەی ١٩٣٢ه.

[678] بڕوانه: نەشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢ب : ١٥).

** له (نەشیروان مستەفا ئەمین :٢٠٠٢ب : ١٥)دا بەهەڵه نوسراوه (٣٢١–٤٠٥). ((ژمارەکانی ٤٠١–٤٠٦ که له ماوەی نێوان ناوەڕاستی مایسو ناوەڕاستی ئابی ١٩٣٤دا دەرچوون، دیارنینو دانەیان له هیچ شوێنێك، نەله ئەرشیڤەکانی بەریتانیا، نه له کتێبخانه دەوڵەمەندەکەی خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خاڵو نەلەلای خۆمانو کاك عەبدوڵڵا زەنگنه، دەست ناکەویٚ)) بڕوانه: ڕەفیق ساڵح، سدیق ساڵح (٢٠٠٥: ڕونکردنەوه)، ئێمەیش زۆرشوێن گەڕاین بەڵام هەوڵەکانمان بێئاکام بوون.

[679] بڕوانه: عەلائەدین سەجادی (١٩٥١: ١٧).

*** له (نەشیروان مستەفا ئەمین :٢٠٠٢ب : ١٥)دا نوسراوه: ژماره(٤٠٦) له ١٩٣٤/٨/١٤دا دەرچووەو ژماره (٥٣٨)یش له ١٩٣٧/٢/١٠دا، هەردوو ئەم مێژووه هەڵەن، چونکه ژماره (٤٠٧)له ١٩٣٤/٨/١٦دا دەرچووه، ناشێت (٤٠٦)له ٨/١٤دا دەرچوبێت، ئەمه جگه لەوەی تا ئێستا کەس ژماره (٤٠١–٤٠٦)ی نەدیوەو ئێمه گومانمان له دەرچونیان هەیه، ژماره (٥٣٨)یش له ٣٠ی ئابی ١٩٣٧دا دەرچووه، بڕوانه: ژیان(١٩٣٧:ژ٥٣٨: ١)پاشکۆی( أ : ١٦). ئەم مێژووه له (ئومێد ئاشنا ٢٠٠١: ٥٨)شدا بەهەڵه نوسراوه ( ٣ی ئابی ١٩٣٧).

[680] بڕوانه: (ئومێد ئاشنا :٢٠٠١: ٥٩)، مێژوی کڕینی چاپخانەکه بۆ پێش ئەم مێژووه دەگەڕێتەوه، چونکه بەپێی لۆژیك ناکریٚ له هەمان ڕۆژدا چاپخانەکەیشی کڕیبێتو هەمان ڕۆژیش ڕۆژنامەکی پیٚ چاپکردبێت، ئەمه جگه لەوەی ئەو زانیارییانەی له (عەلائەدین سەجادی ١٩٥١ :١٧)و (نەشیروان مستەفا ئەمین :٢٠٠٢ب : ١٦)دا دەربارەی ئیجازەی دامەزراندنی ئەم چاپخانەیه هەنو وا باسدەکەن له ١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٧دا ئیجازەی دامەزراندنی بۆ

دژایەتیکردنی "ژیان"، ڕۆژنامەی "زبان"ی دەرکرد، لەسەر هەمان تەرزو فۆنتی "ژیان"و بەدەستکاریکردنی لۆگۆی "ژیان"، "زبان"** یان خستەبازاڕەوە، "زبان" ژمارە (١)ی لە ١١ی ئەیلولی ١٩٣٧دا بلاوکرایەوەو (سالح قەفتان) سەرپەرشتی دەکرد، دوا ژمارەی کە ژمارە (٩٤)بوو لە ١٨ی کانونی دووەمی ١٩٤١دا دەرچوو[٦٨١].

(د. فاروق عەلی عومەر) دەنوسیت: (( "زبان" وەك ڕۆژنامەیەکی ئەلتەرناتیڤی "ژیان" دەرچوو، چونکە مەجید یەعقوبی موتەسەڕیفی سلێمانی لە "ژیان" ڕازی نەبوو، وا دیارە ناکۆکییەکە شەخسیو دژ بەپیرەمێردی خاوەنو سەرنوسەری "ژیان" بوو، بۆیە ڕۆژنامەیەکی نوێو بە هەمان ناوی"ژیان" دەرچوو، بەلام لە ژمارە یەکەوە دەستی پێکرد واتە ژمارە یەکی ڕۆژنامە تازەکە، کە هەر بە ناوی خودی ڕۆژنامەکەی پیرەمێرد "ژیان"ەوە دەرچوو، پاش ئەوەی چاپخانەکەیان لەو سەندەوە، ژمارە (یەکی) پێوە بوو لە ڕێکەوتی ١٩٣٧/٩/١١. پاش دەرچونی دووەمین ژمارە، پیرەمێرد لێی کردنە هەللا، وا دیارە لەگەڵ بەردەوام دەرچوونی ڕۆژنامەکەی دەیتوانی بەرەو ڕووی دادگایان بکاتەوە، هەروەها لەوەی پێگەیەکی کۆمەلایەتیی هەبوو، وای لە بەرپرسان کرد لە دژایەتی کردنی بسلەمنەوە، کەچی

---

وەرگیرابێت، زانیارییەکی وردنین، چونکە چاپخانەکە بە کرداری لە ١٩٣٧/٩/٢٠دا کەوتۆتە ئیشو ژمارە (٥٣٩)یش کە لەم ڕۆژەدا دەرکراوە قەبارەکەی گۆڕاوە بە قەبارە گەورە کە هێندەی قەبارەی ڕۆلی ئەم چاپخانە تازەیە بووە، بڕوانە : ژین ( ١٩٤٦: ژ٨١٩: ٥) پاشکۆی ( أ : ١٨).

* دەشێت لێرەوە ڕۆژنامەی "ژیان" بەیەکەم ڕۆژنامەی سەربەخۆی کوردستان بزانین، کە نەك هەر ڕۆژنامەکە سەربەخۆیانە دەرچووە بەڵکو چاپخانەیشی بۆخۆی دیاریکردووە، کەواتە ئەوە ڕاست نییە تەنها بەیەکەم ڕۆژنامەی سەربەخۆی سلێمانی بزانین، وەك ئەوەی (کەمال ڕووف محمد : ١٩٩٠: ژ٢٤: ٤)دا دەڵێت: ((پیرەمێرد... بەسەر کۆسپەکەدا زاڵ بووە و چرای "ژیان" نەکوژاوەتەوە، کەلەم بارەدا بووە بە (یەکەم ڕۆژنامەی سەربەخۆ) لە سلێمانی دا)).

** (مستەفا سالح کەریم :٢٠٠٦: چاوپێکەوتن) دەڵێت: "ژیان"یان هێناو دوو خاڵی یەکەمو خاڵێکی ژێر"ی" ژیانەکەیان لابردو کردیان بە "زبان".

[681] بڕوانە: فاروق عەلی عومەر (٢٠٠١: ١٣٤). لە (کەمال مەزهەر ئەحمەد: ١٩٧٨: ٢٢٢)دا بەهەڵە ڕۆژی دەرچونی ژمارە (١)ی "زبان" نوسراوە ١٢ی ئەیلولی ١٩٣٧.

پەنایان بۆ فێڵێك بردو ئەویان پێ بێ دەنگ کرد، چەند خاڵێکیان لە ناوە کۆنەکە ڕەش کردەوە، بۆ ئەوەی ناوێکی چاك‌و بێ خەوش بە دەستەوە بدات، کە "زبان" بوو، هەر لە ژمارە سێوە* پەیڕەو کرا))[٦٨٢].

لە ١٠ی مارتی ١٩٣٨دا، کە دەکاتە دەرچوونی ژمارە (٥٥٣)، ئیتر لێنەگەڕان و بەچەندین تۆمەت پیرەمێردیان تۆمەتبار کرد** و (مەجید یەعقوبی) کە تورکێکی ڕەگەزپەرست‌و دژ بە کوردبوو، ڕۆژنامەی "ژیان"ی داخست[٦٨٣]. بەڵام پیرەمێرد بەمەوە نەوەستا، ئیمتیازێکی نوێی بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی نوێ بەناوی "ژین"ەوە وەرگرت‌و لە ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٣٩دا لەسەر هەمان زنجیرەی "ژیان" ژمارە (٥٥٤)[٦٨٤]ی ڕۆژنامەی "ژین"ی بڵاوکردەوەو هەتا ژمارە (١٠١٥)[٦٨٥]ی ١٥ی حوزەیرانی ١٩٥٠، واتە تا چوار ڕۆژ بەر لە کۆچکردنی بەردەوام بووە لە دەرکردنیدا.

---

* ئەم لۆگۆیەی " زبان" لە ژمارە (٢)ەوە پەیڕەوکراوە بۆیە ئەوەی لە (جەمال خەزنەدار: ١٩٧٩: ژ٥٦: ٤٠)و (فاروق عەلی عومەر (٢٠٠١: ١٣٣)دا نوسراون، هەڵەن. بڕوانە: زبان (١٩٣٧:ژ٢: ١) پاشکۆی ( أ : ١٧).

[682] فاروق عەلی عومەر (٢٠٠١: ١٣٣).

** لەو تۆمەتانە: (( ١. ڕۆژنامەی "ژیان" دژی میریی ئەدوێ، بیرو باوەڕی دژ بە بەرژەوندی وڵات، بڵاوئەکاتەوە، پەندەکان بە توێکڵن‌و مانای دووریان هەیە، شیعرەکانی نەتەوەیین...٢. قوتابییەکانی "زانستی" لەسەر گێرەشێوێنی‌و ئاژاوەچێتی پەروەردە دەکات‌و دژی فەرمانڕەوایانی شار هەڵسوکەوت دەکەن. ٣. ئەم ئاگری نەورۆزەش کە پیرەمێرد دەیکاتەوە، ئاگرپەرستییەو پێوەندی بەئێمەوە نیە...بۆیە لە ١٩٣٨/٣/١٠دا "ژیان"یان داخست‌و لە ١٩٣٨/٣/٢١دا نەورۆزیان قەدەغەکردو ئاگری گردی مامەیارەیان کوژاندەوەو (زانستی)یشیان داخست)) بڕوانە: دیوانی پیرەمێرد (١٩٩٠: ب١: ٤٢-٤٣).

[683] بڕوانە : ژین ( ١٩٤٦: ژ٨١٩: ٥) پاشکۆی ( أ : ١٨).

[684] بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٥٤ : ١) پاشکۆی ( أ : ١٩).ئەم ئۆرژیناڵە بۆ یەکەمجارە دوای دەرچونی بڵاودەبێتەوە.

[685] بڕوانە: ژین (١٩٥٠: ١٠١٥: ١) پاشکۆی ( أ : ٢٠). ئەم ئۆرژیناڵە بۆ یەکەمجارە دوای دەرچونی بڵاودەبێتەوە.

پیرەمێرد، چەندین بابەتی لەسەر ڕۆژنامەنوسیی و پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی نوسیوە، لەم نوسینانەدا هەندێکجار سودی لە ئەزمونی خودیی خۆی وەرگرتووە، هەندێکجاری تریش لەو زانیارییانەی لە بواری ڕۆژنامەگەرییەوە بەدەستی هێناون*.

دەشێت پیرەمێرد بەیەکەم پەیامنێرو ڕۆژنامەوانی کورد بزانرێت، کە خۆی بۆ خۆی ڕومالّی ڕوداوەکانی بەزیندویی لەسەر شوێنی ڕوداوەکان، کردووە، ئەو دەنوسێت: ((سەعادەتی موتەسەڕیف ڕۆژی ١٩٣٢/٦/٤ سەفەری کرد بۆ بەغدا. و موحەریری ژیان جەنابی پیرەمێردیش لە ڕەفاقتیانایە خوایان لەگەلّ بێ))[٦٨٦]، یان نوسیویەتی (( لە تەئریخی ١ی تەموزی ١٩٣٢ەوە مەکتەبی کچانی سلێمانی بۆ تەعلیمی خەیاتی کە بە ئەمری وەزارەتی مەعاریف بۆ فێرکردنی ئەم سەنعەتانە تەودیع کراوەبە شیرکەتی سینگەر کچانی مەکتەبو سائیر کچانی تر لەو مودەتەوە کە دەوام لەسەر ئەم سەنعەتە ئەکەن، وەکوو موشاهەدە کراوەو لە مەعرەزی مەکتەبی کچاندا چاومان بە سەنعەتەکەیان کەوتووە لەگەلّ جارانا زۆریان فەرق کردووەو ڕۆژ بەڕۆژ لە تەرەقییان))[٦٨٧]. ئەمەش ئامادەیی پیرەمێرد لەسەر شوێنی ڕوداوەکان دەسەلمێنێت.

لەلایەکی ترەوە بابەتگەرێتیی پیرەمێرد لە پرۆسەی ڕۆژنامەگەرییدا بەشێوەیەك بووە کە زۆرجار دور لە بڕوای زاتی خۆی لە تێڕوانینێکی بابەتییانەی ڕۆژنامەنوسییەوە نەك هەر بۆ پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی بەلّکو لە تێزو بەرهەمە ئەدەبییەکانیشی ڕوانیوە، بۆیە لەگەلّ ئەو هەموو دژایەتییەی مەجید یەعقوبی بەرامبەر پیرەمێرد کردویەتی، بەلاّم کاتێك یەعقوبی دەگوێزرێتەوە بۆ موتەسەریفیی کوت، پیرەمێرد هەوالّی گوێزانەوەکەی بلاّودەکاتەوە بێ ئەوەی

---

* بۆنمونە بڕوانە ئەم بابەتانەی لەم ژمارانەدا دەربارەی ڕۆژنامەنوسیی و ڕۆژنامەگەریی بلاّویکردونەتەوە: ژیان (١٩٣٥: ژ٤٢٦)، ژیان (١٩٣٦: ژ٥٠٥)، ژیان (١٩٣٧: ژ٥٤٠)، ژین (١٩٣٩: ژ٥٦١)، ژین (١٩٤٢: ژ٦٩٠)، ژین (١٩٤٥: ژ٧٧٨)، ژین (١٩٤٧: ژ٨٧٥).

[686] بڕوانە: ژیان (١٩٣٢: ژ٣٢٥: ٤).

[687] بڕوانە: ژیان (١٩٣٢: ژ٣٢٢: ٣).

هیچ ڕەخنەو توانجێکی لەسەر بنوسێت[٦٨٨]. یاخود کاتێك بۆ کوشتنی (عارف سائیب) ئەم شیعرە بۆ گلەیکردن لە (شێخ مەحمود) دەنوسێتو تیایدا دەڵێت[٦٨٩]:

لە گوێم دێ دەنگی لایلایەی وەتەن دایك جگەر سوتاو
دەڕژێنێ بەسەر وێرانەکەی خوێناویا خوێناو
دەلاوێنێتەوەو دەگری، سەری شینە لە ماتەممدا
شەو و ڕۆژ کۆتەڵی منداڵەکانی وا لە بەردەمدا
دەڵێ لەو فیتنەکەی کوردا کوڕی چاکم نەما کوژران
ئەویش مابون هەمو مردن لە برسا بێ کفن نێژران
خودا پاداشی ئەم تەنگانەیەی وا دایەوە وام دی
بەپێی خۆی هاتە بەرپێم تاجە گەوهەردارەکەی کوردی
صەلاحەین جەلالی وای نەبو تەئریخ لە پێش چاوە
هەمو پاشای بابان مردن بە حەسرەت ڕۆژێکی واوە
شەوێ دەست ئەهریمەن کەوت خاتەمی موڵکی سلێمانی
کەچی میرو گزیری پێ دەکرد قەدری وەها زانی
بەسەر مەستی مەی سەر شار خوێنی میلەتی نۆشی*

---

[٦٨٨] بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٥٦: ٣).

[٦٨٩] بڕوانە: ژیانەوە (١٩٢٥ : ژ٣٤: ١-٢)، ئەم دەقەی پیرەمێرد لە هیچ سەرچاوەیەکی پێش ئەم نامەیەی ئێمەدا وەکو خۆی بەڕاستیی بڵاونەکراوەتەوە، هۆکاری پشت نوسینیشی بەبڕوای ئێمە جیا لەوانەی پێش ئێمە تەنها بۆ کوشتنی عارف سائیب ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ توانستی بەهرەمەندانەو دیدی ڕەخنەگرانەی خودی پیرەمێرد دەگەڕێتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی تێکستی لەم جۆرە لەسەرتاپای ئەدەبی ئەو سەردەمەدا ناوازەو دەگمەنە.

* لە (دیوانی پیرەمێرد: ١٩٩٠:ب١: ٢٨٥)و (ئومێد ئاشنا: ٢٠٠١: ١٢٣)دا ئەم دوو دێڕەی کۆتایی ئەم دەقە پەڕێنراونو لە بری ئەوان ئەم دێڕای تر نوسراون:

بەدەم ئەم ناڵەوە دەستی درێژکرد خستیە سەرشانم
وتی تۆفیق هاتیتەوە بۆ باری میحنەت ئەیزانم

لەجێی جبەی سیادەت ڕانکی سوری پیاوکوژی پۆشی

لە باتی پرچ وەکو ورچ پایتەختی شومی ئەشکەوت بو

سیواك‌و زرکی خەنجەر شەو کەمەندی تەوقی لەعنەت بو

شێخ مەحمود، لەسەر ئەم شیعرە لە پیرەمێرد زویر دەبێت، بەڵام دواتر شێخ مەحمود داوا دەکات پیرمێرد سەردانی بکات، پیرەمێردیش بە شیعری (ئەبێ بەخشندە ملکەچکا) وەڵامی دەداتەوە*، بۆیە شێخ خۆی دێتە سەردانی پیرەمێرد[٦٩٠]، ئەمەش هەڵوێست و تێڕوانینی پیرەمێرد دەنوێنێت لەو بابەتانەدا کە لە ستراتیژی تێڕوانینی ئەودا بوون، بەڵام بەگشتیی ئەم زاتە کەسێکی دڵپاك‌و ڕۆح سوك بووە، (محەمەد ڕەسوڵ هاوار) دەڵێت: ((پیرەمێرد... زۆر زوو توڕە ئەبوو، زۆر زووش سارد ئەبوەوە، کە ساردیش ئەبوەوە، ئیتر هیچی لە دڵا نەئەما...))[٦٩١].

---

بەڵێ حاڵم پەشێواوە فڕندە باڵی سوتاندوم

نەما غەیری کەلاوە شەو بناڵێنە لەوێ وەك بوم

وتم دایە کە دایکم مرد نەگریام چونکە تۆ ماوی

ئەگەر ئەولادەکانیشت بکوژرێن تۆ ئەبێ چابی

قەسەم بەو عەزمی کوردەی شانی ڕیچاردی بەشیر ڕوشان

کڵاوی کورد ئەبێ قوچ بێ کە هاتو شانی خۆی جوڵان

شەوێ پیاوێ لە بەفرا ما نەمرد ئاگرێکی دوری دی

لە لای من نائومێدی کفرە ئەم ئاگرەی دڵم بو دی

ئەم دێڕەی کۆتاییش، بەهەڵە لەم دوو سەرچاوەیەدا نوسراوە: (( شەوێ، پیاوێ، لەبەفرا، ما، نەمرد، ئاگرێکی دووری دیێ لەلای من نائومێدی کفرە، ئەم ئاگرەی دڵم بۆ کێ)).

* مستەفا ساڵح کەریم (٢٠٠٦: چاوپێکەوتن)، دەڵێت: (( شێخ مەحمود لە دوکانێك لە ژێر بەلەدییە کۆنەکەدا دادەنیشت، جواب بۆ پیرەمێرد دەنێرێ سەردانی بکات، پیرەمێرد دەچێت‌و لە بەردەم دەرگاکەدا دەوەستێت‌و ڕودەکاتە شێخ‌و شیعری ئەبێ بەخشندە ملکەچکا دەڵێ، شێخیش هەڵدەستێتە سەر پێ‌و دەڵێ: وا ملمان کەچکرد دەفەرموو، ئیتر پیرەمێرد هیچی لە دڵدا نامێنێ (مستەفا ساڵح کەریم، دەڵێت: شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی خۆی لەم دانیشتنەدابووەو ئەو بۆ مامۆستا ئەحمەد هەردی شاعیری گێڕاوەتەوەو هەردیش بۆ منی گێڕاوەتەوە)).

[690] خاڵە حەمە فەرەج (٢٠٠٦: چاوپێکەوتن).

[691] محمد رسول هاوار (١٩٧٠: ٢٢).

## ٢/٣-٤) بوارە نەتەوەیی و مەدەنیی و ڕۆشنبیرییەکانی پیرەمێرد

بوارە نەتەوەیی و مەدەنیی و ڕۆشنبیرییەکانی پیرەمێرد زۆرن، لێرەدا بەکورتیی ئاماژە بەچەند بوارێکیان دەدەین، کە بەبایەخەوە کاری تێدا کردوون:

أ. بایەخگەلێکی زۆری بە ژنان و هێنانە مەیدانی ژنان داوە، لەم بارەیەوە لە بابەتی (من و تەرەفداری ئافرەت)دا دەڵێت: ((ئەوانەی عالەمی مەدەنیەتی ئەوروپایان دیوە لێیان ئەپرسم کە ڕێیان کەوتبێتە هەر کیشوەرو شارێکی لە هەموو توجارەتگاهو ڕەنجشگاهێکدا ئافرەتیان زۆرتر لە کارا دیوە. یان ژنان لەم بازاڕی جهانەدا کە سەراپای ئەندامیان جلوەی نووری لیٚ ئەباریٚ وەك غونچەی گوڵباخی بەهەشتن. دیارە ئەوانیش وەك بەشەر هەواو هەوەسێکی زیندەگی و کامەرانیان هەیە، چە ڕەوایە ئەوانە بخەنە چوار دیوارێکی بەندیخانەی ڕۆح و حەیاتەوەو گرۆهێکی ڕیش بۆزی سەرو سورەت پڕ لە تۆزیان بەسەرا زاڵ بکەن. ئەبیٚ ئەو نەوەیە کە نا بەدڵ لەوانە پەیدا ئەبیٚ چە هیوایەکیان پیٚ بیٚ. لە هەموو تەحلیل و بەراوردی حیکمەتدا دەرکەوتوە کە حسیاتی وردو نازك و شعووری بەزەیی و دڵسۆزی ژنان لە پیاوان باڵاترە. بەو بەدەنە لەتیفەو ڕۆحە نازکەوە بۆ پەروەرشی منداڵ و خزمەتی نەخۆش و غومی گوزەران زۆرجار ڕۆحی خۆیان ئەخەنە تەهلەکەوە. هەندێکیان بە نەختیٚ خوێندەواری بوونە ئاتەش پارەی شیعرو ئەدەب. هەندیٚ شیعری ژنان هەیە کەس ناتوانیٚ ئینکار بکا کە لە شیعری پیاوان باڵاترە بەڵام ڕوویان نەهاتووە تا ئێستا بیانخەنە مەیدانەوە. ساڵەهای ساڵە ئێمە ئەڵێین ئەگەر جنسی لەتیف لە دەرەجەی پیاواندا بناسرێن و خوێندن و کۆششیان ببیٚ، لە پیاوان دواناکەون))[٦٩٢].

---

[692] ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٢٦-٢٧).

(فاتمە محێدین)ی بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەی کچانەی لە سلێمانی، لە ساڵی ١٩٢٦* دا کرایەوە، پیرەمێرد بەیەکێك لە گەورەترین هاندەران و پشتگیرانی خۆی دەزانێت[٦٩٣].

لە شیعرەکانیشیدا ئەم بڕوایەی پیرەمێرد بە ژنان، بەزەقیی ڕەنگی داوەتەوە، کاتێکیش باس لە تێکۆشانی کچانی کورد دەکات، دەڵێت:

(( تا ئێستە ڕووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا

قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا))[٦٩٤]

لە چەندین ژمارەی " ژیان" و "ژین"یشدا هانی کچان و ژنانی داوە بۆ هاتنە مەیدانی کۆمەڵایەتیی و ژیانی نوێ، بۆ ئەم مەبەستەش چ پیرەمێرد چ هەندێك لە نوسەرانی ئەو سەردەمە، چەندین بابەتیان یان بەناوی کچێکەوە نوسیویانە کە خوازراو بێت، یان بەناوی کچەکانی خۆیانەوە نوسیویانن[٦٩٥]. دواجاریش لەسەر ئەو ڕەوتەی پیرەمێرد، دوای کۆچی دوایی پیرەمێرد بۆ یەکەمجار لە مێژووی ڕۆژنامەنوسیی کوردییدا (ڕەحمەخانی کچی پیرەمێرد) لە ١٩٥٤/١٢/١٤دا ئیمتیازی "ژین" دەخاتە سەرخۆی[٦٩٦].

---

* د. کەمال مەزهەر ، یەکەم قوتابخانەی کچان لە سلێمانی بۆ ساڵی ١٩٢٦ دەگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەم مێژووە هەڵەیە، چونکە جگە لەوەی هەر لە سەردەمی عوسمانیدا کچان دەیانخوێندو یەکەم کچە خوێندکاری شاری سلێمانیش "مەلیحە نەزهەت خان" بووە کە چۆتە بەر خوێندن، لە ساڵی ١٩١٥یشدا یەکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانی کراوەتەوە. بڕوانە: (کەمال ڕەووف محەمەد. کوردستانی نوێ: ١٩٩٦: ژ١٢٠٧).

[693] بڕوانە: د. جەبار قادر (٢٠٠٥).

[694] دیوانی پیرەمێرد (١٩٩٠: ب١: ٢١٠).

[695] بڕوانە: ژین (٥٤٦، ٥٦٩، ٧٤٨،...تاد).

[696] بڕوانە: ژین (١٩٥٤: ژ ١٢٣٠: ١) پاشکۆی ( ١ : ٢١). لە دیوانی پیرەمێرد (١٩٩٠: ب١: ٦١)دا بەهەڵە ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە هەر پاش کۆچی دوایی پیرەمێرد لە ژمارە ١٠١٦ەوە ڕەحمەخان دەبێتە خاوە ئیمتیازی ژین، ڕاستەکەی ئەوەیە کە لە ١٩٥٤/١٢/١٤دا ئەو بۆتە خاوەن ئیمتیازو پێشتر تەنها بە ناوی وەرەسەی پیرەمێردەوە بووە.

ب. هەوڵدان بۆ سەربەخۆیی چاپخانەو ڕۆژنامەکەی، کە بە هەوڵێکی دیاری پیرەمێرد دەزانرێت بۆ دابینکردنی چاپخانەی تایبەت بۆ ڕۆژنامەکە، کە دواجار بێباکانە دوا ژمارەکانی "ژیان"و دواتر "ژین"یشی پێ چاپدەکاتو ناوی چاپخانەکە دەبێتە چاپخانەی ژین، ئەم چاپخانەیەی پیرەمێرد کە یەکەم چاپخانەی ئەهلییە لە سلێمانیدا پارێزگاریی کراو مایەوە، تا هەشت ساڵ دوای کۆچی خۆیشی لەکاردابوو، دواتر لە کارخراو هەر لە قەڵەندەرخانەکەی پیرەمێرددا مایەوە، تا لە تشرینی دووەمی ١٩٨٣دا لە مۆزەخانەی ئەتنۆگرافیا لە شاری سلێمانی دانرا[٦٩٧]، ئێستا ئەم مۆزەخانەیە بۆتە دامەزراوەیەکی سەر بەزانکۆی سلێمانیو تا ئەمڕۆیش چاپخانەکەی پیرەمێرد هەر لەوێدا پارێزراوە.

پ. نەورۆز، کاتێك باس لە نەورۆز دەکەین پیرەمێردمان دێتەوە یادو بە پێچەوانەیشەوە، پیرەمێرد دوای گەڕانەوەی بە یادگاریی منداڵیی خۆیو بە پشتبەستن بە "کۆمەڵەی زانستیی" کە خۆی (کوڕگەلی زانستی)[٦٩٨] پێدەگوتنو لە ساڵی ١٩٣٠دا دروست بووبوو، کەوتنە زیندوکردنەوەی ئەم نەریتەو نوێکردنەوەی بەشێوەیەکی وەها کەلەگەڵ گیانی سەردەمەکەیدا بگونجێ، لای پیرەمێرد نەورۆز مانایەکی گەورەتری لە ئاگرکردنەوەو ئاهەنگێران هەبوو، ((لای ئەو دوو مانای هەبوو، یەکەم گۆڕانی سروشتو نوێ بوونەوەو ژیاندنەوەی خاکی مردوو، دووەمیش مەسەلەی ڕوناکی کە ئەمەیان زۆرتر مەبەستی ئەو بووە، ڕوناکی کە ڕەمزی پێشکەوتنو بەئاوات گەیشتنی نەتەوەکەی بووە))[٦٩٩]، پیرەمێرد نەورۆزی لە لەبیرچونەوەوە هێنایەوە پێشەوەو لە فەوتانەوە زیندوی کردەوە، لانی کەم بۆ ئەوەی بۆنەیەك بێت کە نەتەوە لە دەوریدا کۆببنەوە،

---

[697] بڕوانە: دیوانی پیرەمێرد (١٩٩٠: ب١: ٦٠).

[698] بڕوانە: ژین (١٩٤٦: ژ٨٢٠).

[699] ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٨٣).

پیرەمێرد هەر بۆخۆیشی لە نەورۆز دەدوێتو باسیدەکات، تا ئەو بایەخەی بخاتەڕو کە هاندەری خواستی ئەم بووە[700].

ت. هەوڵدان بۆ دانای دەستورێك بۆ زمانی کوردیی‌و چەسپاندنی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، ئەو دەنوسێت: ((لەساڵی ١٣٢٩ی ڕۆمیدا کە لە ئەستەموول غەزەتەی کوردی دەردەچوو من لە چۆلەمێرگەوە مەقالەیەکم بۆ ناردبوون‌و تەکلیفم لە جەمعیەتی کورد کردبوو کە لە هەر دیارێکی کوردستانەوە زبان زانێك بانگ بکەنە پایتەخت‌و زبانێك بۆ عمومی کورد هەڵ بژێرن‌و بیکەن بە فەرهەنگ وە دەستور هەتا مصارفاتی لە چاپدانیشم گرتبوە ئەستۆی خۆم. کەس گوێی نەدایە، ئێستا هەر کەسە بەهەوەسی خۆی شێوەیەك دێنێتە کارەوە، وایان شێواندوە. بەم بەستەزبانی‌و بێ ژیانیەوە چە لافێك لێ بدەین؟ بۆچ کوردستان تەنها ئەم هۆمەرە کوێرەیە؟! بۆچ کوردستانی گەورە لە زبانمان نەگا؟!))[701].

ج. بایەخدان بەخوێندن‌و خوێندەواریی و کردنەوەی "زانستی" کە ماوەی ١٢ ساڵ پێوەی خەریك بوو، (( ئەو دەیویست ئەو بەرگی پێشکەوتن‌و گیانی ڕاپەڕینە شارستانییە بکاتە بەری وڵاتە دواکەوتووەکەی لەبەر ئەوە خوێندەواریی‌و فێربوونی بەمەرجی بنەڕەتی ئەو پێشکەوتنە دادەنا))[702].

---

[700] بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٦٠).

[701] ژین (١٩٤٢: ژ٦٧٩: ٤) پاشکۆی ( ١ : ٢٢).

[702] ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٦٦).

### ٣/٣) ژیانو ژین، چەند ڕۆژنامەیەك لە ڕۆژنامەیەكدا

### ٣/٣-١) ڕۆژنامەی ژیان

ڕۆژنامەی "ژیان" وەك درێژكراوەی ڕەوتی ڕۆژنامەنوسیی ئینگلیز لە سلێمانیدا ژمارە(١)ی لە (ڕۆژی پێنج شەممە ٢١ی كانونی دووەمی ١٩٢٦)دا دەردەچێت[٧٠٣]، "ژیان" درێژكراوەی "ژیانەوە"یە، "ژیانەوە*"یش درێژكراوەی "پێشكەوتن**" بووە، واتە دواجار گوزارشتكەر بوون لە خواستەكانی ئینگلیزو ڕۆژنامەیەكی حكومیی بوون بەو مانایەی بەچەند ئاراستەیەك كاربكات، وەك:

١. بڵاوكردنەوەی ئاگانامەی حكومییو دادگاكان، كە بەبێ بونی ڕۆژنامەیەك نابێت، بۆیە دەبینین ژمارەیەكی زۆری لاپەڕەكانی "ژیان" بۆ ئاگانامە حكومییەكان تەرخانكراون.

---

[703] بڕوانە: ژیان (١٩٢٦: ژ: ١) پاشكۆی (أ : ١٤).

* لە لاپەڕە یەكی ژمارە یەكی"ژیانەوە"دا نوسراوە: (( لەبەر بەعزێ خصوصیات ناوی غەزەتەكەمان تەبدیل كرد بە مناسبت ئەحوال و ماجرایەك كە بەسەری هاتوە عنوانی "ژیانەوە"مان بە موناسیب زانی چونكە حەقیقەتەن ئینتشاری ئەم جارە ژیانەوەیە. ئومێد ئەكەین كە لەلایەنی هەموو كەسێكەوە مەزهەری قبوڵ ببێ ...تاد)) بڕوانە: ژیانەوە (١٩٢٤: ژ: ١) پاشكۆی (أ: ١١).

لە لاپەڕە یەكی ژمارە یەكی "ژیان"یشدا، لەژێر ناوی "ناوی تازەی غەزەتەكەمان"دا، دەنوسرێت: ((مەعلومە كە لیوای سلێمانی معروزی ئەو ئینقلابە بو كە دیمان و لە حەقیقەتدا مەحكومی مەحو بو. غەزەتە مەحبوبەكەشمان هەر وەها توشی ئەو تەئسیراتە هات، ڕوناكی تیا نەمابو، ...،بەو مناسەبەتەوە غەزەتەی ژیانەوەش كەوتە دەرەیەكی تازەو كشاوە.و بۆ ئەوەی بونو ژیانمان تەمسیل و ئیرشاد بكا ناوی نرا "ژیان"تەنها لە ناوی پێشوی بەلابردنی دو (ە)و (و)یەكی دواییەوە)) بڕوانە: ژیان (١٩٢٦: ژ: ١) پاشكۆی ( أ : ١٤).

** "پێشكەوتن" یەكەم ڕۆژنامەی شاری سلێمانییە دوای هێنانی چاپخانە لەلایەن (مێجەرسۆن)ەوە لە ساڵی ١٩١٩دا، لە ٢٩ی نیسانی ١٩٢٠دا یەكەم ژمارەی دەردەچێت "ئەم مێژووە لە (ڕەفیق ساڵح ئەحمەد :٢٠٠٢: ١٥)دا بەهەڵە نوسراوە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٢٠" و تا ٢٧ی تەموزی ١٩٢٢ بەردەوام دەبێتو ١١٨ ژمارەی لێدەردەچێت، لە ژمارە (١-٤٥)ی مێجەرسۆنو لە (٤٦-١١٨) گۆڵد سمیس بەرپرسی بوون. بڕوانە: ڕەفیق ساڵح ئەحمەد (٢٠٠٢: ١٥).

٢. دژایەتیکردنی حکومداریی شێخ مەحمود، ئیدی بە ڕاستەخۆ بێت، یان ناڕاستەوخۆو ، سود وەرگرتن لە هەڵوێستی ئەو منەوەرە کوردانەی حەزیان بە شێوازی حکومداریی شێخ نەدەکرد لەبەر هەر هۆیەك بێت، (( بەشێکی مونەوەرانی سەردەمەکە... هەڵوێستیان بەرامبەر بە شێخ مەحمود پێچەوانەو ناحەزانەبووە))[٧٠٤]، (جەمیل سائیب) لە ژمارە یەکی "ژیان"دا دەنوسێت: ((دوو ساڵ لە مەوپێشمان زۆرچاك لە بەرچاوە کە شەو و ڕۆژ ئیسراحەتی مادیو مەعنەوی نەمابوو ئەم عالەمە کەوتبووە حاڵو دەرەجەیەکی واوە کە دەستی لە حەیاتو سەروەتی بڕابوو، شۆرابوو. ئەمەیش هەر سەبەبی هەنێ بەدبینو بەدخواهی موڵكو میللەت بوو...))[٧٠٥].

٣. کۆکردنەوەی منەوەرانی ئەو سەردەمە لە دەوری خۆی تا وەك دەستەبژێری کۆمەڵ بیانکاتە سونبلو هێمای ڕازیبونی خەڵك بەدەسەڵاتی ئینگلیز.

٤. جوان پیشاندانی دەسەڵاتی ئینگلیزو ناشیرینکردنی دەسەڵاتی تورکو دواتریش دەسەڵاتی شێخ مەحمود، ((بەشێکی دیاری منەوەرانی سەردەمەکە، خۆشبین بوون بەوەی کە ئینگلیز وەك هێزێکی ڕزگارکەری میللەتانی عوسمانی لە دەست تورك هاتونەتە ناوچەکە. قەڵەم بەدەستەکانیان "ژیان"یان کردە مەیدانی دەربڕینی ئەو بۆچوونە))[٧٠٦]، (جەمیل سائیب) لە ژیاندا لەژێر ناونیشانی "بۆ خزمەتی خوێندەوارو تێگەیشتوو برادەرانی وەتەن"دا دەنوسێت: ((حامییەکی موشفیق، پشتیوانێکی گەورەی وەکو حکوومەتی

[704] ڕەفیق ساڵح، سدیق ساڵح (٢٠٠٢: ١٧).

[705] بڕوانە: ژیان (١٩٢٦: ژ: ١) پاشکۆی ( أ : ١٤).

[706] ڕەفیق ساڵح، سدیق ساڵح (٢٠٠٢: ١٧).

موعوزەمەی بەریتانیا چارەجۆ بوو، میللەتی لە پەنجەی مردن ڕزگار کرد...))[707].

٥. هاندانی خەڵکی کورد بۆ چوون بەرەو بەغداو قایلبوون بە خستنە سەر عیراقی ولایەتی موسڵ بە سلێمانیشەوە[708].

لەگەڵ ئەمانەدا هەرچەندە ژمارەیەك لە نوسەرانی کورد وەك سەنگەرێك بۆ دژایەتیکردنی شێخ مەحمود بەکاریان هێناوەو ئینگلیزیش مەرامی خۆی هەبووە، بەڵام زۆرێکیش لە منەوەران ئەو هەلەیان قۆستەوە تالێیەوە خزمەت بەکەلتوورو ئەدەب و ڕۆژنامەنوسیی کوردیی و خوێنەری کورد بکەن و ڕێ نەدەن تەرزی ئینگلیز زاڵبێت بەسەر تەرزی گشتیی میللەتەکەدا، هەر ئەمەش دەبێتە لایەنی زەق و دیاری سەرکەوتنی "ژیان" لە قۆناغەکانی دواییداو لەسەردەمی پیرەمێرددا دەگاتە بوژانەوەی تەواوی ئەم تێڕوانینە، کە دواتر لێی دەدوێین.

ئەوەی جێی سەرنجە هەر کاتێك کورد خۆی ڕۆژنامەی بۆ خۆی دەرکردبێت، بەتایبەتی لەو سەردەمانەدا، ئەوا بەجۆرێك لە جۆرەکان ناوی "کوردستان، یان کورد" ی کردۆتە ناونیشانی بڵاوکراوەکە، بۆنمونە: (کوردستانی بەدرخانییەکان ١٨٩٨، کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی ١٩٠٨، ڕۆژی کورد ١٩١٣، بانگی کورد ١٩١٤، کوردستانی مەهاباد ١٩١٤، کوردستانی حەڵەب ١٩١٥، کوردستانی ئەستەموڵ ١٩١٩، ڕۆژی کورد شەوی عەجەم –ورمێ ١٩٢١، بانگی کوردستان ١٩٢٢، ڕۆژی کوردستان ١٩٢٢، دیاری کوردستان ١٩٢٥،...تاد)، بەڵام ئینگلیزەکان ئەم ڕێبازەیان گۆڕی، هەر لە ساڵی ١٩١٨ەوە بە "تێگەیشتنی ڕاستی" و دواتر لە ١٩٢٠دا بە "پێشکەوتن"، لە ١٩٢٤ بە "ژیانەوە"، لە ١٩٢٦ بە "ژیان"، بۆ ئەوەی لەلایەك بەکورد بڵێن کە ڕۆژنامە بەرهەمی گەشەی کۆمەڵایەتیی و پێشکەوتنخوازیی و ژیانەوەیە، لە لایەکی تریش بیری نەتەوەیی بۆ کورد وەك نەتەوەکانی تر بەرەوانەبینن، ئەم ئەزمونەیان تەنها لای کورد کردووە،

---

[707] ژیان (١٩٢٦: ژ١: ١–٢).

[708] بڕوانە: ژیان (١٩٢٦: ژ١: ١) پاشکۆی (أ : ١٤).

ئەگەر نا، هەر کە ئینگلیزەکان دێنە بەسرە لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩١٤دا "بەسرە تایمز" بە عەرەبیی و فارسیی و تورکیی بڵاودەکەنەوە، دواتریش لە ٤ی تەموزی ١٩١٧دا ڕۆژنامەی "العرب" لە بەغدا بڵاودەکەنەوە، لە ژێر ڕۆژنامەی "العرب"دا نوسراوە ((ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی هەواڵگوزاریی مێژوویی ئاوەدانکەرەوەیە بەبیرو ئامانج عەرەبییە لە بەغدا عەرەب بۆ عەرەبی بڵاودەکاتەوە))[٧٠٩].

هەرچۆنێك بێت، "ژیان" دەبێتە میراتگری "ژیانەوە"، ئەوەی ئامانج و ناسنامەی ڕۆژنامەیەك دەردەخات، سیاسەتی ڕۆژنامەکەیە، نەك ناوی ڕۆژنامەکە، بۆیە بەم میتۆدە "ژیان" لە ژمارە (١-٥٥٣) کە دواژمارەی ژێر ناوی "ژیان"ە بۆ چوار قۆناغ دابەشدەبێت، کە بە ئاشکرایی لە چوار ڕۆژنامەی جیاواز دەچێت و هەر یەکەیان هەڵگری تایبەتمەندیی خۆیانن کەکەم تا زۆر لە سیاسەتی گشتییاندا لە یەکتر ناچن، لە هەر قۆناغێکیشیاندا کەسێك یان چەند کەسێك بەرپرسیارێتییان هەڵگرتووە کە ڕەنگدانەوەی کەسێتیی خۆیان و کەوتنە ژێر کاریگەریی ئینگلیزو حکومەت و شارەوانیان بەپێی بەرهەمە بڵاوکراوەکانیان زۆر تاکەم پێوە دیاربووە، ((ئەگەرچی هەموویان لە چوارچێوەی بەرنامەو سیاسەتێکی دیاریکراوی کاردا کۆکراونەتەوە، بەهەرەو تایبەتکاریی هەر یەکەیانی بەڕوونی پێوە دیارن و، چەند شەقڵێکی جیاجیایان پێ بەخشیوە))[٧١٠].

لەسەر ئەم بنەمایە "ژیان" بۆ ئەم کەس و قۆناغانە دابەشدەبێت[٧١١]:

- قۆناغی یەکەم: ژمارە (١-٨١)، جەمیل سائیب و محەمەد ئەدیب عەزیز بەڕێوەی دەبەن، ئەم ژمارانە هی سەردەمی دڵخۆشکردنە بەئینگلیزو دواتر بەحکومەتی عیراقی تازە دامەزراوی ساڵی

[709] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد (١٩٧٨: ١٠١).

[710] ڕەفیق ساڵح، سدیق ساڵح (٢٠٠٢: ٥).

[711] سەرچاوەی پێشوو.

١٩٢٤و له لايەکی ترەوه دژایەتیکردن‌و بوغزاندنی جوڵانەوەکەی مەلیك مەحموده.

- قۆناغی دووەم: ژماره (٨٢-٢٥٩)، عەلی عیرفان بەڕێوەی دەبات، هی سەردەمی تاوسەندنی کاری سیاسیی‌و شارستانانەو هەڵچوونی شۆڕشگێڕانەیه بۆ داواکردنی مافه نەتەوەییی‌و نیشتمانییەکانی کورد، که لەڕاپەڕینی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠دا گەیشته ترۆپك*.
- قۆناغی سێیەم: ژماره (٢٦٠-٣٢٠)، حسێن نازم بەرپرسیارێتیی وەردەگرێت، ژمارەکانی ئەم قۆناغه هی ماوەی خامۆشیی‌و تێکشکانی دوای شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانییه بەزەبری سەرکوتکاریی عەسکەریی حکومەتیی‌و ژماره (٢٦٠) له ٢٢ی ئەیلولی ١٩٣٠دا دەردەچێت، عەلی عیرفان دەگۆڕێت به حسێن نازم، دەشێت هەڵوێستی یەکەمیان بۆ بڵاوکردنەوەی یان قسەکردن لەسەر ئەو تاوانانەی ڕۆژی ڕەشی ئەیلول لەکارلابرابێت، چونکه جگه لەوەی بەرپرسەکەی دەگۆڕێت، ڕۆژنامەکەیش له جیاتی ١١ی ئەیلول، ڕۆژی ٢٢ی ئەیلول دەردەچێت‌و له یەکەم هەواڵیشیدا هەواڵی هەڵبژاردنەکانی خەڵك له دژیان وەستابوون بڵاودەکاتەوه[٧١٢].
- قۆناغی چوارەم: ژماره (٣٢١-٥٥٣)، یان قۆناغی پیرەمێرد، ئەم قۆناغه تا داخستنی مۆرکێکی ئەدەبیی‌و ڕۆشنبیریی گشتیی بەسەریدا زاڵدەبێت، بەڵام دوریانی دورکەوتنەوەشه لەو ڕەوتەی حکومەت بۆی دیاریکردووه، هەر بۆیه لەگەڵ هاتنی پیرەمێرددا ئیتر حکومەت دەکەوێته ململانێ لەگەڵ "ژیان"دا.

---

* ژماره (٢٥٩) له ٤ی ئەیلولی ١٩٣٠دا دەرچووه، واته دوو ڕۆژ بەر له شەڕی بەردەرکی سەرا.

[712] بڕوانه: ژیان (١٩٣٠: ژ٣٢٠: ١) پاشکۆی (أ : ٢٣).

نمونەیەکی دیاری جیاوازیی قۆناغەکانی "ژیان" ئەوەیەکە: ژمارە لە (٦٨)ی ٣١ی مایسی ١٩٢٧دا پاشکۆیەکی یەك لاپەڕەیی، کە بەمێژووی دوو ڕۆژ دوای دەرچوونی ژمارە (٦٨) بڵاوکراوەتەوە لە ٢ی حوزەیرانی ١٩٢٧داو تەنها بیست دێڕێك دەبێتو لەبەر ئەوەی بابەتەکە دەربارەی کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود بووە، نەوەستاون تا ژمارە (٦٩)ی ٧ی حوزەیرانی ١٩٢٧دێتو بە پاشکۆ بڵاویانکردۆتەوە، تیایدا هاتووە ((مەسئەلەی شێخ مەحمود دوایی هاتو بەتەواوی عەرزی ئینقیادی بە حکومەت کرد...))[713]، کەچی هەر ئەم ڕۆژنامەیە یەك دێڕ یان یەك هەواڵی بۆ ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ نییە، ژمارەی دوای (٢٥٩)ی ٤ی ئەیلولی ١٩٣٠کە ژمارە (٢٦٠)ە لە ٢٢ی ئەیلولدا دەردەچێتو یەکەم هەواڵی باس لە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنە دەکات کە خەڵکی شار دژی وەستاوبوون. بەڵام کە دێینە سەر "پیرەمێرد" ئەوا تەواو جودا لەو هەڵوێستانە شیعرە مەزنەکەی "وەفدی کوردستان" دەنوسێت.

جیاوازییەکی تری قۆناغی پیرەمێرد برەو پەیداکردنی ڕۆژنامەکەو زیادبونی خوێنەرانییەتی، پیرەمێرد وتارێکی لە ژمارەکانی پێشودا بڵاوکردۆتەوە، وەك خۆی دەڵێت لەبەرئەوەی لە ئەوسادا "ژیان" زۆر نەدەخوێندرایەوە، بۆیە لەسەردەمی خۆیداو بەتایبەتیش لە ژمارە (٤١١)دا جارێکی تر بڵاویدەکاتەوەو دەڵێت: ((ژیان ئێستا زیاتر دەخوێندرێتەوە))[714].

هێدی ڕۆژنامەکەو بەتایبەتیش لۆگۆکەی چەند جارێك گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە ژمارە (١-١١)[715] نازانرێت کێ لۆگۆی "ژیان"ی کێشاوە، بەڵام لە ژمارە (١٢)ەوە دووبارە بەهەمان تەرزی فارسیی (تەعلیق) نوسراوەتەوەو نەخشو کلێشەیەك بەچواردەورییەوەیە[716]، ناوی (حزنی یمنی)* لە ژێردایە. جیا لە

---

[713] بڕوانە: ژیان (١٩٢٧: پاشکۆی ژ٦٨) پاشکۆی ( أ : ٢٤).

[714] بڕوانە: ژیان (١٩٣٤: ژ٤١١: ١).

[715] بڕوانە: ژیان (١٩٢٦: ژ١: ١) پاشکۆی ( أ : ١٤).

[716] بڕوانە: ژیان (١٩٢٦: ژ١٢: ١) پاشکۆی (أ : ٢٥).

ڕۆژنامەکانی تری پێش خۆی کە لە سلێمانی دەرچوون، "ژیان" سەرەتا قەبارەکەی ٣٤سمX٢١سم دەرچووە، ئەم قەبارەیە تا ژمارە (٤٠٠) دەڕوات، بەڵام ژمارەکانی (٤٠٧–٥٣٨) قەبارەکەیان دەبێتە تابلۆیدو نزیکەی ٤٤سمX٣٠سم دەبن، لە ژمارە (٥٣٩–٥٥٣) دەبنە قەبارەی گەورە کە نزیکەی ٥٧سمX٤٢سم دەبن.

لە ژمارە (١–٦٢) لە ناساندنەکەیدا نوسراوە (ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتماعییە، هەفتەی جارێك دەردەچێ)و، ئەولۆگۆیەی "ژیان" کە لەژمارە (١٢)ەوە دادەنرێت، تا ژمارە (٤٠٠) بەردەوام دەبێت، لە ژمارە (٦٣)ەوە تا (٤٠٠) نوسراوە: (هەموو شتێك ئەنوسێ هەفتەی جارێك دەردەچێ غەزەتەیەکی کوردییە، لە ژمارە (٤٠٧)دا قەبارەو لۆگۆو ناساندنەکەی دەگۆڕێت، ناساندنەکەی دەبێت بە: (ڕۆژنامەیەکی کوردییە هەموو پێنج شەموانێ دەردەچێ[717]، ئەم ژمارەیە بەسەرەتای قۆناغی تازەی "ژیان"ی سەردەمی پیرەمێرد دەناسرێتو بەقۆناغی ژیانەوەی ژیان ناودەبرێت پاش ئەو هەموو نەهامەتییانەی بەسەر چاپخانەکەو پیرەمێردیشدا هاتن، "ژیان" بەتەواوی دەکەوێتە ژێر ئیدارەی پیرەمێردەوەو ڕێڕەو سیاسەتی کارکردنی "ژیان" لێرەوە دیاریدەکرێتەوە، لە (٤٠٨)ەوە دەنوسرێت: (هەموو شەموانێ دەردەچێت)، بەڵام دیارە هەڵەی زۆر لە ڕۆژو مێژوو لاپەڕەکانی "ژیانو ژین"دا هەن، هەموو ئەم هەڵانە لە پاشکۆی (پ)ی تایبەت بە ژمارەکانی "ژیانو ژین"دا تۆمارکراون. لە ژمارە (٤٣٦)ەوە ڕێنوسی لاتینیش بەکاردەهێنێتو گوێچکەی چەپ بۆ ناوو ناونیشانو ناسنامەی ژیان بەلاتینیی تەرخاندەکات[718]، لە ژمارەکانی دوای ئەم ژمارەیەوە چەندجارێك بابەت

---

* ئەو ناوە ئاماژەیە بۆ ناوی هەریەك لە (حسێن حوزنی موکریانی)و (ئەمین یومنی کۆیی) کە ئەو ڕۆژانە (معمل الحفر الزنکوغراف و الأختام المعدنیة و الآرمات النحاسیة و البلوریة)یان پێکەوە لە بەغدا هەبووەو هەر ئەوانیش لۆگۆی تازەی"ژیان"یان کێشاوە. بڕوانە: ڕەفیق سالح، سدیق سالح (٢٠٠٢: ٧).

[717] بڕوانە: ژیان (١٩٣٤: ژ٤٠٧: ١) پاشکۆی (أ : ٢٦).

[718] بڕوانە: ژیان (١٩٣٥: ژ٤٣٦: ١) پاشکۆی (أ : ٢٧).

بەلاتینیی بڵاودەکاتەوە[719]، لە ژمارە(٤٦٧)ەوە ڕێنوسی لاتینیی نامێنێت، لە ژمارە (٥٣٩)ەوە قەبارەکەی دەبێت بە قەبارە گەورە ٥٧سمX٤٢سم، لێرەوە سەرلەنوێ لاتینیی دەنوسرێتەوەو ناسنامەکەیشی دەبێت بە (ڕۆژنامەیەکی ئەدەبیی و فەنییە)[720]، دوا ژمارەی "ژیان" ژمارە (٥٥٣)یە لە ١٠/٣/١٩٣٨دا دەردەچێت[721].

## ٢-٣/٢) ڕۆژنامەی ژین

پاش وەستانی ڕۆژنامەی "ژیان"، لە ژمارە (٥٥٣)داو دواتر داخستنی ڕۆژنامەکە، پیرەمێرد ئەو ڕێبازەی گرتویەتی بەریناداتو فشارەکانی سلێمانی ڕووەو بەغدا جێدەهێڵێت، پاش هەوڵی دڵسۆزانەی ڕوناکبیرە کوردەکانی بەغدا بەتایبەتیی ئەوانەی کە لە دەسەڵاتدابوون، توانی ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی تر وەربگرێت بەناوی "ژین"ەوە، بە یادی "ژین"ی ئەستەموڵەوە[722]، یان دەشێت لەو گۆشەنیگایەشەوە بوبێت کە ئەگەر "ژیان" تەنها ناوبێت، ئەوا "ژین" ناوی کردارو خستنەباری کرداریی ئەو ناوەیە.

دەوترێت: ((ڕۆژنامەی "ژیان" داخرابوو، بەبیانوی ئەوەی لە وادەی خۆیدا دەرناچێت، بەپێی یاسا ئیمتیازەکەی "ژیان"ی پیرەمێرد، ئیلغاکرایەوە، پاش هەوڵەکانی، پیرەمێرد توانی ئیمتیازەکە لە بەغدا وەربگرێتەوە، بەڵام نەدەبوو بەهەمان ناوەوە بێت، بۆیە ناوەکەی گۆڕی بە "ژین"، ئەمین زەکی بەگ لە دیارترینی ئەو کەسانە بوو کە هاوکاریی پیرەمێردی کرد بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی ڕۆژنامەی "ژین" ))[723].

---

[719] بڕوانە: ژیان (١٩٣٥: ژ٤٣٩: ١) پاشکۆی ( أ : ٢٨).

[720] بڕوانە: ژیان (١٩٣٧: ژ٥٣٩: ١) پاشکۆی ( أ : ٢٩).

[721] بڕوانە: ژیان (١٩٣٨: ژ٥٥٣: ١) پاشکۆی ( أ : ٣٠).

[722] بڕوانە: دیوانی پیرەمێرد: (١٩٩٠: ب١: ٤٣).

[723] مستەفا ساڵح کەریم (٢٠٠٦: چاوپێکەوتن).

لێرەوە، یەکەم ژمارەی "ژین" کە بەپێی ژمارەبەندییەکەی پیرەمێرد دەکاتە (٥٥٤) لە ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٣٩دا* دەردەچێت.

بەڵام بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنێت کە "ژیان" تەنها ناوەکەی گۆڕاوەو قەڵەمو نوسەرو ناوەڕۆکەکەی لە جێی خۆیان ماون، بۆیە ژمارەیەکی نوێی بە ڕۆژنامەی "ژین" نەدا، بەڵکو هەر لەسەر زنجیرەی ژمارەکانی "ژیان" ڕۆیشتو بەو پێیە دوای دەمانگو نیو لە داخستنی "ژیان"، "ژین"ی بە ژمارە (٥٥٤)دەرکردەوە، "ژین" بەهەمان هێدی "ژیان"ەوە دەرچوو، تەنها لۆگۆی "ژیان" گۆڕا بۆ "ژین"، تەنانەت ئەم گۆڕانکارییە ڕێنوسە لاتینییەکەیشی نەگرتەوەو هەر بە "ژیان" مایەوە[٧٢٤]، پیرەمێردیش بۆ چەسپاندنی ئەمە، لە وتاری (ژیان ژیایەوە)دا باسی "ژین" ناکاتو پێ لەسەر "ژیان" دادەگرێتو دواتریش پیرۆزبایی بۆ دەرچونەوەی "ژیان" دەنوسرێت[٧٢٥].

لە ژمارە (٥٧٩)ەوە ناسنامەکەی دەبێت بە (ڕۆژنامەیەکی کوردی ئەدەبی و فەنیو ئیجتماعییە)و تا ژمارە (٧٠٩) بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت، لە ژمارە (٥٨٢)ەوە قەبارەکەی دەگۆڕێت بە ٥٠سمX٣٥سم، ئەوی خاڵێکی گرنگە لێرەدا ئەوەیە ، **ژمارە (٥٨٣)ی ڕۆژنامەی "ژین" دەرنەچووە**، بەو بەڵگەیەی ژمارە (٥٨٢) لە ٥/١٠/١٩٣٩دا دەرچووەو ئەو ژمارەیەی کە دەبوو (٥٨٣) بێت، لە لاپەڕەی یەکەمیدا بەهەڵە نوسراوەتەوە (٥٨٢)و لە لاپەڕەکانی ناوەوەو کۆتایشیدا نوسراوە (٥٨٤)و لە ١٦/١٠/١٩٣٩دا دەرچووە، کەواتە ئەم ژمارەیە ژمارە (٥٨٤)ە، نەك (٥٨٣)، ماوەی نێوان ژمارە (٥٨٢) بۆ ژمارە (٥٨٤) تەنها دوانزە ڕۆژە کە ئەگەر ژمارە (٥٨٣) دەرچوبێت، ئەوا نەدەبوو ژمارە (٥٨٤) لە

---

* ئەم مێژووە بەهەڵە لە ڕۆژنامەکەدا نوسراوە (١٩٣٨)، بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٥٤: ١) پاشکۆی (أ : ١٩).

[724] بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٥٤: ١) پاشکۆی (أ : ١٩).

[725] بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٥٤: ٤) پاشکۆی (أ : ٣١)، یان بڕوانە: ژین (١٩٤٤: ٧٤٥).

**١٩٣٩/١٠/١٦دا دەربچێت، لانی کەم بەپێی بارودۆخی دەرچوونی ئەو کاتەی دەبوا لە ١٠/١٩دا دەربچووایە[٧٢٦].**

**لە ژمارە (٦٢٤)ەوە جارێکی تر ڕێنوسی لاتینیی نامێنێت و لەبری ئەوە گوێچکەی چەپ بۆ بڵاوکردنەوەی ئاگانامەکان بەکاردەهێنرێت[٧٢٧]. لەگەڵ ئەوەی "ژین" هەموو کات لە کاتی خۆیدا بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام تەنها جارێك "دواکەوتنی ژین" لە ڕۆژنامەکەدا ئاماژەی پێکراوە کە دوو هەفتە لەوادەی خۆی دواکەوتووە[٧٢٨].**

**ژمارە (٧٠٠) بەهەڵە نوسراوە (٧٠١)، ئەم هەڵەیەش وایکردووە کە ژمارە (٧٠١) دەرنەچێت، بە دوایدا ژمارە (٧٠٢) دەرچووە.**

**لە ژمارە (٧١٠)دا جارێکی تر ناسنامەکەی دەگۆڕێت و دەبێت بە (ڕۆژنامەیەکی کوردی و ئەدەبی و سەقافییە)[٧٢٩]، تەنها لەم ژمارەیەدا وادەبێت، لە ژمارە (٧١١)ەوە دەبێت بە (ڕۆژنامەیەکی کوردی ئەدەبی و کۆمەڵییە)[٧٣٠]، لۆگۆی ڕۆژنامەکە سەرلەنوێ لە ژمارە (٧٤٨)دا دەگۆڕێت و ئەمجارە ناسنامەکەی وەکو پێش خۆی دەمێنێتەوە بەڵام بە خەتی دەست دەنوسرێت[٧٣١]. ژمارە (٨١٩)ی "ژین" تەرخانکراوە بۆ یادی بیستەمین ساڵەی دەرچوونی ڕۆژنامەکەو ئەم ژمارەیە بە (١٢)لاپەڕە دەرچووەو بەشێوەیەکی ناوازە بڵاوکراوەتەوە[٧٣٢].**

**لە ژمارە (٩٠٧)دا جارێکی تر گەردنی ڕۆژنامەکە دێتەوە خوار لۆگۆکەی[٧٣٣]. ڕۆژنامەکە زۆرجار بە چوار لاپەڕەو هەندێکجار بە شەش لاپەڕەو جارجا بە هەشت**

---

726 بڕوانە: پاشکۆی ( أ : ٣٢-٣٣).

727 بڕوانە: ژین (١٩٤١: ژ٦٢٤: ١) پاشکۆی ( ا : ٣٤).

728 بڕوانە: ژین (١٩٤٣: ژ٦٩٩).

729 بڕوانە: ژین (١٩٤٣: ژ٧١٠).

730 بڕوانە: ژین (١٩٤٣: ژ٧١١).

731 بڕوانە: ژین (١٩٤٤: ژ٧٤٨).

732 بڕوانە: پاشکۆی ( أ : ٣٥-٣٦).

733 بڕوانە: ژین (١٩٤٨: ٩٠٧).

لاپەڕەو تەنها جارێکیش لە یادی بیست ساڵەی ڕۆژنامەکەدا، بە دوانزدە لاپەڕە دەرچووە[٧٣٤].

دوا ژمارەی "ژین"ی درێژکراوەی "ژیان"ی سەردەمی پیرەمێرد، بەپێی ژمارە بەندییەکەی پیرەمێرد دەگاتە (١٠١٥)* کە لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٥٠دا دەرچووە[٧٣٥]، واتە تەنها چوار ڕۆژ پێش کۆچی دوایی پیرەمێرد دەرچووەو بەدەستی خۆی چاپی کردووە، ئەوەی لەم ژمارەیەدا جێی سەرنجە ئەو وتارەی لاپەڕە سێی ئەم ژمارەیەیە کە لەژێر ناوی "فەلسەفەی حەیات لە سەرە مەرگدا" پیرەمێرد نوسیویەتی[٧٣٦]، نوسینێك نزیکە لە زانینی کەس بە مردن، مەرگێك کە زیندوێتیی هەتا هەتایی پێدەبەخشێت.

کەواتە ئەوە ڕونە کە "ژین" تەواوکەری "ژیان"بووە، بۆیە دەشێت وەك ڕۆژنامەیەك تەماشابکرێن، بەتایبەتیی لە قۆناغی پیرمێردەوە کە لە ژمارە (٣٢١ی ژیان –١٠١٥ی ژین) دەگرێتەوە، "ژین" بەو ڕەوتەی تا ژمارە (١٠١٥)ی ١٩٥٠/٦/١٥ دەرچوو، دوای پیرەمێردیش وەك ئەمەکێك بۆ بەجێهێنانی وەسێتنامەکەی پیرەمێرد، هەر بەردەوام بوو، یەکەم ژمارەی دوای کۆچی پیرەمێرد کە ژمارە (١٠١٦)یە لە ١٩٥٠/٩/٧دا دەرچووە[٧٣٧]، دوا ژمارەیشی کە ژمارە (١٧١٤)بووە لە ٧ی شوباتی ١٩٦٣ دا دەرچووە[٧٣٨].

---

[734] بڕوانە: پاشکۆی ( أ : ٣٧).

* لە ڕاستیدا، کۆبەندی ژمارە دەرچووەکان لە سەردەمی پیرەمێرددا، دەکاتە ژمارە (١٠١٣) دوای ئەوەی سەلماندمان کە ژمارەکانی (٥٨٣)و (٧٠١) دەرنەچوون.

[735] بڕوانە: ژین (١٩٥٠: ژ١٠١٥: ١) پاشکۆی ( أ : ٢٠).

[736] بڕوانە: ژین (١٩٥٠: ژ١٠١٥: ٣) پاشکۆی ( أ : ٣٨).

[737] بڕوانە: ژین (١٩٥٠: ١٠١٦: ١) .

[738] بڕوانە: ڕەفیق ساڵح ئەحمەد (٢٠٠٢: ٢٩).

## ٣-٣/٣) ژیان‌و ژین و ئاستەنگەکانی بەردەمیان

"ژیان" کاتێك دێتە قۆناغی پیرەمێردەوە، بەئاستەنگەلێکی زۆردا دەڕوات، ئەم ئاستەنگانە بەشێکی زۆریان لە "ژین"یشدا بەردەوام دەبن، لێرەدا جگە لەوانەی لە پێشەوە باسکران، چەند لایەنێکی تری ئەم ئاستەنگانە دەخەینەڕو:

ا. سانسۆر:

سانسۆر لە ڕۆژنامەی "ژیان‌و ژین"دا تەوەرێکی گرنگ پێکدەهێنێت، چونکە هەرچەندە ڕۆژنامەکە دواتر دەبێتە هی خودی پیرەمێرد، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی دەسەڵاتی ئەو کاتەی ئینگلیز لە شاری سلێمانییدا دەست نەخەنە کاروبارەکانییەوە، "ژیان‌و ژین" لانی کەم ئۆرگانێکی ڕاستەقینەی ناوچەی سلێمانی‌و دواتریش دەوروبەری بوون، ئینگلیزەکان دەرکیان بەبایەخی ئەو بابەتانە کردووە کە لە ڕۆژنامەکەدا بڵاودەبنەوە، بۆیە سانسۆرگەلێکی گەورەیان لەسەر ڕۆژنامەکەو بابەتەکانی داناوە، لەسەردەمی پیرەمێرددا بەحوکمی ئەوەی پیرەمێرد لە جۆری قۆناغەکانی تر بەتایبەتیی قۆناغی یەکەمی ژیان نەبووە، بۆیە سانسۆرەکەیان زەقترو توندترو دیارتر بووە، تا ئەوەی بابەتەکان دەبوو بەمۆرو ئیمزای ئامریەی حامییەی سلێمانی، پاش بینینی بڵاوبکرێنەوەو، بابەتیش هەیە کە ڕێیان لە بڵاوکردنەوەی گرتووەو نەیانهێشتووە وەك ئەوەی هەیە بخرێتەڕو[٧٣٩].

((ڕۆژنامەی ژیان گەلێك جار تووشی قۆرت‌و کێشمەکێش‌و دەرنەچوون‌و داخستن بوە، هەندێ جار لە بەر کەم دەستی ناچاربوە چاپخانەکەی خستۆتە ڕەهنی دائیرەی ئەیتامەوە هەندێ جاریش لەلایەن کاربەدەستانی میریەوە تووشی هەڕەشەو گوڕەشە بوە))[٧٤٠]، یان پیرەمێرد خۆی دەنوسێت: ((بەمۆری پۆستەخانەی هەولێرەوەو بەناوی کوردێکی ڕاست بێژ، مەنزومەیەك بۆ ژیان

---

[739] بڕوانە: پاشکۆی (ب : ١، ٢، ٣،٤).

[740] محمد رسول هاوار (١٩٧٠: ٤٠).

هاتبوو، شێوەکەی کوردییەکی جوان و ڕاستو ڕەوانە، بەڵام جۆشو خرۆش دەست نادا بۆ ئەم زەمانە، جارێ لامانە))[٧٤١].

ب. گرانیی چاپو چاپەمەنیی:

گرفتێکی تری "ژیانو ژین"، گرانیی نرخی چاپو کەرەستەکانی چاپەمەنییو کۆنیی چاپخانەکەو نەبونی کەرەستەی یەدەكو پێداویستییەکانی تر بووە، کەوایانکردووە ئاسان نەبێت ڕۆژنامەکە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا دەربچێت[٧٤٢]، ئەم ڕۆژنامەیە داهاتێکی ئەو تۆی نەبووە، زۆرجار بەقەرز دەرچووە ((پیرەمێرد لە پێناوی ئەم چاپخانەیەدا ...، گەلێ تەنگو چەڵەمەی هاتۆتە ڕێ، بچوکترینیان ئەوە بوە کە لە ساڵی ١٩٤٧دا دەرامەتی بەتەواوی لێ بڕابوو، بۆ ئەوەی پەکی نەکەوێ خانووەکەی خستە ڕەهنی ئەیتامی کەرکوکەوە (٦٠) دیناری نارد بۆ من (عەلادین سەجادی) بۆ بەغدا بۆم دا بە مەرەکەبو حروف))[٧٤٣]،(عەلادین سەجادی) دەڵێت: ((حروفاتی مەکینەکە کۆن بو بو وە هیچ کەرەسەیەکی نەمابوو))[٧٤٤].

پ. فرۆشتنو ئابونەو داهات:

بازاڕەکانی سلێمانی لەو سەردەمانەدا دیاریکراوبون، جگە لەوەی خوێندەوارانیش کەمو دانیشتوانی شاریش نەگەیشتبووە پەنجا هەزار کەس، بۆیە "ژیانو ژین" بەپلەی یەکەم پشتیان بەو کەسانە بەستووە کە ئیشتراك لە ڕۆژنامەکەدا دەکەنو ئابونە دەدەن، نەك لەسەر فرۆشتنی بازاڕ، لە بارەی فرۆشتنی ڕۆژنامە لەو سەردەمەدا (ساڵح قەفتان) لە سەروتارێکی "زبان"دا دەنوسێت: ((قەت بووە لە شارێکی بیستوپێنج هەزار کەسیی وەك سلێمانیدا دوو ڕۆژ موەززیع ڕۆژنامە بگێڕێ کەچی هەموو حەوت نوسخەی بۆ

---

741 بڕوانە: ژیان (١٩٣٢: ژ٣٢٧: ٤) پاشکۆی ( أ : ٣٩).

742 بڕوانە: ژیان (١٩٣٣: ژ٣٧٢: ١) پاشکۆی ( أ : ٤٠).

743 عەلائەدین سەجادی (١٩٥١: ١٩).

744 سەرچاوەی پێشوو (٤).

بفرۆشرێت؟...، خۆ ئەگەر (زبان) بەکاری خوێندنەوە ناشێ، با (ژیان) بکڕن‌و بیخوێننەوە))[٧٤٥].

ئەمەش هەر لەسەرەتاوە تا کۆچی پیرەمێرد، گرفتێکی گەورەی بۆ داهاتی ڕۆژنامەکە دروستکردووە، چونکە بەشێکی زۆری ئەو کەسانە، یان لە کاتی خۆیاندا ئابوونەکەیان نەداوە، یان تا ئەمڕۆش قەرزای پیرەمێردن، ((ڕۆژنامەکانی ژیان‌و ژینی پیرەمێرد هەموو جارێك کە دەرئەچوو چەند دانەیەکی لە شاری سلێمانیدا بلاوئەکرایەوەو ئەوانی تری بە پۆستە ئەنێررا بۆ چەند کەسێك))[٧٤٦]، پیرەمێرد لە یاداشتێکیدا لە ١٩٥٠/٢/٢٦دا، دەنوسێت: ((تەنیا شەخسێکم کە لە ڕووی غەزەتەکەیەوە چەند دەردی سەری دیوە، خانووە شڕەکەی ناوەتە بارمتە، ئێستاش ڕەهنی ئەموالی (قاصرین)ە، ئەمە شەرەف‌و فەخرێکی کەم نییە!...، سەقافەی (صحافە) خوا لە شارێکی کوردستاندا داویە بە قەومی کوردو پیرەمێردێکی وا!!. من گلەیی لە قەومەکەم ناکەم کە تا ئێستا بەهیچ ڕەنگێ یاریدەیان نەداوم‌و لە هەموو خاکی عراقدا یەك دوو ئابوونەی کڕیاری خۆماڵی هەیە کە پارە ئەدەن!!))[٧٤٧]. پیرەمێرد چەندان جار داوای لە بەشداربووەکانی کردووە ئابوونەکەی بۆ بنێرن، بەلاّم بێ ئاکام بووە[٧٤٨].

ت. ئاگانامەو ئاگادارییەکان:

ئاگانامەو ئاگادارییەکان بەشێکی زۆری لاپەڕەکانی "ژیان‌و ژین"یان پێکهێناوە، ڕوبەری ئەمانە لە ژمارەیەکەوە بۆ ژمارەیەکی تر، لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر جیاوازبوون، بۆ نمونە لە سەرەتادا ئاگادارییەکان شێرەبەشی بابەتەکانی ڕۆژنامەکەیان داگیرکردووە، تا ئەوەی نامەیان لە خوێنەرانەوە بۆ هاتووەو گلەیی ئەوەیان لێدەکات کە ڕۆژنامەکە ئامانجی خۆی لە دەستداوە، لەژێر ناونیشانی

---

[745] بڕوانە: زبان (١٩٣٧/١٢/١٩: ژ١٣: ١).

[746] محمد رسول هاوار (١٩٧٠: ٣٩).

[747] ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ١٧).

[748] بڕوانە: ژمارەکانی ژیان (٣٥٤، ٣٥٥، ٣٦٢، ٣٦٣، ٥٣٦، ٥٣٧)و ژمارەکانی ژین (٥٩١،...تاد).

"ڕەخنە لە ژیان"دا خوێنەران گلەیی ئەوە دەکەن کە (ڕۆژنامەکە پڕبووە لە ئیعلانات کە نەفعی خۆیانەو نەفعی عامی تیانەماوە)[749]، پیرەمێردیش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوەو دەنوسێت: ((زۆر کەس کە لە پێشدا کڕیاری بوو، نەیدەویست یان بۆی نەدەچوو. لەبەر ئەوە بۆ ئەوەی بڵێن غەزەتەمان هەیە بە پارەی بەلەدییە دەردەهات تەنها کەڵکی جاڕچیەتی پێوەبوو))[750].

ڕۆژنامەکە سەرچاوەی دارایی ئەو تۆی نەبووە پشتی پێ ببەستێت، بەتایبەتی کە دێتە ژێر دەستی پیرەمێردەوە، بۆیە بەگشتیی پشتی بەداهاتی ئاگادارییەکان و ئەو ئابوونانە بەستووە کە داهاتێکیان بۆ ڕۆژنامەکە گەڕاندۆتەوە.

ج. سەرچاوەی زانیارییەکان:

ڕۆژنامەکە بۆ دەستخستنی زانیارییەکان پشتی بەچەند سەرچاوەیەك بەستووە. لەوانەی بابەتی ئەدەبیی و ڕۆژشنبیریی و گشتیی بوون، بەپلەی یەکەم پشتی بە قەڵەمەکەی خۆی و ئەزمونی ژیانی خۆی و دواتر بە نوسەرانی سەردەمەکەو نامەو ڕازی هاووڵاتیان بەستووە.

لە هەواڵ و بابەتە هەواڵییەکانیشدا پشتی بە خۆی و ئەزمونی خۆی و ئەگەر ڕوداوەکە لە ناوشاریشدا بوبێت خۆی چۆتە سەر ڕوداوەکە، دواتر پشتی بەو بڵاوکراوانە بەستووە کە لە لایەن باڵیۆزخانەی بەریتانیاوە بڵاوکراونەتەوە[751]، دواتر پشتی بەهەندێك ڕۆژنامەی تورکیی و عەرەبیی بەستووە، ئەوەی جێی سەرنجە بەماوەیەکی کەم لە ئاست ئەو ڕۆژگارانەدا، ئەو ڕۆژنامانەی دەرەوەی پێگەیشتوون و ئەمیش بە ئاماژەدان بەسەرچاوەکانیان سودی لێوەرگرتوون و هەواڵ و بابەتی ڕۆژنامەنوسیی تری لێداڕشتونەتەوە، وەك ڕۆژنامەکانی (تانی تورکی، لوئلوسی تورکی، ئەلزەمانی بەغدا، صوت الشعب)[752]، هەندێك جاریش

---

[749] بڕوانە: ژیان (١٩٣٤: ژ٤١٠: ٤).

[750] بڕوانە: ژیان (١٩٣٣: ژ٣٧٢: ١).

[751] بڕوانە: بڕوانە: پاشکۆی (ب : ٥، ٦، ٧).

[752] بڕوانە: ژمارەکانی ژیان (٥٤٤، ٥٤٧) ژین ( ٥٥٥، ٥٩٧).

پشتی بەزانیاریی کەسانێك بەستووە کە خۆیان زانیارییەکانیان بۆ ڕۆژنامەکە ڕەوانە کردووە، وەك لە هەواڵی "عراق‌و جگەرە"دا دەردەکەوێت، کە لە ((ئەزمیرەوە، ئەحمەد ڕەفیق: عضوی بەعثە بۆ تخصص لە توتوندا))[٧٥٣] ناردویەتی، کە دەشێت وەك سەرچاوەیەکی کەسیی تەماشابکرێت.

ح. جوگرافیای بڵاوبونەوە:

پیرەمێرد هەوڵی داوە بەپێی بوار، ڕۆژنامەکە بگەیەنێتە دورترین شوێن، بەڵام کەمجار ئەم خواستەی هاتۆتە دی، لەگەڵ ئەوەی عاشقێکی دیاری سلێمانییە، بەڵام ناوچەگەرێتیی لە ڕۆژنامەکەیدا ڕەنگی نەداوەتەوە، بۆیە لە زۆر شوێنی کوردستانەوە نامەو بابەتی بۆ هاتووەو "ژیان و ژین"یان بە بەنرخ‌و بەهادار باسکردووە، بەڵام دیارە بەهۆی خراپیی هاتوچۆو نەگەڕانەوەی ئابونەو پارەی ڕۆژنامەکەوە، ئاسان نەبووە بەردەوام ڕۆژنامەکە بگەیەنێتە هەموو شوێنێك، پیرەمێرد دەنوسێت : (( ژیان وەك خێویَ لە پاش مردن قەدری زانرابوو، ژین لە جێی ئەوە لە هەموو لایەکەوە داوای ئەکەن، لە کوت‌و حلەوە، پێشەکی پارەی ئابوونەیان ناردووە، ئینجا ئەڵێن بۆمان بنێرن...))[٧٥٤].

خ. هەڵەی چاپ:

لەو سەردەمانەدا پیتەکان بەدەست ڕێکخراون، کەسی پیتچن بەگشتیی زانیارییەکی ئەوتۆی لەسەر بابەتەکان نەبووە، بۆیە تەنها ڕەسمی نوسینەکانیان کردووە، دیارە پیتەکان بەپێچەوانەوە لەسەر سەحنێك ڕێکدەخران، تا کاتی لە چاپدان نەدەتوانرا ڕاست‌و هەڵە بزانرێت، لە دوای چاپیش کە هەڵەکان دەزانران، نەدەتوانرا چاکبکرێنەوە، چونکە بە گۆڕینی هەر پیتێك هەموو سەحنەکە تێکدەچۆوەو هەڵەچن نەیدەتوانی وەك پێویست ئیشی خۆی بکات، بۆیە هەڵەگەلێکی زۆر لە ژمارەکانی "ژیان‌و ژین"یشدا بەرچاودەکەون، جار هەبووە

---

753 بڕوانە: ژیان (١٩٣٤: ژ٤٠٩: ٢) پاشکۆی ( ا: ٤١).

754 بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٥٧: ٤).

پیرەمێرد خۆی دوای دەرچونی ڕۆژنامەکە هەڵەچنی لە سەر ژمارە چاپکراوەکە کردووە[755].

هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەند دەستنوسێکی پیرەمێرد لە پاشکۆی (ب) دا خراونەتەڕو.

چ. دووبارەبونەوەی بابەتە بڵاوکراوەکان:

بابەتگەلێك لەم ڕۆژنامەیەدا هەن کە بەبێ هۆیەکی ئاماژەبۆکراو دووبارە بڵاوکراونەتەوە، بۆ نمونە: سەروتاری ژمارە (٨٩٤) بەهەمان شێوە بۆتەوە بەسەروتاری ژمارە(٩٤١)، شیعرێکی "حەریق" جارێك لە لاپەڕە (١ )ی ژمارە (٦٦٩)و جارێکی تر لە لاپەڕە (٣)ی ژمارە (٨٨٠)دا بڵاوکراوەتەوە، بابەتی تری لەم جۆرانەش لە ڕۆژنامەکەدا بەدیدەکرێن. بابەتگەلی زۆریش هەن ناوەڕۆکەکانیان چەندبارە بونەتەوە، بەڵام شێوازی داڕشتنەکەیان گۆڕانی بەسەرداهاتووە، پەندەکانی پیرەمێرد نمونەی زیندوی ئەم سەرنجانە پیشاندەدەن. لە ناونیشانی بابەتەکانیشدا دەیان ناونیشانی هاوشێوەو وەکیەك بەدیدەکرێن، بێئەوەی ئەو ناونیشانانە ناونیشان گۆشە یان ستونێك بن، بۆ نمونە (مبعوثە کانمان) کە لە ژمارەکانی (٨٧٥)و (٩٩٩)دا، دابەزیوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، ئەوەی گرنگە ئەم ڕۆژنامەیە لەگەڵ سەختبونی ئاستەنگەکانیدا، توانیویەتی تا سەردەمی کودەتای بەعسییەکان لە عیراقدا، واتە تا ڕۆژێ بەر لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بەردەوام بێت.

---

[755] بڕوانە: ژین (١٩٤٦: ژ٨٣٥: ١) پاشکۆی ( أ : ٤٢).

# بەشی چوارەم

# ڕەنگدانەوەی
# چەشنە ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسییەکان
# لە "ژیان و ژین" دا

له بەشی یەکەم و دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا چەندین جۆرو هونەری ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسییمان لە چەشنە ئەدەبیی و ڕۆژنامەنوسییەکان جیاکردەوەو پۆلێنمانکردن، لەم بەشەدا ژمارەکانی "ژیان" لە (٣٢١ بۆ ٥٥٣) و "ژین" لە (٥٥٤ بۆ ١٠١٥) دەکەینە ئەو جێگانەی تیایاندا بۆ ڕەنگدانەوەو شیکردنەوەی چەشن و جۆرو هونەرە بەکارهاتووەکان دەگەڕێین.
لەبەرئەوەی چ ژیانی سەردەمی پیرەمێرد و چ ژینی سەردەمی پیرەمێرد بە تەواوکەری یەك دانراون، بۆیە وەك یەك ڕۆژنامە شیکردنەوەکانمان لەسەریان دەخەینەڕوو.

بەگشتیی بواری بابەتەکانی ناو "ژیان و ژین" لەم قۆناغەدا دابەشدەبن بەسەر ئەم بوارانەدا[٧٥٦]:

١- ئەدەبیی ٢- کۆمەلایەتی ٣- ئابووری ٤- فەلسەفی ٥- مێژوویی ٦- زانیاریی ٧- ئایینی ٨- گاڵتەوگەپ و پێکەنین

ڕۆژنامەکەش بەگشتی بۆ دوو ڕەهەند دابەش دەبێت:

١- ڕەهەندی ئەدەبیی.
٢- ڕەهەندی ڕۆژنامەنوسیی.

---

[756] بڕوانە: ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٦٧-٦٨).

## ١/٤) ڕەهەندی ئەدەبیی

### ١/٤-١) چەشنەكانی ئەدەبو "ژیانو ژین"

پشکی ئەدەب لەم ڕۆژنامەیەدا دیارو بەرچاوە، چ لەبەرئەوەی پیرەمێرد بەرلەوەی ڕۆژنامەنوس بووبێت ئەدیب بووە، چ لەبەرئەوەی (نەك هەر لەو سەردەمەدا كە ژمارەی خوێندەواران دیاریكراو بوون)، لە ئێستاشدا زمانی ئەندێشەو سۆزو پیشاندانی ئیمەیجیانەی بابەتەكان لەم جۆرە كۆمەڵگایانەی ئێمەدا درێژەیان هەیە.

ڕاستە ڕۆژنامە بەرهەمی شارستانێتی و پەیوەندییە بازرگانیی و دەسكەوتە پیشەسازییەكانە، بەڵام لەوسەردەمەدا هێشتا بەمانای شاری نوێ، سلێمانی نەبۆتە شارێكی وەها كە تیایدا هۆش لەپێش سۆزو، زانیاری لەپێش بیروڕاكانەوە بێت، پەیوەندییە بازرگانییەكانیش سنوردارو لاوازبوون بەجۆرێك كە ئەم ڕۆژنامەیە نەیتوانیوە ڕیكلامگەلێكی بازرگانیی دیاری هەبێت، هەرچەندە ئاگانامەو ئاگادارییەكانی زۆربوون، بەڵام لەشێوەی كاروباری یاسایی و حكومیی دەرنەچوون، كۆمەڵگاكەش كۆمەڵگای پیشەسازیی ڕاستەقینە نەبووەو جۆرێك بووە لە كۆمەڵگای كشتوكاڵیی گەشەسەندو كە تیایدا پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان بەپلەی یەكەم بە میدیاوە نەبەستراونەتەوە.

ڕێنمایی و ئامۆژگاریكردن پێویست بوون، چونكە كۆمەڵ لە قۆناغێكی ناسكی ژیانی خۆیدا بووە كە پێویستی بە بیركردنەوەو ڕامان و وەستان و بڕواكردن بەشتەكانی خۆبووە، پەیامنێر و هەواڵدەری تایبەت بەم ڕۆژنامەیە دەگمەن و كەم بوون، گەر هەشبووبن دروستكراوبوون، بۆیە زیندوویێتی لە هەواڵەكاندا كەمدەبینرێت، هەروەك چۆن توانای تۆماركردن و ئامادەبوونی كەسانی ڕۆژنامەكەش لەسەر شوێنی ڕوداوەكان دەگمەن بوون، زیاتر پشتیان بە گێڕانەوەی ئەوكەسانە بەستووە كە ڕوداوێكیان گێڕاوەتەوە، زانیاری و داتا لە بابەتەكاندا كەمن چونكە سەرچاوە، یان نەبوون، چ گەر هەشبووبن لای خەڵك زۆر بەهادار نەبوون.

بەدرێژایی ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیە بابەتی زیندوو دەبینرێن، چ وەك فۆڕم و چ وەك ناوەڕۆك، دەرك بە گەشەی زمانی کوردی دەکرێت کە چۆن هەوڵدەدات خۆی لەزمانی ڕۆژنامەو سەردەمەکانی پێش خۆی جیابکاتەوەو بە زمانێکی سادەوساکار لەگەڵ خوێنەری سەردەمەکەی خۆیدا بدوێت.
ئەگەر "ژیان" لەسەرەتاوە دوودڵ بووبێت لەوەی ئەرکی یەکەمی گەیاندنی تێزە ئەدەبییەکانە بەشێوەیەکی ڕۆژنامەنوسییانە، ئەوا لە کۆتاییەکانی "ژین" دا بەتەواوی ئەمە دەچەسپێت و پانتاییەکانی ڕۆژنامەکە زیاتر بۆ ئەدەب و هونەر تەرخان دەکرێن، تا ئەوەی ناسنامەی ڕۆژنامەکە دەبێتە (ڕۆژنامەیەکی ئەدەبی و فنی یە) بڕوانە: ژمارە ٥٣٩.
ئەم چەشن و جۆرو هونەرانەی لێرەدا دیاریکراون تەنها بۆ هەریەکەیان نموونەیەك یان دووان هێنراونەتەوە، بەڵام ڕۆژنامەکەو ژمارەکانی ڕۆژانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم هونەرانەدا کردووە هەرچەندە هونەری وەهاش هەبووە کە بۆ تەنها جارێك لەتەمەنی "ژیان و ژین" دا بڵاوکراوەتەوە.

## ٤/١-٢) چەشن و جۆرو هونەرە بەکارهاتووەکانی ئەدەب لە "ژیان و ژین" دا:

چەشنەکانی ئەدەب پانتاییەکی گەورەو فراوانی ئەم ڕۆژنامەیە داگیردەکەن، "ژیان و ژین" خزمەتێکی گەورە بەئەدەبیی کوردی پێشکەشدەکەن و ئەو بڵندگۆیەن کەلێیانەوە دەنگی ئەدیب و بەهرەمەندو نووسەرانی کورد دەگاتە خەڵك، هەر لەرێی ئەم ڕۆژنامانەوە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیی بڵاودەبێتەوەو شیعری چەندان ساڵەی شاعیرانی کورد چ لە ڕۆژنامەکەدا چ وەك دیوانی چاپکراو بە چاپخانەکەی پیرەمێرد دەکەونە بەردیدەی خوێنەران، ڕۆژنامەکە بایەخێکی گەورە بەبەرهەمی شاعیرو نووسەرانی ئەزمونگەرو بە بەهرەی لاوانیش دەدات، لەلایەکی تریشەوە گرنگیی بە وەرگێڕان و ئەدەبی بەراوردکاریی و ڕەخنەی ئەدەبیی و مێژووی ئەدەبییش دەدات، زمانی ئەدەب زمانی زاڵ و زمانحاڵی ئەم ڕۆژنامەیەیە کە تەنانەت هەژموونیی زمانی ئەدەبیی بەسەر چەشنە ڕۆژنامەنوسییەکان و تا بە ئاگادارییەکانیشدا دەگات زاڵە، وەك لە پاری دووەمی ئەم بەشەدا لێیدەدوێین.

پیرەمێرد هەوڵی داوە ڕوداوەکانی ڕۆژ بەرێتە کایە شیعرییەکانەوەو هونەرمەندانە لەپەندی پێشینانەکانیدا ڕەنگیان پێ بداتەوە، واتە لەلایەك پەندی کوردیی کە بەشێکە لەپەخشانی کوردی دەگوێزێتەوە بۆ خانەی شیعرو لەلایەکی تریشەوە مێژوو ئێستای ئەو سەردەمە بەیەکەوە وەك هەنووکەیی ناوەڕۆکەکانیان بڵاودەکاتەوە.

لەلایەکی ترەوە پیرەمێرد لە "ژیان و ژین" دا هەوڵی داوە بایەخێکی زیاتر لەشیعر بە پەخشان بدات، بەڵام دواجار وەرگری ئەوکاتەی کورد بەپلەی یەکەم وابەستەی دەقە شیعرییەکان بووە زیاتر وەك لە پەخشان بۆیە بەئاستی پێویست نەتوانراوە ئەو ئامانجە بەرجەستە بکرێت، پیرەمێرد دەنووسێ: ((ئێمە گفتوگۆی پەخشانمان لەوانەی هۆنراوە لا شیرینترە، لەبەرئەوە شیعرەکانمان خستە دواوە))[٧٥٧].

---

[757] بڕوانە: ژیان ( ١٩٣٢: ژ٣٢٨: ٤).

شیعری چەندین شاعیری کلاسیکی کورد، یان شاعیرانی پێش سەردەمی "ژیان و ژین" لە ڕۆژنامەکەدا بڵاوکراونەتەوە، تەنانەت زۆرجار ئەو شیعرانە بۆ یەکەمجار لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاوکراونەتەوەو لەدیوانەکانیشیاندا نەبوون وەك بەشێك لە شیعرەکانی "سالم".

لەو شاعیرانەی بەشیعرەکانیان ئامادەییان لە "ژیان و ژین" دا هەیەو بۆ سەردەمی پێش ڕۆژنامەکە دەگەڕێنەوە، بریتین لە (ئەحمەد حەمدی بەگ، مەولەوی، وەلی دێوانە، مەلانا خالید، بێسارانی، سالم، مەلای جزیری، وەفایی، حەریق، کۆماسی، حاجی قادری کۆیی، نالی، تایەر بەگ، مەحوی، شێخ ڕەزا، ناطق، مستەفا بەگی کوردی،...تاد)[758].

کەواتە "ژیان و ژین" دیوانێکی هەمەڕەنگی بەنرخی ئەدەبیی کوردیی و پارێزەرێکی دیاری سامانی ئەدەبیی نەتەوەییمان بووە.

شاعیرانی سەردەمی "ژیان و ژین" یان ڕێبەرانی شیعری نوێی کوردیی لەم ڕۆژنامەیەوە دەرکەوتوون و ڕۆژنامەکە بۆتە سەکۆیەکی دیاری نوێگەریی لە ئەدەبیی کوردیدا، بۆیە هەموو نووسەرانی ئەزمونگەریی ئەمڕۆو گەنجی ئەدەبی کوردیی ئێستامان، لەم ڕۆژنامانەوە بەرهەمەکانیان پەخشکراوەو "ژیان و ژین" بوونەتەوە زمانحاڵێکی ڕاستگۆی بەرهەمە ئەدەبیی و فیکریی و ڕەخنەییەکانیان، ئەمانەی خوارەوە نموونەی ئەو ئەدیب و ڕۆشنبیرانەن کە بە بەرهەمەکانیان بەشدارییان لەم ڕۆژنامەیەدا کردووە: (گۆران، سیاپۆش: ئیبراهیم ئەحمەد، عەلی عارف ئاغا، حەمەخان ئەحمەد، فایەق بێکەس، أ. ع. خەیات، فرامرز: نەجیب ڕەشید، شێخ سەلام، شاکر فەتاح، هیجری دەدە، أ. ب. هەوری، ئەحمەد عەزیز ئاغا، زێوەر، موفتی پێنجوێنی، سەعید ناکام، بێوەی، ڕەفیق حیلمی، محەمەد ڕەمزی قەزاز، قانع، ڕەشید صدقی، شێخ نوری شێخ ساڵح، عەبدوڵا جەوهەر، عەونی، عەبدولواحید نوری، عەلی کەمال باپیر ئاغا، ڕەفیق چالاك، شێخ محەمەدی

---

[758] بڕوانە: ژمارەکانی ژیان (٣٦٠، ٣٦٢،٤٨٠، ٥٤١، ٥٤٢)، ژمارەکانی ژین (٥٥٥، ٥٧٦، ٥٧٨، ٦٦٩، ٦٧٢، ٧٣٨، ٧٤٣، ٨٠٦، ٨٢١، ٨٣٨).

خاڵ، زاری: عبدالرحمان فەقێ، ئەحمەد هەردی، تۆفیق وەهبی، ع. مەدهۆش، مەلا محەمەدی چروستانی، ئەمین زەکی بەگ، صالح قەفتان، مەعروف جیاوك، شێخ نوری بابا عەلی)[٧٥٩].

تا ئەوەی دەیان نووسەری تری هێناوەتە نووسین و لەم بارەیەوە بەنگینەی شاعیر ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو لەژێر ناونیشانی "بزواندنی توانستی شاعیراندا بۆ ژینی بەتین" بابەتێك بەو ئاڕاستەیە بڵاودەكاتەوە[٧٦٠].

ئەدەبی لاوان یان بایەخدان بەگەنجان بۆ نووسین و هاتنە مەیدانی نووسینەوە بەخششێكی تری ژیان و ژینە، قەڵەمە نوێكان لێرەوە دەركەوتوون و ڕۆژنامەكە زیاتر لەهەر ئاستێكی تری كۆمەڵ خۆی بەڕۆژنامەی گەنجان زانیوە، پیرەمێرد دەنوسێت: ((ماڵی لاوان ئاوابێ، لە مەودوا هەرچی دەوڵەمەندە غەزەتەی بۆ نانێرین!.. ڕۆژێكمان ئەبێ ئەمە لە سەرگوزشتەی میللی دا بەیاد بكەین))[٧٦١]، لەگەڵ ئامادەیی ئەم هەموو ناوانەی لێرەدا وەك قەڵەمی گەنج یان لاوی كورد ئاماژەیان پێ دەكەین كەلە ڕۆژنامەكەدا هەن، بەڵام بەشێك لەم ناوانە بۆ كەسێكی دیاریكراو ناگەڕێنەوە، بەشێكیان وەك ناوی خوازراو وان و بەشێكیشیان بۆ دەرخستنی ئامادەیی گەنجانە تا گەنجی تری لێوە هانبدەن، نووسراون[٧٦٢]، ئەمانەش نمونەی چەند گەنجێكن كە لەم ڕۆژنامەیەدا بەبەرهەمی ئەدەبیی بەشداربوون: ( نجم الدینی نەوەی حاجی مەلا ڕەسول، پەروێز، جەلال قادر، ئەبوبەكر شێخ جەلال، ئەحمەد شەفیق، بەنگینە، حەسەن فەهمی، ئەنوەر ئەحمەد،

---

[759] بڕوانە: ژمارەكانی ژیان (٣٢١، ٣٢٨، ٣٣١، ٣٣٣، ٣٣٤، ٣٤٥، ٣٤٧، ٣٥٠، ٣٦٣، ٤٠٨، ٤٠٩،٤١٠، ٤٧٩، ٥٤٠، ٥٤١، ٥٤٦)، ژمارەكانی ژین (٥٥٥، ٥٥٨، ٥٥٩، ٥٦٢، ٥٦٦، ٥٧٢، ٥٧٧، ٥٨٠، ٥٩٣، ٥٩٥، ٦٠١، ٧٨٩، ٨٢١).

[760] بڕوانە: ژین (١٩٣٩: ژ٥٥٨: ٤).

[761] بڕوانە: ژیان (١٩٣٥: ژ٤٦٢: ١).

[762] بڕوانە: ژین (٥٦٠، ٥٦٢).

م. هۆشەنگ، عوسمان شریف: دانش، س. جەباری، محەمەد سالَح سەعید، ع. ل. بێدەنگ، ئەحمەد جۆلا، عەزیز عەبد، س. م. خامۆش،...تاد)[٧٦٣].

ئەگەر بەراوردێکی خێرای بەشداریی نووسەران بکەین دەبینین ئەوانەی وەك نووسین بەشدارییان لەم ڕۆژنامەیەدا کردووە هەموویان بەپلەی یەکەم ئەدیب بوون و بە بەرهەمی ئەدەبیی بەشدارییان کردووە، یان هەرنەبێ ئەگەر وتارێکی ڕۆژنامەنوسییشیان لە ناوەڕۆکدا نووسیبێ بە دارشتنێکی ئەدەبییانە خستوویانەتەڕوو، ئەمەش پشکی ئەدەبی لە ڕۆژنامەکەدا زۆر زیاتر کردووە.

بەلاّم ئەمە ئەو ڕاستییەش دەسەلمێنێت کە خوێنەران و خەلَکیش لەڕێی ڕایەلَەکانی ئەدەبەوە بەم ڕۆژنامەیەوە بەستراونەتەوەو ئەگەر "ژیان و ژین"یشیان خۆشویستبێت بەپلەی یەکەم لەبەر بەرهەمە ئەدەبییەکانی بوون، جگە لەوەی ڕۆژنامەکە مۆلَەتی ڕۆژنامەی سیاسیی پێ نەدراوەو وەك لە ناسنامەکەیدا جەخت دەکات زیاتر ئەدەبیی و هونەریی بووە، بەلاّم پیرەمێرد وەك بەرپرسیارێتییەکی ڕۆژنامەنوسیی، زۆری لەخۆی کردووەو گەر بەشێوازی ئەدەبیانەش بووبێت کەم تا زۆر، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەتێزە سیاسیی و نەتەوەیی و نیشتمانییەکان دواوە، دوانێك کە زیاتر لەگەلّ خواستی ڕاستەقینەی خەلَکی کوردی ئەو سەردەمەدا هاتۆتەوە، بۆیە دواجار ڕۆژنامەکە گوزارشتێکی ڕاستەقینە بووە لە ڕۆژگارەکانی خەلَك، بەلاّم پیرەمێرد چ لەبەر بارودۆخ، چ لەبەر دۆستان و دوژمنان، چ لەبەر مۆلَەتی ڕۆژنامەکەو سانسۆری ئینگلیزو حکومەت، وێنای ڕاستەقینەکانی گواستۆتەوە نەك خودی ڕاستییەکان واتە سێبەری ڕاستییەکانی تۆمارکردووەو کەمتر بواری پێ دراوە ڕوداوەکان وەك خۆی بگوێزێتەوە.

لێرەوە چەشن و جۆرو هونەرە بەکارهاتووەکانی ئەدەب لەم ڕۆژنامەیەدا، بریتیی دەبن لە:

---

[763] بڕوانە: ژمارەکانی ژیان (٣٢٢، ٣٥١، ٣٥٧، ٣٧٥، ٤٠٩)، ژمارەکانی ژین (٥٥٥، ٥٦١، ٥٦٥، ٥٦٩، ٥٧٠، ٥٧١، ٥٨٤، ٥٨٥، ٥٩٢).

أ. شیعر:

١. داستانە شیعر:

لەژێرناوی "داستانێکی ژیانی پێشوومان" دا بڵاوکراوەتەوە:

((جاران دە ڕۆژ بە حەج حەچەو بارە بەڕییەوە

گەرماو سەبون و لێزمەو باران و تەڕیەوە...تاد))[٧٦٤].

٢. لیریکی، شانازی کەسیی:

((دیدەم بولبولی باغی نەوبەهار

دەم بە پێکەنین ئەی شیرین گوفتار

بۆ تۆ کەوتەکار پەنجەی ڕۆژگار

مەئیوس لەباڵات خۆش خوڵق و ڕەفتار))[٧٦٥].

٣. لیریکی، شانازیی زانستی:

لەژێرناوی "هەربژی زانست پەروەران- مەدحی زانستی" دا نووسراوە:

((ئەم گرە نورەی کەوا دیارە

زانستی کوردەو جێگەی هەژارە

لازمە هەموو فەخری پێوەکەین

چونکە لەوەحشەت خۆمان دەرئەکەین))[٧٦٦].

٤. لیریکی، ستایش:

---

[764] بڕوانە: ژین (ژ٦٠٤: ٢).

[765] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٢: ٤).

[766] بڕوانە: ژیان (ژ٤٠٩: ٣).

له ستایشی کەسێکی بەناوبانگدا "ژیان" دەقێکی "گۆران" ی شاعیر بەناونیشانی (دەروێش عەبدولا بۆپەری مۆسیقی)دا بلاوکردۆتەوەو ستایشی کەسی دەروێش عەبدولا دەکات:

((بەڕەنگی زەردو ناڵەی دڵ توێنەر تا برای دەروێش
حەزم کرد بەستەیەك ببیەم سەراسەر شین و ماتەم بیّ
لەناو کوڕەی گرۆهێکی نەزانا قەدری سەنعەتکار
وەکو مانگە کە نانوێنیّ لەناو حەوزێکی لیخندا
...تاد))[767].

٥. لیریکی، داشۆرین:

موفتی پێنجوێنی دەنوسێت:

(( بە ئەمری سوبحان ڕۆژیّ لە ڕۆژان
دەروێشێکم دی مل هور و گویّ پان
خوی وتن دروست ئەعزای بیّ نوقسان
ئەگەڕا بۆ سواڵ دوکان بە دوکان))[768].

٦. لیریکی، دڵداریی:

وەلی دێوانە، دەڵێت:

((مانگی ڕەشمالان
شۆخی شیرین شەوق مانگی ڕەشمالان
شەمی شفا بەخش شادی پەروانان))[769].

---

767 بڕوانە: ژیان (ژ٣٤٠: ٢).

768 بڕوانە: ژیان (ژ٥٤١: ٣).

769 بڕوانە: ژیان (ژ٥٤١: ٢).

٧. ليريكى، وەسفى ژن:

گۆران لەژێر ناونيشانى" لە درزى پەچەوە" دەنوسێت:

((جادە چۆڵ و سێبەر بوو كاتى بەيانى

ئەڕۆيشتم خەيالاْوى ئەمڕوانى

لەپڕ نازانم چۆن سەرم هەڵبڕى

بەرامبەرم بەژنێك دەركەوت وەك پەرى

لەگەڵ ئەوەى لە عاباوە ئالاْبوو

لەديمەنى (شيرينى) ئاشكرا بوو))[٧٧٠].

٨. ليريكى، وەسفى سروشت:

پيرەمێرد لەوەسفى سروشتدا دەنوسێت:

((سبەينىٚ بوو لەخەو هەستام و ڕوانيم بەفرە باريوە

سلێمانى ئەڵێى (بەلقيس) ە، تاراى زيوى پۆشيوە

بەبەرگى سپيەوە چەند شۆخە شاخى گۆيژە بى بينە

لەڕەنگى ئاسمان دلبەرترە ئەم سپيە ئەو شينە))[٧٧١].

٩. ليريكى، شين:

وەك مەبەستێكى ترى شيعرى ليريكى (شين و شيوەن) لە ڕۆژنامەكەدا بلاْوكراوەتەوە، لە "گۆران" بە ناونيشانى (شيوەنى گولاْڵە) ەوە دەڵێت:

((كچم، مايەى حەياتم، يادگارى

شەبابم ! بەرەى شيرينى دارى

غەرامى كەم دەوامى عومرى لاويم

دڵۆپى خوێنى گەرمى ئاگراويم

---

[770] بڕوانە: ژيان (ژ٥٤١: ٢-٣).

[771] بڕوانە: ژيان (ژ٥٤٨: ١).

چ زوو مردی، کچم، هەیهات کچی خۆم
چ زوو مردی، چ زوو کەوتیتە بن گۆم...))[٧٧٢] .

١٠. لیریکی، لاواندنەوە:

چەند شیعرێکی لاواندنەوە بڵاوکراونەتەوە، وەك دەروازەیەك بۆ گفتوگۆکردنێکی ویژدانیانەی سۆزدارییانەی شاعیر بەرامبەر بە ڕوداوو کات و کەسەکان، لەژێر ناونیشانی (لەگەڵ مانگدا سکاڵا) کە لەلایەن (فایەق بێکەس) ەوە نووسراوە، شێوەیەکی ئەم جۆرەمان دەخاتە بەردەست :

((ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین
هەردوو گرفتار یك ئاهی سەردین
تۆ وێڵ و ڕەنگ زەرد بە عاسمانەوە
منیش دەربەدەر بە شارانەوە))[٧٧٣] .

١١. لیریکی، مەینۆشی:

پەنابردنە بەر دواندنی مەیی و کەرەستەکانی مەی نۆشی و مەیخانەو مەیگێڕو...هتد، کەرەستەگەلێکن کە زۆرجار شاعیران بە میتافۆڕێکی سۆفیگەرییانە بێت، یاخود بۆ گوزارشتکردن بێت لە نائومێدیی و غەمبارییان بەکاریان بردووە، ئەم شیعرەی خوارەوە نموونەیەکە لەشێوەی دووەمیان کەلە لەژێر ناوی "ڕازی دەرونی خەسرەو لە یاری ئەمشەودا" بڵاوبۆتەوە:

((دەورەی ڕۆژگار گەروشی بادا
با، بەبادە، غەم بدەین بە بادا
کە غەم دەم خاتە خاڵی بێهۆشی
ناچار دەست ئەکەم بە بادەنۆشی
دەستگیرم بکە ئەی بادەی شەوگەرد
بە بەیان یار لەدڵ دەرکە دەرد ))[٧٧٤] .

---

[772] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٩: ١) .

[773] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٧: ٢) .

١٢. ليريكى، نيشتمانى:

ج. هيوا، لەم جۆرە شيعرەدا بەناوى"نيشتمان"ەوە دەنوسێت:

((نازدارى بەناز تۆ نيشتمانى

كوا بەزمو ئاهەنگ گوا شادمانى!

نازدارى بەناز جەرگو هەناوى

كوا خۆشى و سەيرت بۆچ پەشۆكاوى))[٧٧٥].

١٣. ليريكى، سياسى:

لەژێرناوى "چيرۆكى هەڵبەستراو" دا نووسراوە:

((هارونە ڕەشيد ڕۆژێ دڵگير بوو

ئەو ڕۆژە ڕۆژى مەرگى لەبيربوو

ئەوەى كە خێرى بۆ وەتەن نييە

بەچى دەى زانى كە دوژمن نييە))[٧٧٦].

١٤. ليريكى، كۆمەڵايەتى:

ئەم شيعرەى خوارەوە كە لەژێر ناونيشانى "خەياڵى ژێر لێفە"دا لەلايەن فايەق بێكەسەوە نووسراوە، يەكێكە لەو شيعرانەى لەجۆرى شيعرى كۆمەڵايەتى ناو شيعرى ليريكين :

((عيلم و نەزانين بخەرە لاوە

هەر پشتت ببێ ئيشت تەواوە

خزم و خوێش قسەى پيرێژنانە

ڕەفيقى دڵسۆز ئێستە جزدانە

ئەوەى بيەوێ عالم مەمنون كا

---

[774] بڕوانە: ژيان (ژ٣٢٢: ٤).

[775] بڕوانە: ژيان (ژ٥٤١: ٤).

[776] بڕوانە: ژيان (ژ٤١٠: ٣).

ئەبێ هەوڵدا خۆی بە مەیمون کا
داخی هەندێ کەس لە سینەمایە
جاری ڕەنگێکە وەك سینەمایە))[777].

١٥. لیریکی، پەندو ئامۆژگاریی:
یەکێ لە نموونە زۆرەکانی ناو ژیان و ژین شیعری لیریکییە بە تایبەتیش "پەندو ئامۆژگاریی"، ئەم دەقەی خوارەوە یەکێکە لەو نموونانە کە لێیەوە ڕۆژنامەکە دەیەوێت بە شیعر گوزارشتێکی تەواو لە پەندو ئامۆژگاریی و ڕێنموویی کردنی خوێنەرو لەڕێی خوێنەرەوە خوێندکارو خێزان و تاکەکانی کوردیش ڕێبەری بکات.

"بڕۆرە پەی کاری خۆت *"
پیاوێکی دارتاش مەیمونێکی بوو
بۆ هەموو ئیشێ لەگەڵیا ئەچوو
هۆگری بوو بوو، لای هەڵ وەستابوو
مەیمون شاگرد بوو دارتاش وەستا بوو
مەیموون چۆن ئەبێ بە وەستای دارتاش
نابێتە مۆدە سەدارە و کڵاش
ناگاتە پایە مردی نا حساب
نان بۆ نانەواو گۆشتیش بۆ قەساب)) [778]

١٦. لیریکی، ئاییینی:
((تەنها خوایەکەی زەوی و ئاسمان
لە هەموو شوێنێ پەیدایت و پەنهان

---

[777] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٤: ٣).

* لە بەرگی یەکەمی دیوانی پیرەمێرد، دەربارەی ئەم شیعرە نووسراوە لە "ژیان" ی ژمارە: ٥٣٨ ی ساڵی ١٩٣٧ دا بە ناونیشانی "کۆنەپۆشی" یەوە بڵاوکراوەتەوە ،بڕوانە (دیوانی پیرەمێرد:ب١: ١٩٩٠: ٤٠٥)، بەڵام ئەم شیعرە بەم ناونیشانەی سەرەوە لە لاپەڕەی دووی ژمارە (٣٢١) دا بەر لە ژمارە (٥٣٨) بڵاوکراوەتەوە.

[778] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢١: ٢).

له بەندە گیرا بەوە سەربەرزم
کەلە دیوانی تۆدا ئەلەرزم))[779].

١٧. دراماى تراژیدی:

دراما دواى گەشەى خۆى لەشیعری درامییەوە بۆ چیرۆك و دەق گۆڕا، لەژێر ناونیشانی "وێنەی سەرگوزشتە بە کوردی پەتی" دا، ژیان نموونەیەکی لەم جۆرە دەخاتە ڕوو.

((لەو شارە گەورانە کەوا پایتەختی دەوڵەتە ناودارەکانە (وێنەی سەرگوزشتە) کە دراماى پیٚ دەڵێن بە ئامۆژگارییەکی باشی ئەزانن و گەورە و بچوك پەندی لیٚ وەردەگرن، ئێمەش سەرگوزشتەیەکمان بەکوردی پەتی ڕێك خستووە بۆ ئەمەی چاو لەکردەوەی پەسەند بکەین و لەخوی خراپ خۆمان بپارێزین))[780]، ئەم دەقە لە قوتابخانەکانی کوڕان و کچانیشدا لەودەمەدا لە شێوەکانی نمایشێکی درامییدا پیشاندراون.

١٨. شیعری ساتیری:

(( گاڵتەی بەڕاست
خزر پیاو، حەسەن ئەفەندی
کەس پێی نەدەگوت کەرت بە چەندی
پێنج کەری ئەبرد بۆدێی کەلەکن
کە لەسەرخەرمان کای بۆ دابگرن
لەڕیٚ خۆی سواری کەرێکیان بوو
کە ئەی ژماردن هەر چواریان مابوو))[781].

---

779 بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٤: ٣) .
780 بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٢: ٢) .
781 بڕوانە: ژین (ژ٥٥٥: ٢) .

١٩. شیعری کاریکاتۆری:

(( دیمەنێکی "مەلا قانع"

بیستبووم قانع هەیە شاعیرە

فیلە شوفێکە زاناو ماهیرە

ڕوانیم زەلامێك زەبەلاح و بەرز

چڵکن خوارو خێچ وەك سێوی بن ئەرز))[782].

٢٠. چیرۆکە شیعر:

زۆرجار لەم ڕۆژنامەیەدا چیرۆك و گێڕانەوەگەری بەشێوەی شیعر داڕێژراون، ئەمە لەلایەك بەهرەمەندیی نووسەرەکانیان دەردەخات، لەلایەك ئەوە دسەلمێنێ کە هێشتا خواستی کۆمەڵایەتی خەڵك چێژوەرگرتن و سەلیقەکانی لەچێوەی شیعردا ماون و نەیانتوانیوە قۆناغی بیرکردنەوەو دەربڕینی شیعرییان تێپەڕێنن، بۆیە وەك ئاسانکاریکردنێك بۆ گەیاندنی مەبەست لەم فۆڕمەدا داڕێژراون.

وەك ئەم نموونەیەی لە لەژێر ناونیشانی "سەرگوزشتەی پیرێ ژنان بۆ منالی گوێ ئاگردان"دا بلاوکراوەتەوە:

((پورە تلێخان بزنێکی بوو

سبەینان بۆ بێرە دەچوو

کیتەڵەی ئەبرد ئەی دۆشی

لە ماڵەوە دای ئەپۆشی...تاد))[783].

---

[782] بڕوانە: ژین (ژ٦٥٧: ٢).

[783] بڕوانە: ژیان (ژ٣٦٠: ٢).

٢١. نامەی شیعریی:

نامەی شاعیرێکە بۆ کەسێکی تر یان بۆ شاعیرێکی تر، لە ژمارە ٤٣٢ دا نامەیەکی مەولەوی بۆ مەحمود پاشا بڵاوکراوەتەوە، کە لەژێر ناوی "نامەی مەولەوی بۆ مەحمود پاشا کە لە بەغدا بووە" نووسراوە:

((شەپۆلی دجلەی غەم کەف دەچێنێ

گێژەی خوێنی دڵ هەر جۆش ئەسێنێ

ئەو، دەشتی بەغدای بەلافاو تەنگ کرد

ئەم، ڕوی کەربەلای بە خوێن گوڵ ڕەنگ کرد...تاد))[٧٨٤].

٢٢. فۆلکلۆریی، پەندی پێشینان:

پەندی پێشینان بەشێکی دیارو هونەرێکی بەرجەستەی ژیان و ژینن، ئەمانە کە بە پەندەکانی پیرەمێرد ناسراون لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەیان بۆ پەندی کوردیی کلتوری نەتەوەیی و فۆلکلۆریی میللەتەکە دەگەڕێتەوە بەڵام پیرەمێرد لێزانانە بەپێی ئەو ژمارەیەی پەندەکانی بەشیعر دابەزاندووە گونجاندوویەتی لەگەڵ بارودۆخی ئەو ڕۆژەدا یان ئەو ماوەیەدا، یەکەم زنجیرە پەندەکانی پیرەمێرد "پەندی پێشینان" لە ژمارە ٣٢٣ ی ژیاندا بڵاوکراوەتەوەو تا ژمارە "١٠١٥ ی ژین" بەردەوام بووە، لەگەڵ ئەوەی هەندێك ژمارە ئەم بەندانەی تیانەبووەو کۆی پەندەکانی پیرەمێرد دەگاتە (٦٤٤٨) پەند*.

---

784 بڕوانە: ژیان (ژ ٤٣٢: ١).

* لەیادی پیرەمێردەکەی عەلادین سەجادیدا لەلاپەڕە (١٨) دا بە هەڵە نووسراوە لە ژمارە (٣٢٤) ی ژیانەوە تا ئاخر ژمارەی ژین پەندەکانی بڵاوکردۆتەوە، و لەلاپەڕە ٤٥ ی بەرگی یەکەمی دیوانەکەشیدا هەمان هەڵە دووبارە کراوەتەوەو ڕاستەکەی ژمارە (٣٢٣) یەو ئەو پەندانەشن کە لەسەرەوە بڵاوکراونەتەوە.

پەندەکانی پیرەمێرد کاکەی فەلاح لە سەرەتای حەفتاکاندا لە چوار بەرگی قەوارە بچوکدا بڵاویکردونەتەوە، دواتریش لەسێ بەرگی قەبارە گەورەدا لەلایەن (فایەق هۆشیار، مصطفی صالح کریم، محمود احمد محمد، محمد نوری توفیق، احمد زرنگ) ەوە لەساڵی ١٩٩٥ دا بڵاوکراونەتەوە.

(( لەدووی سیاسەت خۆت مەخەرە بەند
ڕێوی قەواڵەی پێ بوو، پێستیان کەند
تخون بە پیاوی سەرچەوت مەکەوە
بە دەست قەرز بدەو بە پێ دوی کەوە
دوو گوێ و زبانێ دراوە بە تۆ
دوو ببیستە و یەکێ بڵێ لەسەرخۆ ))[785].

٢٣. شیعری کلاسیکی:
چەند شێوەیەکی شیعری کلاسیکی بڵاوکراونەتەوە، بۆ نموونە غەزەلێکی مەحوی بڵاوکراوەتەوە، تیایدا هاتووە:
(( ئەرێ دڵ، بێ شەرابی لەعلی گوڵڕەنگت کە گوڵ چیبکا
کە حلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ بلبل لە چڵ چیبکا))[786].

٢٤. شیعری نوێ:
"ژیان و ژین" سەکۆی دەرکەوتنی دەنگ و ڕەنگە نوێکان بوون شیعری نوێ لە "ژیان" ەوە دەردەکەوێت و بڵاودەکرێتەوە، گۆرانی شاعیر هەوڵە شیعرییەکانی خۆی لەژیاندا بڵاودەکردەوە هەربۆیە نموونەیەکی دیاری ئەم نوێگەرییەش دەکەینە نموونە بۆ ئەوانی تر.
لە سەمای بەرزی ناوبانگی حوسنا
تاقە ستارە
نەبوی لەوزەی دەستی کورتی من
ئاشکراو دیارە..

---

[785] بڕوانە: ژیان (ژ ٣٢٣: ٢) .

[786] بڕوانە: ژین (ژ ٧٤٤: ١). نموونەی چوار خشتەکی (ژ٥٦٠: ٣)، پێنج خشتەکی(ژ ٥٧٢: ٣)، تەرجیع بەند (ژ٨٣٨: ٣)، تەخمیسی غەزەل (ژ٩١٩: ٢).

کەچی نەیشت هێشت بێت لەسەر سینەت
بنیشێتەوە،
لات برد لەڕێگای هەوای موحیبەت،
دورت خستەوە...))[٧٨٧] .

٢٥. وەرگێڕان:

ڕۆژنامەکە هەوڵی داوە دەقی عەرەبی، فارسی، تورکی، فەرەنسی، ئینگلیزی، بۆ زمانی کوردی وەربگێڕێت، نموونەی ئەمانە دەقێکی وەرگێڕدراوە لە ئینگلیزییەوە کە لەلایەن "گۆران" ی شاعیرەوە وەرگێڕدراوەو بڵاوکراوەتەوەو لەژێریدا نووسراوە "تەرجەمەی هەڵبەستێکی ئینگلیزی":

((گۆڕاوم وێنەی جاران نەماوم
بینایی چاوم
عەشقت لەدڵما داو دووره
بێ تین و تاوم...))[٧٨٨] .

٢٦. شیعری مناڵان:

(("میو میو...میو میو" ورد ورد ڕاکە
پشە خرپنەی دەسولوت پاکە...))[٧٨٩] .

٢٧. گۆڕین:

هەرچەندە واباوە زۆرێك لەو دەقە شیعرییانەی لەبەشە زارێکەوە بۆ بەشەزارێکی تر دەگۆڕێن ئاسان نەبێت لە فۆڕمی خۆیاندا وەکو شیعرو بە تایبەتمەندیی شیعریی خۆیانەوە بگۆڕێن، بەڵام پیرەمێرد هونەرمەندانە بەشێکی زۆری

---

787 بڕوانە: ژیان (ژ ٣٢١: ٣) .

788 بڕوانە: ژیان (ژ ٤١٢: ٣) .

789 بڕوانە: ژین (ژ ٥٥٦: ١) .

شیعرەکانی مەولەوی و بێسارانی  لە (هەورامییەوە) گۆڕیوەتە سەر شێوەزاری (سلێمانی) ئەمەی خوارەوە نموونەیەکە لەو چەندان نموونە زیندووانەی لە ژیان و ژیندا هەن و لەژێر ناونیشانی "ڕۆحی مەولەوی" دا بڵاویکردونەتەوە:

((هەر بیری بەختی ڕەشی خۆم ئەکرد

ئەموت: بۆچ منی وا بەم دەردە برد

هەرچی دەی بینم وا لە بەزمایە

دەستی لە سینەی گەرم و نەرمایە...تاد))[790].

ب. پەخشان:

١. پەخشانی سەروادار:

چەند پەخشانێکی سەروادار لە ژیان و ژیندا دەبینرێن کە بەشی زۆریان مامۆستا برایم ئەحمەدو پیرەمێرد خۆی نووسیویانن، ئەمەی خوارەوە نموونەیەکە لەو پەخشانە سەروادارانەی بەناوی (سیاپۆش) هەوەو لەژێر ناونیشانی (بەیانە، بەیانە)دا بڵاوکراوەتەوە:

((بەیانیان لەجریوە جریوەی چۆلەکە پاساری، لە ئاوازی دڵنەوازی بولبول، لەخەو ڕاست ئەبینەوە، دڵمان ئەکرێتەوە، گزنگیٚ ئەدا لەڕوی دەریا ئەو ڕەنگە شینە دەکا بەزریفتەلای ئەیدا لە گەلای درەختان ئەبوژێنەوە، ئەدرەوشێنەوە و ئەلەرێنەوە، بەری بەیان لێ خواپەرستانی بە سروشتی ئاسمان ڕون ئەبێتەوە، دەرگای دڵنەوایی ئەکرێتەوە، زۆر کەس لەخوا ئەپارێتەوە، باڵندە بەزبانی خۆی ئەلاڵێتەوە...تاد))[791].

---

[790] بڕوانە: ژیان (ژ ٣٦٢: ٢).

[791] بڕوانە: ژیان (ژ ٣٣٠: ٣).

٢. پەخشانی هونەریی:

لەژێرناوی "تاسەی لێوی ئاڵ" دا نووسراوە:

((ئەی یار:

هەستیم جۆش ئەدا...ڕۆحم لێوان لێوە...بە دڵۆپێکی تر، لە تەوقی سەرمەوە سەر ڕیزئەکا...تاد))[٧٩٢].

٣. شیعری بە پەخشان نووسراو:

"شیعری پەخشان"

((هەر ساڵێ کەوا دەورودەشت بە گوڵ و گیا ئەڕازێتەوە، بەبای شەماڵ ئەشنێتەوە، دڵی منیش سەوز ئەبێتەوە...تاد))[٧٩٣].

٤. ئەدەبیی جیهانیی:

"ئەدیبە شاژنەکانی ئەوروپای تازە"

((لەوەتەی ئەوروپا دەستی بە وریابونەوە کردووە، ئافرەتەکانی لە کۆڕی ژیاندا خۆیان دەرخست))[٧٩٤].

٥. ئەدەبیاتی نوێ:

بۆ سەلام بە قەڵەمی (ع.و.نوری)، "ئەدەبیاتی تازە و ئینسانیات" ((جوان بیر بکەینەوە لەژیان، ئیمڕۆو ژیانی ٥٠ ساڵ لەمەوپێش فەرقێکی بێ اندازەی کردووە..))[٧٩٥]،

---

[792] بڕوانە: ژیان (ژ ٤١٠: ٢).

[793] بڕوانە: ژیان (ژ ٥٥٢: ٣).

[794] بڕوانە: ژین (ژ ٥٦٤: ٣).

[795] بڕوانە: ژین (ژ ٥٧٠: ٢).

٦. ئەدەبیات:

(( "ئەو چەند شیعرەی خەیام لە موستەشریقەکانی ئەڵمان" پرۆفەسور karlisussheim ئەڵێ تا تەئریخی ١٩١٣ تەنها بە زمانی ئینگلیزی ١٢٠ تەرجومەی مەتبوعی هەیە...تاد))[٧٩٦].

٧. مێژووی ئەدەب:

(("ئەدەبیاتی ئێران"، دوای ئەوە میرزا فیض الله ی مؤرخ خاوەنی تەئریخی موعجەم ئەڵێ ئەوەل شیعرێ کەلە جیهاندا بێژراوە بهرا وەگوڕوبۆیە کە بەربانی پەهلەوی وتویە کە شێوەی کوردییە...تاد))[٧٩٧].

٨. ڕەخنەی ئەدەبیی:

چەند بابەتێکی ڕەخنەی ئەدەبیی لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاوکراونەتەوە هەندێکیان بە وتاری سەربەخۆو هەندێکی تریشیان بە زنجیرە لەسەر باری ئەدەبیی کوردی و ئەدیبی کوردو دەقی ئەدەبیی دواون، ئەمەی خوارەوە نموونەی یەکێك لەو ڕەخنە ئەدەبییانەیە کە بە زنجیرە لەژێرناوی (ئەدەبیاتی کوردی) دا لەلایەن سیاپۆش( ئیبراهیم ئەحمەد)ەوە نووسراوەو بڵاوکراوەتەوەو لەم بەشەدا کە بەشی یەکەمە لە (شاعرەکانمان) دەدوێ، تیایدا هاتووە:

((شاعیرەکانمان هەتا ئێستا بڕواناکەم لە کەلیمەی مەدح و ستایش زیاتریان بیستبێ، یەکێ بەتوتی شەکر گفتار و ئەویتر بە بولبول شیرین کەلام ناویان لێ ناون....تاد))[٧٩٨].

---

[796] بڕوانە: ژین (ژ ٥٧٣: ١).

[797] بڕوانە: ژین (ژ ٦٨٣: ٣).

[798] بڕوانە: ژیان (ژ ٣٣٥: ١).

٩. ئەدەبی بەراوردکاریی:

ئەگەرچی پێش پیرەمێرد چەند هەوڵێکی دیاریکراو بۆ نووسینی ئەدەبی بەراوردکاریی بەزمانی کوردیی دراون[799]، بەڵام پیرەمێرد لە لاپەڕە (٥)ی ژمارە (٤٦٣)ی ژیانداو لەژێر ناونیشانی (بەراوردی ئەدەبیات) دا هەنگاوێکی دیاری هەڵهێناوەو کورتەباسێکی ئەم بەراوردە دەکات و شیعرێکی عەرەبیی و کوردیی و تورکیی و فارسیی بەراورد دەکات.

((تائێستا کردومانە بەمۆدە ئاساری ئەدەبی عەرەبی تەرجومە دەکەین، وابلێین کوردو تورك بە نسبتی عربەوە ئەدەبمان کەم بووە، ئەی چی لە عەرەبەکان دەکەی کەلە جاهیلیەتەوە ئاساری شیعریان کزبووە !...تاد))[800].

١٠. چیرۆك:

پیرەمێرد بۆخۆی لەم ڕۆژنامەیەدا چیرۆکەکانی (مەم و زین و دوانزە سوارەی مەریوان) ی بە زنجیرە بڵاوکردۆتەوە، ئەم نمونەیەی خوارەوە بەشی یەکەمی (مەم و زین)ە، کەلە لاپەڕە یەکی ژمارە ٣٣٠ دا بڵاوکراوەتەوە، نموونەیە بۆ ئامادەیی هونەری چیرۆك لە ڕۆژنامەکەدا و بەناوی (نقابداری بەرك سپی)ەوە نوسیویەتی:

((''مەم'' ڕەنگ زەرد، دڵ بریندار، نا هێمن و لەگیان بێزار بەسەر تەلارەکەدا بێ ئیختیار دەهات و دەچوو، باری عەشق، ئەو قەدو باڵای مردانەی چەماندبووەوە....تاد))[801].

١١. چیرۆك لەسەرزاری گیاندارانەوە:

((لە تیپی جانەوەراندا ڕێوییەك هەیە (قرە قولاق- گوێی ڕەش)ی پێ ئەڵێن، پێشخدمەتی شێرە، ڕۆژێ شێری هەڵ فریواند وتی بابچین بۆ حەج...تاد))[802].

---

[799] بڕوانە : ئومێد ئاشنا (٢٠٠١: ٦٩).

[800] بڕوانە: ژیان (ژ ٤٦٣: ٥) .

[801] بڕوانە: ژیان (ژ ٣٣٠: ١) .

[802] بڕوانە: ژین (ژ ٥٥٦: ٢) .

١٢. چیرۆکی گاڵتەجاڕی:
((مەلایەك و خەیاتێك و دارتاشێك ئەکەوتنە ڕێ، بۆ سەفەر ئەچوون، ماکەرێکیان پێ بوو، کتێبی مەلاو داری دارتاش و کوڕوکوتاڵی خەیاتیان لێ بار کردبوو...تاد))[٨٠٣].

١٣. چیرۆکی پۆلیسی:
لە ئینگلیزییەوە کراوە بەکوردی، بە قەڵەمی ڕەمزی قەزاز:
(( "دڵداریی لۆزان و فیرس"
"ئەو جەریمە دڵدارییەی کە عالەمی ئەوروپای هێنایە لەرزە"
یەك مانگ لەمەوپێش لە انگلترە لە (لەندەن) جەریمەیەکی دڵداریی وا ڕوی داوە کە تا ئەمڕۆ لە ڕوایەتە دڵدارییە بەناوبانگەکانی پێشووشدا نەبینراوە))[٨٠٤].

١٤. چیرۆکی وەرگێڕدراو:
(( "ژنی بێ کەڵك" لە ماکس فیشەرەوە: ڕۆژێکیان چوومە موحازەرەیەکەوە، لەوێ چاوم بە کچێکی زۆر ئێسك سوك و خوێن گەرم و جوان کەوت، خەریکی شت کڕین بوو...تاد))[٨٠٥].

١٥. کورتە چیرۆك:
بابەتی ئەدەبیی زۆر لەم ڕۆژنامەیەدا دەبینرێنەوە، زۆربەی ئەوانە شیعرن، بەڵام لە بەشێکی تریاندا پەخشان و گێڕانەوەو چیرۆك و کورتەچیرۆکی ناوازە هەن، یەکێك لەدیارترین کورتە چیرۆکەکانی ناو "ژیان" ئەو کورتە چیرۆکەیە کە (سیاپۆش) لەژێر ناونیشانی (شیرین لەسەرە مەرگا)دا نووسیویەتی:

---

[803] بڕوانە: ژین (ژ ٥٥٧: ٢).
[804] بڕوانە: ژین (ژ ٥٦٢: ٤).
[805] بڕوانە: ژین (ژ٥٧٦: ١).

((ڕاکشابوو لەسەرجیٚ، چاوەڕیٚ بو کەی مەرگ دیٚ، پرچیٚکی کاڵی ئاڵۆزاو بە ڕویا پخشان بوو بوو، ئەت وت ئەمەو بەری ڕۆژی گرتووە....تاد))[٨٠٦].

١٦. وتاری ئەدەبیی:

جوانیی نوسین و ئاواز بەخشین بە دەربڕینەکان و یاریکردن بەو واتایانەی وشەکان هەڵیاندەگرن، تایبەتمەندیی دیاری ئەم ڕۆژنامەیەن، خۆ ئەگەر ئەمانەی وتران لە هەندیٚك بابەتدا کەمتر دەربکەون، ئەوا لە بابەتگەلی لەم جۆرەی خوارەوەدا بە ئاشکرا دەردەکەون، بۆیە بابەتیٚکی پەخشانی ئەدەبییان لە قاڵبی وتاریٚکدا پیٚك هیٚناوە، لەژیٚر ناونیشانی (گوڵدەستەی گوڵان) دا پیرەمیٚرد دەنووسیٚت:

(("ژیان" بەهاری گوڵ و گوڵزاری دەوری شاری دەورکردەوەو هاوینی گوڵزاری ناوشار دیٚنیٚتە فەڕ.

گوڵی بەهارە نازك و ئاوارە، بەڵام ئای ناپایە، ئەوە گوڵیٚکم دەویٚ گوڵان بی بینیٚ، شیٚوەو تابینی گوڵان بنویٚنیٚ، هەتاو ڕەنگی هەروا بمیٚنیٚ، ئەو ڕسکە گوڵەم دویٚنیٚ لە (نویٚنە) –معرچ– ی مکتبەی کچاندا دی....تاد))[٨٠٧].

١٧. وتاردان:

ئەو وتە یان وتارانەن کە زارەکییانە لە بۆنەیەکی تایبەتدا خویٚندراونەتەوەو لە ڕۆژنامەکەدا دەقەکەیان بڵاوکراوەتەوە، وەك ئەم نموونەیە کە وتەی "جەعفەر پاشا" یەو لەبەردەم "کۆمەڵەی گەلان" دا پیٚشکەشی کردووە لەژیٚر ناوی "وتەی جەعفەر پاشا لە عصبة الأمم" دا، بڵاوکراوەتەوە:

---

806 بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٨: ٣) .

807 بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٩: ١) .

((دەستورێك كە ئەنجومەنی (بولاندا) دەریان كردووە بە ڕێكەوتنێكی دروست و بێ كەم و كاست لەگەڵ سەرەتای بنچینەیی عوسبەت و لئومەمدا ڕێك ئەكەوێ...تاد))[٨٠٨].

١٨. وەرگێڕانی ئەدەبیی، ڕۆمان:

(( "خدمەتێكی ژیان"

لە ئەستەموڵەوە من دڵبستەی كتێبێكی (ڕۆمان) ڕیوایەتی جالغی بوو بووم، زۆریان لێ كردم كە بی كەم بە كوردی...، وەرم گێڕایە سەر زمانی كوردی...))[٨٠٩].

١٩. ئەفسانە:

(( "هەندێ لە خورافاتی كۆن"

منداڵ بووم شەو بەلای قاوەخانەكاندا ڕائەبوردم لەهەموو گەڕەكێ یەكێك ئەسكەندەرنامەی ئەخوێندەوە...تاد))[٨١٠].

٢٠. قسەی نەستەق:

ڕۆژنامەكە بایەخی داوە بەو وتەو پەندو حیكمەتانەی لەزمانەكانی ترو لای نەتەوەكانی تر باون، یان لە فۆلكلۆری كوردییەوە بۆیان ماوەتەوە، بۆیە لە هەندێ ژمارەدا پتر لە بیست قسەی نەستەقی جیاجیای بڵاوكردۆتەوە، وەك ئەم نموونەیە كە پیرەمێرد بەناوی نەژادی كوڕییەوە لەژێر ناونیشانی (قسەی جوان) دا نووسیویەتی:

((ئافرەت لە دڵداریدا، پیاو لە دۆستیدا غالبن...تاد))[٨١١].

---

[808] بڕوانە: ژیان (ژ٤١٥: ١).

[809] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٨: ٤).

[810] بڕوانە: ژیان (ژ٦٩: ٢).

**هەروەها وتەی ناودارانیش بڵاودەکاتەوە:**

**(( "ئەفکارو حکمیات بۆ کرداری ژیان" ناوی ئەو ئەسەرەیە کە لەلایەن موفەتیشی مەعاریفی فەرانسایی، کازەوە کۆکراوەتەوەو کراوە بە کوردی...))[812].**

**٢١. گاڵتەوگەپ:**

**گاڵتەوگەپ بەشێکی زۆری دەچێتە خانەی ئەدەبی فۆلکلۆرییەوە، بەڵام کاتێك دێتە ڕۆژنامەوە وەك جۆرێکی خۆشیی بەخشین بەخوێنەر تێکەڵ بە هونەرەکانی سەرگەرمکردنیش دەبێت، لەژێر ناوی "گاڵتەوگەپ" دا بابەتێك بڵاوکراوەتەوە، کە وەك نموونە بۆ ئەم جۆرە ئەدەبە وەری دەگرین کە لەچەندین ژمارەی تریشدا بابەتی لەبارەوە نووسراوە:**

**((ئەحمەد پاشای ئاخر حوکمداری سلێمانی، ئێواران لە دورپیانی گۆیژەو هۆمەرە کوێر لەسەر جۆگەی ئاشی خەلیل لەبن توەکانی زوجەدا دادەنیشێ، ئافرەتێ لە هاوڕێی بەجێ ئەمێنێ، بە بەردەمیانا ڕائەکا، ئەویش ئەڵێ: (توند مەڕۆ مەقەستەکەت دەسوێ) ژنەیش نای کاتە نامەردی دەڵێ: (بیش سوێ بەرسمێڵی تۆی پێ دەکرێ) پاشان پێ دەکەنێ و خەڵاتی دەکا....))[813].**

---

[811] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٨: ٢).

[812] بڕوانە: ژیان (ژ٤٠٨: ١).

[813] بڕوانە: ژیان (ژ٤١٥: ٣).

## ٢/٤) ڕەهەندی ڕۆژنامەنوسیی

### ٢/٤-١) چەشنەکانی ڕۆژنامەنوسیی و ژیان و ژین

غەزەتەی* "ژیان و ژین" یان ڕۆژنامەی "ژیان و ژین" وەك ڕۆژنامە خۆی ناساندووە، خولی دەرچوونی هەبووە هەفتانە بڵاوکراوەتەوە، هەرچەندە زۆرجار بەهۆی سەختی بارودۆخ و خراپی چاپخانەو نەبوونی کەرەستەی چاپەوە دەرچوونی دواکەوتووە.

لە "ژیان"دا هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان زیاتر دەردەکەون وەك لە "ژین" دا، هۆکاری ئەمەش بەگشتیی مۆڵەتی ڕۆژنامەکەیە کە لەسەردەمی ژیاندا وابووە کە ((هەموو شتێك ئەنووسیٚ))[٨١٤]، بەڵام دواتر کە مۆڵەتی نویٚ وەردەگریٚ لەژێر فشاری حکومەتدا بە ئاڕاستەی ئەدەب و هونەرو لایەنە کۆمەڵایەتییە گشتییەکاندا دەڕوات و دەبێتە ((ڕۆژنامەیەکی ئەدەبیی و فنی و کۆمەڵایەتی))[٨١٥].

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ڕۆژنامەکە بابەتگەلی زۆری ڕۆژنامەنوسیی بڵاوکردۆتەوە وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەون، بەڵام لەبەشی هەرە زۆریاندا داڕشتنی ئەدەبییانە بەکاردەهێنرێت، ئەوەی جێی سەرنجە بەشی هەرە زۆری ڕۆژنامەکە بەئەدەبو ڕۆژنامەنوسییەوە پیرەمێرد وەك کەس خۆی نووسیونی، ئەگەر لەئەدەبدا بەشداریی دەیان ئەدیب و نووسەر هەبن، ئەوا بۆ هونەرو بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکان چ وەك ڕوماڵکردن، یان نووسین، یان داڕشتنەوە یان وەرگێڕان، یان ئامادەکردن بووبن، کەسی دیارو سەرەکیی و کەسی یەکەم و کۆتایی خودی پیرەمێردە، پیرەمێردیش بۆئەوەی هەواڵە مردووەکان بە زیندوویی

---

* غەزەتە: لە "گازێت" ی ئیتاڵییەوە هاتووە کە ناوی ئەو دراوە ئیتاڵییە بووە کە لەسەدەی پانزەدا بەکاردەهات و هەواڵە بەدەست نووسراوەکانیشیان بەم دراوە دەکڕیی کە وەك هەواڵنامەی بەدەست نووسراو دەفرۆشران و لەناوی ئەو دراوەوە ناونرابوون بە (جازناتات). بڕوانە : هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧: ٤٧).

814 بڕوانە: ژیان (ژ٣٢١: ١) .

815 بڕوانە: ژین (ژ٥٧٩: ١) .

له ڕۆژنامەکەدا بڵاوبکاتەوەو حەزو سەلیقەو چێژی خوێنەری کورد تێربکات و تەریان کاتەوە، زمانێکی ئەدەبیی بەکارهێناوە، زمانێك کە تێیدا پیرەمێرد یان سەرچاوەیە، یان گێڕەرەوەی ڕوداوەکانە یان لێدواندەرە لەسەر ڕوداوو بابەتەکان، واتە بەدەگمەن بابەتێکی ڕۆژنامەنوسیی دەخوێنینەوە کە پیرەمێرد ڕای خۆی لەسەری لەناو بابەتەکەدا تۆمار نەکردبێت، گەر ڕای خۆیشی نەنووسیبێت بەشێوەیەکی وەسفییانەی ئەدەبییانە تۆماری کردوون کە زۆرجار لە خوێندنەوەی هەواڵێکدا خەیاڵمان بۆ خوێندنەوەی پەرەگرافی پەخشانێکی هونەریی دەچێت. دیارە ئەم ستایڵەی پیرەمێرد لە نووسینی ئەدەبیانەی ژانرە ڕۆژنامەنوسییەکاندا لەخۆوە نییەو زیاتر بۆ لایەنێکی واقیعی و بابەتییانەی کۆمەڵایەتیی خوێنەرو خەڵکی کورد لەو سەردەمەدا دەگەڕێتەوە، لەلایەکی تریشەوە بۆ نەبوونی ڕۆژنامەوان و ڕۆژنامەی پێشەنگی هەواڵیی و سەرچاوەکانی وەرگرتنی زانیاریش دەگەڕێتەوە، چونکە کاتێك بمانەوێت نووسەرانی ناو ژیان و ژین بەسەر ئەدەب و ڕۆژنامەگەرییدا دابەش بکەین، ئەوا ئەگەر دوو سێ کەس بکەونە خانەی ڕۆژنامەنوسییەوە، ئەوا تەنها یەك کەس لەوانە دەکەوێتە خانەی ڕۆژنامەوانییەوە کە (پیرەمێرد)ە، بەڵام دەتوانین لیستی نووسەرانی ئەدیب لەڕۆژنامەکەدا ڕێکبخەین وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کردوون.

ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە ئەگەر "ژیانوژین" بەرجەستەبووی ڕەوتی ڕۆژنامەگەریی کوردیی بووبن لە سلێمانی، ئەوا خودی ڕۆژنامەکە گوزارشتکەرە لە زاتێك کە ئەویش پیرەمێردە، واتە دواجار دەزگای نێرەر یان پەیامی نێردراو بریتی دەبێت لەزەینی تاکە کەسێك کە پیرەمێردە و کەسی تر و هەر ئەویشە بە ئەزمونی خۆی ئەو هەموو نووسەرە داهێنەرو خاوەن بەرهەمانەی کورد چ بە بەرهەمی خۆیان یان بە گۆڕین و وەرگێڕان ڕادەکێشێتە ناو ڕۆژنامەکەیەوە، کە دەشێ ئەمە بۆ یەکەمجار بێت ڕۆژنامەیەکی کوردیی لەمێژووی خۆیەوە تا ئێستا دەربچێت و بێ جیاوازی ئایدۆلۆژیاو دنیابینیی و بڕواو بیرکردنەوەیان، نووسەران هەموو تیایدا بەشداربن. پیرەمێرد سەرچاوەی نووسینی پتر لە ٧٠٪ ی

بابەتەکانی ناو ڕۆژنامەکەیە، لەو ٣٠٪ یەشی پتر لە ٢٠٪ ی ئاگادارییەکان داگیرییان کردووە کە لەدەرەوەی پرۆسەی نووسینی ڕۆژنامەکانن.
لە ژانرە ڕۆژنامەنوسییەکاندا، وتارەکان زاڵن، وتارەکانیش کەمتر ڕەچاوی وتاری ڕۆژنامەنوسییان کردووە، زۆربەیان پڕن لە ڕێنموونی و ئامۆژگاریی و هەندێ جاریش پیاهەڵدان، بۆیە پشکی ژانری ڕۆژنامەنوسیی بابەتیی لە "ژیان و ژین" دا کەمترین ڕووبەر لە ڕۆژنامەکەدا، دەگرێتەوە.
بۆ سەلماندنی زاڵبوونی داڕشتنی ئەدەبیی بەسەر هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکاندا، ئەم نموونانە دەخەینەڕوو:
١- لە ئاگاداری ناوگۆڕینی فایەق وشیاردا، پیرەمێرد ئاگادارییەکە بەشیعر دەنووسێ:

((فایەق بۆئەوە کە بێ بە کورد
ناونرا وشیار ناوی تەبدیل کرد))[816].

٢- لەبابەتە ڕۆژنامەنوسییەکاندا، وەسفی ئەدەبیی بەکارهێنراوە، بۆ نمونە لە سەروتاری ژمارە ٣٤١ دا دەنووسێ:
((شەوی سێ شەممە شەوێکی فێنك و خۆش، ئاسمانێکی بەشەوق، ئەستێرەکان لەسەردا جریوەیان ئەهات و ئێمەیش بەشەوقی ئەدانەوە توکەی سمێڵمان ئەهات...تاد))[817].
٣- تێکەڵکردنی ڕای کەسیی و پەیڕەوکردنی پیاهەڵدان لە هەواڵەکانیدا:
- ((مەبعوسی موحتەرەممان جەنابی محەمەد ساڵح بەگ بە موناسەبەتی تەعتیلی مەجلیسی مەبعوسانەوە لەم چەند ڕۆژانەدا تەشریفییان هێناوەتەوە سلێمانی، عەرزی بەخێرهاتنەوەی دەکەین))[818].

---

[816] بڕوانە: ژیان (ژ٤٠٧: ٣).
[817] بڕوانە: ژیان (ژ٣٤١: ١).
[818] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٥: ٤).

- ((جەنابی صالح زەکی بەگ نەوەی ساحێبقڕان کە لەبەغدا معاون مدیر عامی داخلیەیە بواری ئیشیان داوەتیٚ هەتا چوار مانگ، هەموو خاوو خێزانەکەیشی دیٚ نێتەوە ئێرە لەناو خۆمانا ڕادەبوێرن))[819].

- ((جەنابی عومەر نەزمی بەگ موفەتیشی ئیداریی و ئەلویەی مەعلومە دوێنیٚ تەشریفییان هێنایە سلێمانی. ئەم زاتە بە دوو باڵی عەدلیی و ئیداریی لە ئاسمانی سەعادەتا پەرواز ئەکا، چونکو لە خۆمانەو خەڵکی زۆرباشە، هیوامان بەخوا وایە زۆرتر سەرکەویٚ- بەخێرهاتنی دەکەین))[820].

٤- بەکارهێنانی دێڕەشیعر لەسەروتارو بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکانی تردا:

- لەکۆتایی سەروتاری "زاخاوی دڵی میللەتە تەشریفی مەلیکمان" دا دەنووسێت: ((خوایە بۆ خاتری جەدی مەلیکی دڵسۆزمان شەرەف مقدەمی بێتە سەببی خێر بۆمان))[821].

- لەسەرەتای سەروتاری ژمارە ٣٤٧ یشدا نووسراوە:

((چەند خۆشە خاکیٚ هەموی یەك دڵ بیٚ
ئەم بە پەژارەی ئەویان بە کوڵ بیٚ))[822].

- بەکارهێنانی شیعر لە هەواڵدا.

لە پێشەکی هەواڵی سەردانی مەلیك بۆ ئەوروپادا نووسراوە:

(( ڕۆژی یەك شەمو دەی مانگی سەفەر
مەلیك سەفەری خێری هاتەبەر))[823].

- یان لەسەرەتای وتارێکی هەمان ژمارەدا نووسراوە:

(( قەومیٚ بیەویٚ ئەویش سەرکەویٚ
پێش هەموو چشتیٚ پارەی پیٚ دەویٚ))[824].

---

[819] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٧: ٣) .
[820] بڕوانە: ژیان (ژ٣٦٦: ٣) .
[821] بڕوانە: ژیان (ژ٣٣٣: ١) .
[822] بڕوانە: ژیان (ژ٣٤٧: ١) .
[823] بڕوانە: ژیان (ژ٣٦٦: ٢) .

- یان وەك لێدوانێك لەسەر وتارێکی قوتابییەکی زانستی دەنووسێت:

((ئافەرین زانستی بۆ ئەم ڕۆڵەیەی وا پێت گەیاند

سەر بڵندی بۆئەوەی ڕاگیری کردو تۆی چاند))[825].

- یان لە پێشەکی سەروتاری ژمارە ٣٧٧ دا دەنووسێ:

((سەوادی عیراق ماتەمی پۆشا

فرمێسکی خوێنین لەچاوا جۆشا))[826].

- لە پێشەکی سەروتاری ژ ٣٨٧ دا دەنووسێ:

((وا بە لرخە لرخ زستانمان بۆ هات

بەفرو بەستەڵەك کەوتە ناو وڵات))[827].

٥- شێوازی گێڕانەوەگەریی لە هەواڵەکاندا بەشێوەیەکە کە لە قسەی کەسێك بچێت نەك لە گێڕانەوەیەکی ڕۆژنامەنوسییانە، شێوەیەك کە دەشێ لە نووسینی درامایەکدا پەیڕەو بکرێت نەك لە هەواڵدا:

(( ژاپۆن بەرەبەرە چینی هێجگاری پەستکرد، لە پلەو پۆی خست، لە بەردەرگای پایتەختی چیندا کوشتارێکی زۆریان کردووە،...تاد))[828].

٦- بایەخدان بەشیعرو ئەدەب بەجۆرێك لەزۆر ژمارەدا لەجێی سەروتار شیعرێك بڵاوکراوەتەوە[829].

٧- بە دەگمەن هەواڵ یان بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکانی جگە لە سەروتار لەلاپەرە یەکی "ژیان و ژین" دا دەبینرێنەوە.

---

824 سەرچاوەی پێشوو (٣).

825 بڕوانە: ژیان (ژ٣٥٧: ٣) .

826 بڕوانە: ژیان (ژ٣٧٧: ١) .

827 بڕوانە: ژیان (ژ٣٨٧: ١) .

828 بڕوانە: ژیان (ژ٣٦٥: ٢) .

829 بڕوانە: ژیان (ژ٣٨٦: ١) .

هەواڵەكان بەگشتی هەواڵی تەشریفاتیی یان هەواڵی حكومیین زۆر بەدەگمەن هەواڵی ژیانی ڕۆژانەی خەڵك و بزاوتەكانی ناو بازاڕو هەواڵی هاووڵاتیان دەبینرێتەوە.

٨- هاندان نەك پیشاندان، زۆرجار لە بابەتەكانی "ژیان و ژین" دا دەبینرێتەوە، زۆرجاریش هەڵوێست دەستنیشاندەكرێت بەرامبەر ئەو بابەتەی دەنووسرێن.

دەربارەی پشتیوانیكردنی "سپای زۆربگیر" و هاندانی گەنجان بۆ چوونە ڕیزی سوپاوە، جگە لەوەی چەند سەروتارێك دەنووسێت، بەشیعریش دەیەوێت هانی لاوان بدات:

((ئەگەر ئەتەوێ نەیەن بە گژتا

ئامادەی شەڕبە لەهەموو وەختا

لە شێنەییشدا پرچەك بنوێنە

چاوی دوشمنی پێ بترسێنە ! ))[830].

٩- بەكارهێنانی هونەرە ڕەوانبێژییەكان لەنووسیندا، بۆ نموونە بەم شێوەیە ناونیشانی سەروتاری ژمارە ٣٩٢ دەنووسێت:

((لە عیراق شادی، شایی، شا، یی یە))[831].

لەناو سەروتارەكەشدا دەنووسێت:

((ئەمڕۆ لە هەموو خاكی پاكی عیراقا، زەمزەمەو شادییە، كە شایی یەعنی عەروس- شایی- مەلكی یە....وابوو بە سێ جەژن ئەمساڵ بەم جەژنە، یوسرا پاش عوسرە جەژنی دوای شینە، موشتەری لەگەڵ زەهرە قەرینە...تاد))[832].

١٠- دارشتنی زاتییانەی هەواڵنووسیی زاڵە بەسەر داڕشتنی بابەتییانەی هەواڵەكاندا بۆ نموونە لەژێرناوی "هەڵەبجە خەریكن ئەلكتریك دائەنێن" دا دەنووسێت:

---

[830] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٠: ١).

[831] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٢: ١).

[832] سەرچاوەی پێشوو.

(( وەك سلێمانی بەئەلكتریك چاوی ڕون بوەتەوە، هەڵەبجەیش چاوی كرایەوە، خەریكن ئەلكتریكی تیا دامەزرێنن، ئاخ خۆزگە خەیاڵەكەی شەوی گوێ شەتی بەغدامان ئەهاتەدی، شارەزوور ئەبوو بەشەو چرای نوور))[٨٣٣].

١١- ڕوداوەكانی ڕۆژانەو بابەتەكانی خەڵك لە قاڵبی شیعرو ئەدەبیات، یاخود واقیعییانە لە پەندەكانی پیرەمێرددا ڕەنگیانداوەتەوە نەك لە هەواڵەكاندا، لەم ڕێیەوە پیرەمێرد بەپێی ڕۆژو ڕوداوەكان پەندەكانی بڵاوكردۆتەوە، لە پەندی پێشیناندا دەڵێ:

((ئاردی ناو دڕك چۆنە؟ وان ئێرە
فەرموو دوو دەستەی دۆست هەڵبژێرە
بناغەی ئێرە ساڵی دوو سەدە*
وا دەردەكەوێ خاكەكەی بەدە))[٨٣٤].

((مەعاشەكەمان بەشی دۆڕانە
بەدوو جەژنانە و سێ پاش تێلانە
گەرای كوللەمان بۆ بژێتەوە
ئەمجا پێكورە ئەبوژێتەوە
كە مەشكە دڕە نەتەوەی بڕا
مەشكەی مەزبەتەی تەنزیلات دڕا))[٨٣٥].

((زۆركەس ئەبینین دەچێتە بەغدا
هەروەك پەتكەو نابێ بە هەودا
قەساب تەمیزی بۆ دوكان ئەبێ
كەچی بۆ ئێمە گۆشت گران ئەبێ
ڕەئیس شارەزای ئەم خووانەیە
بەڵام ئاخ مشتەی ناو هەمانەیە))[٨٣٦].

---

[833] سەرچاوەی پێشوو (٣).

* ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی سلێمانی وەك شار، لە ساڵی ١٢٠٠-١٢٠١ی كۆچییدا دامەزرێنراوە.

[834] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٣: ٢) .

[835] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٤: ٢) .

[836] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٧: ٢) .

### ٢-٢/٤) هونەرە بەکارهاتووەکانی ڕۆژنامەنوسیی لە "ژیان و ژین" دا:

أ. خودییەکان:

١. سەروتار:

ئەم ڕۆژنامەیە بەپلەی یەکەم بۆ هەڵویست و دەرخستنی ڕای ڕۆژانەو قسەکردن لەسەر دۆزە زیندووەکان هاتۆتەکایەوە، بۆیە کەم ژمارەی "ژیان و ژین" هەیە، سەروتاری تیانەبێت ئەم سەروتارانە هەرچەندە لەشوێنی سەروتاردا نووسراون بەڵام وەك سەروتار نەناسێنراون و زۆرجار پیرەمێرد لەبری ئەم زاراوەیە زاراوەی (سەر ستون) یان (سەر پەڕە) ی بەکارهێناوە، بەڵام لەفۆڕم و ناوەڕۆکیشدا هەموو ئەمانە سەروتاری ڕۆژنامەکەبوون، وەك ئەم سەروتارەی لە ژمارە (٣٢٦) دا بە ناونیشانی (نەتەوەو زبانی کورد) ەوە بڵاوکراوەتەوە:

(( کوردەواریی کەلە دەورەی پادشاهی یاوزا بەهۆی هەڵ فریواندنی ئیدریسی بەتلیسی یەوە هاتە ژێر ملکەچی دەوڵەتی عوسمانییەوە و بۆ هەموو تەق و ڕەوتەك و دەوری جیهانگیریی تورك پێشڕەوو پێشواز بوون، نەیان پەرژایە سەر ئەوەی هەوڵ و تەقەلایەك بۆ خۆیان بدەن و ببن بەشتێ !.... تاد))[٨٣٧].

یان لەژێر ناوی (سەر پەڕە)داو لە ژمارە (٣٣٢)دا بە سەروتارێکی کورت تێڕوانینی ژیان بەرامبەر بە ڕەوتی کارەکانی خۆی دەخاتە ڕوو[٨٣٨].

٢. وتار، وتاری سەرە:

وتاری سەرە یان سەردەستە، کە زۆربەی جار لەلایەن خودی پیرەمێرد خۆیەوە نووسراوە، ڕوبەرێکی دیاری ئەم ڕۆژنامەیەی داگیرکردووە، لەم وتارانەدا جگەلەوەی لاپەڕەی یەکەمی بۆ تەرخانکراوە، لە هەمانکاتدا بەڵگەو بەهانەو ڕێنمایی و ئامۆژگاریی و زانیاریی خستنەڕوو پەیرەوکراون بۆئەوەی بڕواو تێگەیشتنی پتەو لای خوێنەر دروستبکەن.

---

[837] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٦: ١) .

[838] بڕوانە: ژیان (ژ٣٣٢: ١) .

نمونەیەکی ئەم جۆرە وتارە، وتاری سەرەی لاپەڕە یەکی ژمارە (٣٢١) کە لەستونی دووەمدا پیرەمێرد لەژێر ناونیشانی (زانستی) دا نوسیویەتی، لە بەشێکی ئەو وتارەدا هاتووە:

((کۆمەڵی زانستیی کەتا ئێستا چوارسەد پێنجسەد کەس لە بێکەس و بێنەوای نەخوێندەواری فێری زانستیی کردووەو ئەو نەخوێندەوارانە کە لە ئیشدا بەڕۆژ شاگرد نانەواو کۆشدرو، یابێ ئیش بوون و ئێستا بەهۆی خوێندەوارییەکەیانەوە لە ئیشدا دامەزراون....))[839].

٣. وتار، ڕۆژانە وتار:

هونەرێکی تری وتارنوسینە، بەتایبەتی لەڕۆژنامەدا بەکاردەهێنرێت، پیرەمێرد هەندێ جار ئەم جۆرە وتارەی لە لاپەڕە یەکی ڕۆژنامەی "ژیان و ژین" دا بەکاربردووە، ئەم نمونەیەش یەکێکە لەوانە، کەلە ژێر ناونیشانی "ڕۆژی ولادەتی جەلالەتی مەلیك موعەزەم"دا لە لاپەڕە یەکی ژمارە ٣٢٣ ی "ژیان" دا بڵاوبۆتەوە:

((ڕۆژی جومعەی ڕابردوو کە موسادیف یومی ولادەتی جەلالەتی مەلیکی عێراقی کرد، بە ڕەسمی و بە تەبیعی تەعتیل بو. بۆ ئێوارە بەرەو سەراو باغچەی بەلەدیە بە بەیداخی ڕەنگاوڕەنگ و بە ئەلەکتریکی موسەننەع ڕازابوەوە))[840].

٤. وتاری کۆمەڵایەتی:

وتارە کۆمەڵایەتییەکان ڕوبەرێکی زۆری ڕۆژنامەکەیان داگیرکردووەو لێیانەوە پیرەمێرد لەدەردو داو باری ژیانی ڕۆژانەو بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵ دواوەو یاساو بەڵگەی زیندووی تێدا خستونەتەڕوو، ئەم وتارەی خوارەوە کە بەناونیشانی "دەستگیرۆیی داماوان"ەوە نووسراوە یەکێکە لەم جۆرە وتارانە لە "ژیان" دا بڵاوبۆتەوە:

---

[839] بروانە: ژیان (ژ٣٢١: ١).

[840] بروانە: ژیان (ژ٣٢٣: ١).

((ئەمساڵ چونکو گەرمیان بارانی نەبوو، زەوی گیای لیٚ نەڕوا، گەرمیانیی ڕان و ڕەوکیان قڕی تیٚ کەوت، ئەوی کە بۆیان دەرچوە بە ناچاری ڕویان کردۆتە خاکی ئیٚمەو پەنایان بۆ ئیٚمە هیٚناوە، ئەمە بە زمانی خۆمان (لیٚ قەوماوانیان) پیٚ دەڵیٚن))[٨٤١].

٥. وتاری زمانەوانیی:

وتاری زمانەوانیی چ لەسەر میٚژوی زمان بیٚت یان لەسەر زانستی زمان بیٚت لە ڕۆژنامەکەدا ڕەنگی داوەتەوەو ئامادەیی خۆی هەیە، وتاری (زبانی کوردی) یەکیٚکە لەو وتارانە کەلە لاپەڕە (١) ی ژمارە (٣٢٧) دا بڵاوکراوەتەوەو تیایدا هاتووە:

((لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا وا دەرکەوتووە کە بنچینەی ئیٚمە لەگەڵ کۆنی ئیٚراندا یەکیٚکە، هەندیٚ وتویانە ٣٣٠٠ و هەندیٚکی تر دەڵیٚن ٢٧٠٠ و لەدواییدا لیٚیان کورت کردۆتەوە، هیٚناویانەتەسەر ٢٦٧٠ ساڵ پیٚش پیٚغەمبەری عیسا دا کە باپیرە گەورەمان لەم دیوو دیوی شاخی هندوکوشەوە کۆچیان کردووە بۆ مدیەو ئەوناوە، ئەوسایە کە هاتوون هەموویان بە زبانی (ئاویٚستا) دواون....تاد))[٨٤٢].

٦. وتاری تەندروستی:

لەم جۆرە وتارەدا ڕۆژنامەکە دریٚغی نەکردووە، چەندین وتاری تەندروستی بڵاوکردۆتەوە تا هۆشیاریی و ئاگایی و ڕیٚنمایی تەندروستیی بە خەڵك ببەخشیٚت، لەژیٚر ناونیشانی "مردنی مناڵی ساوا" دا دەنووسیٚت:

((ئەو ئینسانە لەش ساغانە، کە ئەتوانن بە مەتانەتی لەشیان گەلی میکرۆبی بیٚ فەڕی نەخۆشی ئەفەوتیٚنن....تاد))[٨٤٣].

---

[841] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢١: ١)

[842] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٧: ١) .

[843] بڕوانە: ژیان (ژ٣٣١: ١) .

٧. وتاری کاریکاتێری:
هەندێ جار ئەم جۆرە لە وتار لەگەڵ تەنز یان ڕەخنەشدا تێکەڵ دەبێت، لەم ڕۆژنامەیەدا جۆرێك لەم وتارانەش بڵاوکراونەتەوە. ئەم نموونەیەی خوارەوە یەکێکە لەو وتارە کاریکاتێرییانەی زیاتر بەلای تەنزدا دەڕوات و لەژێر ناونیشانی "هەزەلیات– خەیاڵی ڕۆژو"دا بڵاوکراوەتەوە:
(( یەکێ لە شاعیرە خەیاڵ بازەکان وتویە، هیچم لەماڵا نیە، ئەگەر ڕەمەزان ڕووبکاتە ماڵم لە برسا ئەیخۆم...تاد))[٨٤٤].

٨. وتاری ڕۆژنامەوانیی:
چەند وتارێك دەربارەی مێژووی ڕۆژنامەنوسیی و پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی و بایەخی ڕۆژنامە لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاوکراونەتەوە، نموونەی ئەمانە ئەم وتارەیە کە لە ژمارە ٦٩٠ دا لەژێر ناوی (غەزەتە) دا بڵاوکراوەتەوە، تیایدا هاتووە:
((ئەم حکومەتانەی کە لەسەر زەمیندا دامەزراون و نگهبان و پارێزگاری ژێر دەستەکانی خۆیانن و هەوڵ بۆ ئاسایش و ئاسودەیی ئەوان ئەدەن... غەزەتەیش بەمە ناڵێن کە هەروا دوو قسەی قۆڕی بن هەڵدراو و لاپچڕاو یا گاڵتەوگەپ بن...))[٨٤٥].

٩. وتاری ئابوریی:
لە ژمارە ٤١٢ دا وتارێکی ئابوری بڵاوکراوەتەوە وەك نموونەیەك بۆ ئەم جۆرە وتارە وەرمانگرتووە کە لەژێر ناوی (اقتصادی) دا نووسراوە:

---
[844] بڕوانە: ژیان (ژ٣٨٩: ٣).
[845] بڕوانە: ژین (ژ٦٩٠: ١).

((موعادەلەیەکی ریازی یان قاسیەو قیاسێکی مەنتیقی کە هەموو لکێکی ڕێك و پێك بێ ویك بگرێتەوە، ڕاست و ڕەوان دێتە دەرەوە، وەك دەڵێن قەتیعەتی ریازی کەچ و کروچی تیا نابێ...تاد))[846].

١٠. وتاری سایکۆلۆژیی:

جۆرێکی تری وتارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەیە کە یان لە ڕوانگەیەکی سایکۆلۆژییەوە لە بابەتێك دەدوێ یان باس لەخودی سایکۆلۆژیا دەکات، نموونەی ئەم جۆرە وتارە ئەم وتارەیە کە لەژێر ناوی "سایکۆلۆجی تازە- دایك" لە ژمارە ٤٣٤ دا بڵاوکراوەتەوە:

((ناپلیۆن وتوویە: "دایکم منی بەم پایەیە گەیاند"، مەلاکانی خۆشمان ئەڵێن: "بەهەشت لەژێر پێی باوك و دایك دایە"....تاد))[847].

١١. وتاری ئایینناسی:

جۆرێکی تری وتارەکانی ژیان و ژین وتاری ئایین، یان ئایینناسی یان بۆنەو مەراسیمە ئایینییەکانە، وەك ئەم وتارە ئایینناسییەی لە ژمارە ٤٥٨ دا بڵاوکراوەتەوە لەژێر ناوی "عیلمی فقه" دا باس لەزاراوەی "مروری زەمان" کراوە:

((مروری زەمان بە دەعوایەك ئەڵێن کە ساڵی بەسەردا ڕابوردبێ وە کۆن بوو بێ...تاد))[848].

---

846 بڕوانە: ژیان (ژ٤١٢: ١) .

847 بڕوانە: ژیان (ژ٤٣٤: ٢) .

848 بڕوانە: ژیان (ژ٤٥٨: ١) .

١٢. وتاری هونەری:

هونەرو بوارە هونەرییەکانیش بەشێکی گرنگی ڕۆژنامەکەیان پێکهێناوە، لە ژمارە ٥٣٨ دا وتارێکی هونەریی لەژێر ناونیشانی " شیعرو فەن"دا بڵاوکراوەتەوە، وەك نموونەی ئەم جۆرە وتارە وەریدەگرین:

(( بیستومە شاعیرێك داستانێك بۆ پادشاهێك ئەڵێ، پادشا ئەفەرموێ گیرفانی پڕکەن لە ئاڵتون،...ئێستاش لە "ئەوروپا" هەموو ساڵێ موکافەئاتی :نوبڵ" ئەدرێ بەڵام زۆرتر بە ئەهلی فەن ئەدرێ شیعر ڕەواجی نەماوە...))[849].

١٣. وتاری ساتیری:

وەك ئەم وتارە کە لەژێر ناوی "بەشی پێکەنین- وڵات پەروەری" دا بڵاوکراوەتەوە:

((پێت ئەڵێن بەخوا برا بێ هۆش و گوشە، خۆ ئەوەندە شعوری نیە خزمەتێکی وڵاتەکەی بکاو بەکاری شتێك بێ....تاد))[850].

١٤. تەنزەوتار:

((جاران پۆلیس و عەمەلەی بەلەدیەو فەڕاشی دەوائیریشیان بۆ ئێمە نەهێشتۆتەوە، کاریان ڕاست بێ ئێستا داوای تەزکەرەی نفوسیان لێ دەکەن...تاد))[851].

---

[849] بڕوانە: ژیان (ژ٥٣٨: ١).

[850] بڕوانە: ژیان (ژ٤٠٩: ٢).

[851] بڕوانە: ژیان (ژ٤١٢: ٢).

١٥. وتاری یاسایی:

لە ژێر ناونیشانی:"عیلمی حقوق"دا دەنوسێت:

((لە عیلمی حقوقدا غایەی جەمعیەت و حکومەت نیشان ئەداو ئەڵێ: وەزیفەی دەوڵەت بۆ ئەمنیەتی داخلی و خارجیی قوەی زابیتە...تاد))[852].

١٦. وتاری فەلسەفی:

لەژێرناوی "فەلسەفە" دا: ((لای ئێمە حەیات بۆچی وا بێقەدرە ؟! خوا ئەم ڕۆحەی کە بە ئەمانەت داوە بە بەشەرو زیندەوەر...تاد))[853].

١٧. وتاری کەشناسیی:

لە ژێر ناونیشانی"اقلیم گۆڕاوە"دا دەنوسێت:

((ئەو ساڵەی لە ئەستانبوڵ هاتمەوە بەفر ڕێی سلێمانی گرتبو ٤٢ شەو لە کەرکوك ماینەوە...تاد))[854].

١٨. وتاری ئامۆژگاریی:

لە ژێر ناونیشانی "ئامۆژگاری" دا دەنوسێت:

((ئەڵێن ئەوروپا وەکویەك ئەژین، گشتیان بەبەزم و ئاهەنگ گوزەران ئەکەن...تاد))[855].

١٩. وتاری زانستی

لە ژێر ناونیشانی"هەندەسەی میعماری دەوری ئیسلامی " دا دەنوسێت:

((سەرەتای بنیاتی ئیسلام لەمزگەوتی مەدینەی منەوەرەوە پەیدابوو...تاد))[856].

---

852 بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٢: ٤) .

853 بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٥: ١) .

854 بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٦: ١) .

855 بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٨: ٤) .

856 بڕوانە: ژین (ژ٥٨٨: ١) .

٢٠. وتاری وەرزشی:

وەرزش دێتە ڕۆژنامەکەوە سەرەتا وەك هەواڵێکی کورت بەڵام دواتر دەبێتە وتارێکی سەرەکیی ڕۆژنامەکەو لە لاپەڕە ١ ی ٣٩٦ دا لەژێر ناونیشانی "فوتبۆڵ- تۆپ بازیی" دا، باس لە بایەخی وەرزش و یاریکردن دەکات:

((ئێستا یاری فوتبۆڵ بوەتە یارییەکی جیهانی شمول و کەوتوەتە قاڵبێکی واوە بە أصول و ئاداب و لەلەو بە سەعادەت و دقیقە یاری دەکریٚ...تاد))[857] ل١، ٣٩٦.

٢١. وتاری وەرگێڕدراو:

لەژێرناوی "بەراورد" دا "محمد عبدالرحمن" نووسیویەتی:

وەرگێڕان لە گۆڤاری (رسالة) ی میسرییەوە: ((لە بەینی ژن و پیاودا، ئایا شەرق شەرقەو غەرب غەربە، لە هەموو شتێکدا ؟...تاد))[858].

٢٢. ستون:

ستونی ڕۆژنامەنوسی هونەرێکی دیاری ئەم ڕۆژنامەیەیە ئەمەش بۆ گوزارشتکردنە لەو ڕوداوانەی کە ڕۆژنامەو نووسەرە دیارەکەی کە خودی پیرەمێردە دەرکیان بە بایەخیان کردووەو قسەیان لەسەرکردوون و نەتوانراوە لە قاڵبی تەسکی هەواڵدا بیٚ خوێندنەوەی پێش کات و ئاکامی ڕوداوەکان بیانخاتەڕوو، یەکیٚ لەو ستونانە ستونی (لەم لاو لەولاوە) یە کە لە چەندین ژمارەدا بەم ناونیشانەوە نووسراوە. لە یەکیٚ لەو ستونانەدا دەنوسێت: ((وا دەردەکەون کە موتەسەریفی موسڵ خەریکە کوێستانی لای عەمادییە بکا بە هەواری هاوینە بۆ ئەوانەی کە لەگەرمای بەغداو بەسرا ڕائەکەن و خۆیان دەخەنە

---

[857] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٦: ١) .

[858] بڕوانە: ژین (ژ٥٥٦: ٣) .

کوێستان. بەڵێ ئەمە زۆر بەجێیە چونکە ئەو دیارییەی بۆ شارێکی بێگانەی دەبەن با لەناو خۆمانا بمێنێتەوە...)) [٨٥٩].

٢٣. ستونە ڕیکلام

"مژدە"

((ساڵێکە ئێمە مژدەی مەولوودنامەی شێخ محمدی خاڵمان داوە، ئەمە لەوانەیە کە هەرچی موسڵمان دەبێ نوسخەیەکی ببێ...)) [٨٦٠].

٢٤. گۆشە:

هەندێ گۆشە لەم ڕۆژنامەیەدا هێندەی تەمەنی ڕۆژنامەکە درێژەی کێشاوە وەك گۆشەکانی پەندی پێشینان، کردوکۆشی، ڕۆحی مەولەوی...تاد، دەشێ ئەمانە وەك گۆشەی بەردەوام بناسرێن، نموونەی ئەمانەش ئەم گۆشەیەیە کەلە لاپەڕەی ژمارە ٤١٧ دا بڵاوکراوەتەوە:

((پایز، گەڵاڕێزانی خۆی کرد، هەوری نووی دەخوری، بەرگی هەژاران دەدڕێ، باران ڕێی کردو کۆشی زۆر کەس دەبڕێ...تاد)) [٨٦١].

٢٥. گۆشەنیگا:

تێڕوانینی نووسەرێکە بۆ نووسین یان بابەت یان تێڕوانینی کەسێکی ترو لە ڕۆژنامەکەدا وەك تێڕوانینی کەسیی بڵاوکراوەتەوە، وەك ئەم گۆشەنیگایەی "لاوێکی کورد" لەژێر ناونیشانی "سامانی وڵاتەکەمان" دا بڵاویکردۆتەوە:

((پیرەمێردی موحتەرەم وەختی خۆی لەژیاندا لەم بابەتەوە مەقالەیەکی دورودرێژی نووسیبوو چەند پێ خۆش بوو، چونکە مقالەیەکی وای هێنایەوە بیرم

[859] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٢: ٣).

[860] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٤: ٤).

[861] بڕوانە: ژیان (ژ٤١٧: ١).

که ئێمه ئەگەر بەبێ ئامۆژگاریی ئەو مقالاته بەڕێوه بڕۆین وا لات و ماڵ وێران نابم...تاد))[٨٦٢].

٢٦. ڕونكردنەوە:
هەندێ ڕونكردنەوە لەم ڕۆژنامەیەدا دەخوێنینەوە کە بەشێکیان ڕونكردنەوەی کەسین و بەشێکی تریان ڕونكردنەوەی خودی ڕۆژنامەکەو بەشێکی تریشیان ڕونكردنەوەی فەرمین لەسەر بابەته بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەکە هاتوون و بڵاوکراونەتەوە، وەك نموونەی ئەمەی دواییان کەلە لاپەڕە (١)ی ژمارە ٣٤٤ دا ڕونكردنەوەیەکی "مەکتەبی ئەولی" سلێمانی لەسەر بابەتێکی "ژیان" بڵاوکردۆتەوە به ئیمزای (عبدالواحد نوری) بەڕێوەبەری قوتابخانەکە:
((له غەزەتەی ئەمجارەدا سەرلەوحەی مقالەیەکم دی کە ئەمه بوو "میللەت حسابی ئەوێ".
ئێمه کۆمەڵێ مامۆستایانی مەکتەبی ئەول به خۆشی و فەخرەوه خوێندمانەوە، میللەتێك حسابی خۆی داوانەکا به میللەت ناژمێررێ و هیچ قیمەتێکی نابێ لەناو ئیجتیماعی ئەقواما....تاد))[٨٦٣].

٢٧. هەڵسەنگاندن:
((دوێنێ ئێوارێ یەکێکی تازه دۆستی کۆنەکورد هاته قەلەندرخانەوه چەند لاپەڕەیەکی ژاکاوی بەدەستەوە بوو...تاد))[٨٦٤].
٢٨. پیشاندان:
پیرەمێرد دەربارەی دەرکردنی یادگاری لاوان* بەم شێوەیه دەنووسێت و ڕای خۆی تێکەڵ به خستنەڕوو بڵاوکردنەوەی "یادگاری لاوان" دەکات:
((جاری پێشوو نوسیبومان که یادگاری لاوان دەرچووەو گەر دەستمان گەیشت له چاك و خراپی ئەدوێین...تاد))[٨٦٥].

---

[862] بڕوانه: ژیان (ژ٣٤٥: ٢-٣).
[863] بڕوانه: ژیان (ژ٣٤٤: ١).
[864] بڕوانه: ژین (ژ٥٧٤: ١).
* بڵاوکراوەیەك بووه لەساڵی ١٩٣٣ دا کۆمەڵی (لاوانی کورد) له بەغدا دەریانکردووه.
[865] بڕوانه: ژیان (ژ٣٧٥: ٣).

٢٩. گێڕانەوە:
باسکردن و قسەکردن و گێڕانەوەیەکی ئێستایی یان مێژووییە لەسەر بابەتێك یان ڕوداوێك وەك ئەم بابەتەی لەژێر ناوی "ژنانمان چل ساڵ لەمەوبەر چۆن بوون" دا بڵاوکراوەتەوە:
((بە بیرەوەری هەموو لایەك لەمەوپێش دایك و باوك ژنیان بۆ کوڕیان دەهێنا، ژنانی دەستەودائیرەی ماڵی زاوا خۆیان ئەڕازاندەوە...تاد))[٨٦٦].

٣٠. چیرۆکی ڕۆژنامەنوسیی:
((یەکێ لە شاعیری پێشینانی (عەمادی لوڕ) کە لەم کورد لوڕستانەن لە ئەسفەهاندا و لەمیانەی شعرای دەوری سەفەوی دا پایەیەکی بڵندی بووە، ڕۆژێ لەگەڵ خواجە شمس الدینی وەزیردا شەترنج یاری ئەکەن...تاد))[٨٦٧].

٣١. لێدوانی ڕۆژنامەنوسیی:
قسەکردن لەسەر ئەدیسۆن و خستنەڕووی لایەنەکانی هونەرێکی ڕۆژنامەنوسیی وەك لێدوانیان لەم ڕۆژنامەیەدا بەرجەستەکردووە، وەك لەم بابەتەدا بە ناونیشانی "ئەدیسۆن کێ بوو چی کرد"ەوە بڵاوکراوەتەوە:
((ئەدیسۆن عالمێکی گەورەی ئەمریکا بوو، خادمی بەشەرییەت بوو، لە دارالفنون خوێندوویەتی، هەربە تەجربەی خۆی پێ گەیشتووەو گەلێ ئیختراعاتی عەلاوەی فەن کردووە، ئەمساڵ لە عومری ٨٥ ساڵیدا وەفاتی کرد....تاد))[٨٦٨].

---

[866] بڕوانە: ژیان (ژ٤٠٨: ٣).
[867] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٧: ١).
[868] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٧: ٢).

٣٢. ڕانانی کتێب:

((تا ئێستا زۆرکەس لە عولەمای گەورە مەولودنامەیان نووسیوە، بەڵام هیچیان نەنووسیوە کەلە خورافات ڕوت بێ وە موسڵمانان ئیستیفادەیەکی ئەخلاقیی یان ئادابی یان ئیجتیماعی لێ بکەن، وا ئەمجارە خوا ڕەوای بینی (شێخ محمد) ی خاڵ مەولودنامەیەکی زۆر جوانی بۆ نووسین...تاد))[٨٦٩].

٣٣. ساتیر:

ڕەخنەیەکی شێلگیرانەیە بەشێوەیەکی تەنزئامێز، یان بەراوردکردن دەخرێتە ڕوو، وەك بابەتگەلێکی دیار لەم ڕۆژنامەیەدا هەن، ئەمەی خوارەوە نموونەیەکی ئەم هونەرەیە کە لەژێر ناونیشانی"ڕەئیسی جەمعیەتی نسائی شەرق"دا بڵاوکراوەتەوە:

((نور حەمادە خانم، مرخەسی هەموو جەمعیەتی نسائییە کە بۆ پارێزگاری حقوقی جنسی لەتیف لە ئەکسەری پایتەختەکانی شەرقا کۆنفرانسی داو قانونی ئایین و حقوقی ژنانی بەرهەم هێنا و همو مصاریفی لە تەرەف مەعاریفەوە دراوە. مەعارفی ئێمەش گوێی لێ بێ، هیچ نەبێ معاشی مدیری مەکتەبی کچانمان بۆ زیاد کا))[٨٧٠].

بۆ ساتیری کەسیش نموونەی "کەسی دا بەبێ کەس کەسی بێکەسان" دەخەینەڕوو:

((شاعیرێکی بێکەسمان بوو، کە سەرەتای تازە دەرکەوتنبوو، هیوای لێ دەوەشایەوە، جارجار گوڵی جوانی لێ دەگەشایەوە "لامن قشة في التماثل" وەك ژاڵە ئەو گوڵە ئاڵە، دارەکەی تاڵە...تاد))[٨٧١].

---

[869] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٥: ٣) .

[870] بڕوانە: ژیان (ژ٣٦٥: ٢) .

[871] بڕوانە: ژیان (ژ٣٦٧: ٢) .

٣٤. پۆلیمیك:

وەك گوزارشتێکی وتوێژخوازانەی ڕووبەڕوانەی هێرشبەرانەی نێوان دوو نووسەر یان دوو کەس کە بەپێچەوانەی ئاراستەی یەکەوە وتوێژو گوزارشتەکانیان دەکەن دەنووسرێت، ئەم هونەرە بەکەمیی و دیاریکراوی لە "ژیان و ژین" دا بەکاربراون، ئەم بابەتەی خوارەوە بەشێکە لەو پۆلیمیکەی لەژێر ناونیشانی (گفتوگۆ) دا لە ژیان دا بڵاوکراوەتەوە:

((س- بۆچی حورمەتی ئەو ئینسانە زەبەلاحانە ناگری بەلاتا ڕا ئەبورن و هەرچی منالْ ئەبینی ئەی دوێنی؟

ج- عەزیزم مزێتیی کۆنەکان دەرکەوتووەو هیوام هەیە بەم بەسەزمانانە))[٨٧٢].

٣٥. میلۆدونگ:

لە ژێر ناونیشانی"ابخت النصر"دا دەنوسێت:

((دوێنێ شەو لەماڵی زاتێکی گەورە بووین، من هات بەخەیاڵما، هیتلەر کە لەپێشدا بە جولەکە قرانی کەوتە ناوەوەو دوای ئەم ئاشوبەی خستە دنیاوە...تاد))[٨٧٣].

٣٦. نامەی خوێنەران:

هەبوونی نامەی خوێنەران لە هەر ڕۆژنامەیەکدا بەڵگەی وابەستەبوونی ڕۆژنامەکەیە بە خەڵکەوە، ئەم ڕۆژنامەیە نەك هەر نامەگەلی زۆری لە سلێمانی و دەوروبەرییەوە بۆ هاتووە، بەڵکو لە شاری هەولێریشەوە خوێنەران بەناو بەشدارییان لە ڕۆژنامەکەدا کردووە، چ بە بابەت نادرن بیٚ یان داواکاریی، یان پێشنیاز و ڕاو سەرنج بێت.

ئەمەش یەکێکە لەو نمونانەی بڵاوکراوەنەوە:

---

[872] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢١: ٤).

[873] بڕوانە: ژین (ژ٦٠٤: ١).

((بە مۆری پۆستەخانەی هەولێرو بەناوی کوردێکی ڕاست بێژ، مەنزومەیەك بۆ ژیان هاتبوو، شێوەکەی کوردییەکی جوان و ڕاست و ڕەوانە بەڵام جۆش و خرۆش دەست نادا بۆ ئەم زەمانە، جاریٚ لامانە))[٨٧٤]، یان نامەیەك بەناوی "نقابداری سیاپۆش"ەوە بڵاوکراوەتەوەو تیایدا هاتووە:
((گەورەی خۆم نویسندەی ژیان، بە بینینی یەکەم گوڵی خەیاڵم لە گوڵشەنی (ژیان) دا گەلیٚ شاد بووم، هیوام هەیە خوێندەوارانی ژیانیش لە خوێندنەوەی وەڕس نەبووبن...تاد))[٨٧٥].

٣٧. نامەی کراوە:
"بۆ جەنابی محەمەد عەلی ئەفەندی مەئموری ئەوقافی سلێمانی"
((هەرچەندە ئینکار نیە کە فحولی عولەما لە مزگەوتاندا پیٚ گەیشتوون و هەر مزگەوتێکی سلێمانی داهیەیەکی لیٚ هاتوەتە دەریٚ. بەڵام ئەو زەمانە تەنها علومی دینییە بەکاربووە....تاد))[٨٧٦].

٣٨. نامەی تایبەت:
لەشێوەی گلەیی نامەیەکدا پیرەمێرد نامەیەکی کورتی لە ڕۆژنامەکەیەوە بۆ فایەق بێکەسی شاعیر دەنووسیٚ و لە ژمارە ٣٤٥ دا بڵاویدەکاتەوەو دەڵێت: ((ئێمە فایەق بیٚ کەسمان لە خۆمان پێشترو قەدر گیراوتر دانا، کەچی لەو نەختە نەختەکەی جارانیش بوو، ئێستا هیچمان بۆ نانوسیٚ))[٨٧٧].

---

[874] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٧: ٤).
[875] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٨: ٤).
[876] بڕوانە: ژین (ژ٦٥١: ١).
[877] بڕوانە: ژیان (ژ٣٤٥: ٤).

٣٩. نامەی نێوان سەرۆکەکان:

((ئیمام یەحیا مەلیکی یەمەن و ئیتاڵیا تەجدیدی موعاهەدەیان کردەوەو ئیمام کاغەزێکی دوعا گۆیی و شوکرگوزاریی بۆ مۆسۆلینی دیکتاتۆری ئیتاڵیا نووسیوە))[٨٧٨].

٤٠. پرسەنامە:

بەچەندین شێواز پرسەنامەکان لە ژیان و ژیندا نووسراون وەك تۆمارێکی زیندووی ئەو ڕۆژگارانەو دەرخستنی دڵتەنگیی و بەشداریکردن لەخەم و پەژارەی یەکتردا بڵاوکراونەتەوە، ئەم نمونەیەی خوارەوە کە بۆ پرسەی خێزانی جەمیل سائیب نووسراوەو تیایدا هاتووە:

((جەمیل سائیبی باش کاتبی محاسب کە هەموو عالەمینی خوا خۆشحاڵە، لەم مانگی موبارەکی ڕەمەزانەدا عائلەکەی کۆچی هێجگاری کرد...، خوا تەسەلاو ئەجری بداتەوە))[٨٧٩].

٤١. پیرۆزبایی:

پیرۆزباییەکانی ناو ئەم ڕۆژنامەیە زۆرن لەهاتنی مەلیکەوە تا بەدانان و لابردنی موتەسەریفو تا بە بەڕێوەبەرو فەرمانبەران و...هتد دەگات، ئەمەی خوارەوە نموونەیەکە لە پیرۆزبایی نامەیەك کە بۆ جەژنە پیرۆزە نووسراوە:

((مانگی ڕۆژو ڕۆیی و جەژنیش بە شوێنیا،...ژیان بە دڵێکی پاك و خێرخوا هاودڵسۆزییەوە جەژنە پیرۆزە لە هەموو لایەك ئەکا...تاد))[٨٨٠].

یان دەنووسێت: ((ئەمین زەکی بەگی خۆمان فەرمانی پادشاهی بۆ دەرچووە، کرا بە "مدیری عامی ئیقتسادو مواسەلات" خوا لێی پیرۆز کا))[٨٨١].

---

[878] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤١: ٣) .

[879] بڕوانە: ژیان (ژ٣٥٢: ٣) .

[880] سەرچاوەی پێشوو (٢-٣).

٤٢. سوپاسنامە:
لەژێر ناونیشانی (تەشەکور) دا بابەتێکی لەم جۆرە لە لاپەڕە ٤ ی ٣٤٧ دا بڵاوکراوەتەوە کە لەلایەن "جمعیەت هیلالی ئەحمەرەوە" سوپاسی خەڵکی سلێمانی دەکات. ئێمەش وەك نموونە بۆ ئەم جۆرە بابەتە لێرەدا دەیخەینەڕوو، بابەتی لەم جۆرە لە ژیان و ژیندا زۆرن و شێوەی جۆراوجۆریشیان وەرگرتووە:
((ئەمجارە بە چاوێکی گریان و دڵێکی سۆزانەوە هاتین بۆ سەرەخۆشیی فەلاکەتی لافاوی سلێمانی، بەپیرەوەهاتن و بەخێرهاتن و میواندارییەکی وایان کردین، فرمێسکی چاومان پڕبوو لە ئەشکی شادی...، بە عمومی بۆ عمومی شارەکەو بە خصوصی بۆ جناب موتەسەریف عەرزی شکران و ماڵ ئاوایی دەکەین))[٨٨٢].

٤٣. یاداشتی ڕۆژانە:
زۆرجار سەرگوزشتەو چیرۆکی ژیانی خەڵك وەك جۆرێك لە یاداشتی ڕۆژانە بڵاوکراوەتەوە، وەك ئەم نمونەیە، کە لەژێر ناونیشانی "شیری پاكو سروشتی چاك"دا نوسراوە:
(( جارێکیان لە گردی سەیوان شێخ عومەری خانەقایان ئەناشت، شێخ محەمەدی نەوەی خاڵ بەکوردیی ئامۆژگارییەکی مردوی دا دا...))[٨٨٣].

٤٤- نووسینەوەی ژیاننامە:
یاخود نووسینەوەی بەسەرهات و سەرگوزشتەی کەسانی تر وەك ئەم بابەتەی لەژێرناوی "دانایی" دا بڵاوکراوەتەوە:

---

[881] بڕوانە: ژیان (ژ٣٥٩: ٢) .
[882] بڕوانە: ژیان (ژ٣٤٧: ٤) .
[883] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٠: ١) .

((ئینکار ناکرێ که شیعر و ئەدەبیاتی ئێران باڵایە، بەڵام زۆرتری ئەفسانە نمایە، سەرگوزشتەی دوو شاعیری نامدار که یەکێکیان پێغەمبەری شیعرە (ئەنوەری) و دووەمیشیان لەو کەمتر نییە (فرخی)...تاد))[884].

٤٥. ژیاننامەی کەسیی:

پیرەمێرد دەنوسێت: (( قائمقامی جولەمێرگ بووم ئاشوتە کارێك ڕوی دابوو، تەبەعەی فرانسزی تیا علاقەدار بوو.....تاد))[885].

٤٦. ئاگانامە، بازاڕگەریی:

بازاڕگەرمکردن بۆ کتێبێك یان کاڵایەك یەکێکی ترە لە هونەرەکانی ئاگانامە لەڕۆژنامەکەدا، لە ژمارە ٣٧٢ دا لەژێر ناونیشانی (هەموو کچێك چی بزانێ) ئاگانامەیەکی بازاڕگەریی بڵاوکراوەتەوە:

((لەژێر ئەم عنوانەدا ئەمجارە لەلایەنی "کوردی مەریوان"یەوە کتێبێك بە حروفاتی تازەو لەسەر کاغەزێکی سپی لە شکلێکی جواندا تەبعکراوە لە دوکانی خیاتی ئەحمەدی خالە، نوسخەی بە دە فلس دەفرۆشرێ))[886].

٤٧. ئاگانامە، ئاگاداریی:

ئاگادارییەکان بەشێکی زۆری ڕوبەری ئەم ڕۆژنامەیەیان داگیرکردووە، ئەوەی جێی بایەخە تیایاندا بەشی هەرە زۆریان بە زمانی کوردی یان لەژێر کاریگەریی فۆنەتیکیی زمانی کوردییدا، نوسراون، ئەمە بە دەستکەوتێکی گرنگ دەزانرێت بۆ زمانی یاسایی و پەیڕەوی زمانەوانیی دادگاکانمان چونکە لە ئەمڕۆدا بەشی هەرە زۆری ئەمانە بەزمانی عەرەبی دەنووسرێن.

---

[884] بڕوانە: ژیان (ژ٥٤٢: ١).

[885] بڕوانە: ژین (ژ٦١٥: ١).

[886] بڕوانە: ژیان (ژ٣٧٢: ٣).

ژیان دەنووسێت: ((ئەو دوو خانووە کە حدودو تەفاسیلیان لە سەرەوە بەیان کراوەو بە گەڕەکی گۆیژە واقعین بەناوی ئەمین بگ کوڕی مەحمود بەگەوە، موحەدەدەن تاپۆ ئەکرێت لە تەئریخی ئەم ئیعلانەوە)) [887].

جۆرێکی تری ئاگاداریی زیادکردنی ئاشکرایە کە نمونەیەك لەم جۆرە لە ژمارە ٣٣٧ دا بەم شێوەیە بڵاوکراوەتەوە: ((شەش فەردە توتونی ئێرانی کە عیبارەتە لە ٤٧٩ کیلۆ لە دائیرەی گومرگا مەوجودە، ئەفرۆشرێ، هەرکەس طالیبە بۆ کڕینی مراجەعەت بە دائیرەی گمرگ و مکوی سلێمانی بکات..تاد)) [888].

٤٨. ئاگانامە، مژدەدان:

دیارە بە چەمکە ئاینییەکەی تێڕوانینی-ئاینی بەتایبەتی بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەم ڕۆژنامەیەدا هەیە، بەڵام نەچۆتە خانەی مژدەدانەوە چونکە ئەم ڕەوتە زیاتر لەئاینی مەسیحیدا پەیڕەودەکرێت، ئەوەی لە ڕۆژنامەکەدا وەك مژدەدان بڵاوکراوەتەوە جۆری دووەمی ئەم هونەرەیە کە بۆ مژدەبەخشین بەڕوداو یان بابەتێکی چاوەڕوانکراو لای خوێنەر خراونەتەڕوو، کە خوێنەر بەتەوسەوە چاوەڕێی زانینی دەکات، وەك لەم نمونەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێت کە لەژێر ناونیشانی "مژدە بۆ هەموو ئەهالی لیوای سلێمانی"دا بڵاوکراوەتەوە:

((تەبیبێکی مەشهور، دکتۆر میرزا ئەمیر، لەپاش ئەوەی کە لەچەند ساڵێك لە سوریەو میسرو ئەستانبوڵ و ئەوروپادا بە تەرزی جەدید ئیجرای تەبابەت و تەجاروبی کردووە، حاڵی حازر هاتۆتە سلێمانی....تاد)) [889].

---

[887] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢١: ٤).

[888] بڕوانە: ژیان (ژ٣٧٧: ٤).

[889] بڕوانە: ژیان (ژ٣٣٢: ٣).

٤٩. ئاگانامە، بۆ زانین:

ئاگانامەیەکن کە بێدەستکەوتێکی ماڵیی لەرۆژنامەدا بەمەبەستی ئاشناکردن و ئاگادارکردنەوەی خوێنەران بڵاودەکرێنەوە.

ئەمەی خوارەوەش نمونەیەکە لەم جۆرە لەژێر ناوی "بۆ زانین" دا:

((دیوانی مەحوی کەتا ئێستا نوسخەی بە نیو روپیە ئەفرۆشرا، لەمەودوا نوسخەی بە شەش ئانە لە مەتبەعە ئەفرۆشرێ و بەرامبەر بە قەیسەری نەقیب لای مەلا عەلی سەحافیش دەست ئەکەوێ))[٨٩٠].

جۆرێکی تری بۆ زانین بەم جۆرە نووسراوە:

((هەفتەیەك لەمەوپێش مۆرێکی خۆم کە بە عبارەی "حاجی عەبدوڵا بۆسکانی" هەڵکەندراوە لێم ون بوەو...تاد))[٨٩١].

٥٠. فیلیتۆن:

پێکەنین بەشتی خراپ و زیادەرەوی کردن لە گوزارشتەکاندا بونیاتی ئەم هونەرە پێکدەهێنن، کە پیرەمێرد لێیەوە توانیویەتی ئەم جۆرەش بخاتە رۆژنامەنوسیی کوردییەوە، وەك ئەو فیلیتۆنەی کە لە لاپەرە یەکی ژ ٣٤٣ دا بەناونیشانی "میللەت حسابی ئەوێ" وە نووسیویەتی:

((ساڵەهای ساڵە ئەم میللەتە بۆ موئەسەساتی خەیرییە لە ئەندازەی قورەتی خۆیان زیاد پارە ئەدەن، خوا هیچی بە نسیبی ئیشێکی خێر ناکات. لە زەکاو شیعرو ئەدەبا سلێمانی سەد مەزامیری سلێمانی هەیە، هێشتا مەتبەعەیەکی بۆ نەلوا ئەو ئاسارە نایابانەی پێشوو دانراوە چاپ بکا،....ئەمساڵ هاتین بۆ حروفات، یەك دوو یاریمان بە تیاترۆچییەکان تەرتیب کرد، مایەوە سەر جارێکی تر کە پێشمان تەواوبێ، جارێ تیاترۆ مەنع کرا بۆئەوەی روخسەتیان بۆ

---

[890] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٣: ٤).

[891] بڕوانە: ژیان (ژ٣٧٧: ٤).

وەربگیریٚ، هەولٚ و تەلامان دا لەلای موتەعەسیبەکان ڕسوا بووین کە حاجی تەرویجی تیاترۆ ئەکا....))[892].

٥١. بابەتی سەرگەرمکردن، مەتەلٚ:

ئەم هونەرە یەکێکە لەو هونەرانەی بۆ زاخاودانەوەو بزواندنی بیری خوێنەرو خۆشیی بەخشین پێی زۆرجار چۆتە خانەی هونەرە ڕۆژنامەنوسییەکانەوە، لەو کاتانەشدا کە وەك دەقێکی ستونی یان بە پەخشان نوسراو و لەسەر بنەمای فۆلکلۆریی بنیاتی ناون، ئەوا وەك هونەری مەتەلٚ دەچنەخانەی ئەدەبی فۆلکلۆرییەوە. پیرەمێرد هەر بە بلاٚوکردنەوەی نەوەستاوە، بەلٚکو کۆبۆنی وەلاٚمدانەوەی بۆ وەلاٚمی خوێنەرانیش لەڕۆژنامەکەدا دیاریکردووە کە ئەمەش یەکەم شێوەی لەم جۆرەیە و لەپێش ئەمدا نەبووە[893]. بەلٚێنی ئەوەش دەدات بە خوێنەران کە هەرکەس وەلاٚمی ڕاستی نوسیبیٚ و ناوی لە قورعەکەدا دەربچیٚ بۆماوەی شەش مانگ "ژیان" ی بەخۆڕایی بۆ دەنێررێت.
لەژێر ناونیشانی (مەتەلٚ) دا دەنووسێت:

((کیٚ هەلٚی بێنیٚ بەڕاست و ڕەوان
بە قرعە دەی با شەش مانگی ژیان
مەتەلٚەکەمان ناوی ناحیەیەکی عیراقە، شەش پیتە....تاد))[894].

لەو شیعرەشیان کە دەچێتە خانەی ئەدەبی فۆلکلۆرییەوە، ئەم نموونەیە دەخەینە ڕوو:

((دوو ئاشقەو ماشقە دەست لە ملانن
لەسەر سینەو مەم نەرمو شلانن
بە ڕۆژ پێکەوە دائیم ئەڕازێن
کە شەویان لیٚ هات لەیەك ئەترازێن))[895].

---

[892] بڕوانە: ژیان (ژ٣٤٣: ١) .

[893] بڕوانە: ژیان (ژ٣٣٠: ٤) .

[894] سەرچاوەی پێشوو.

[895] بڕوانە: ژیان (ژ٣٦٧: ١) .

٥٢. بابەتی سەرگەرمکردن، بۆ پێکەنین:

(( "ناکامەکان"

شارباژێڕیی ناکامن، چونکو ئەمساڵ هەوای خۆشەو دارو خەڵوز پارە ناکا، کەس و کاری دوو زاتی گەورە ناکامن کە خزمیان نەهاتن بۆ ئێرە...))[٨٩٦].

ب. بابەتییەکان:

١. هەواڵ، سەردێڕ:

((دوکتور عبدالرحمن عبدالله لە عیادەکەی کەلە گەڕەکی سەرچیمەنە هەموو نەخۆشێ تەماشا ئەکا))[٨٩٧].

٢. هەواڵ، کورتەی هەواڵ:

بەکورتیی خستنەڕوی هەواڵێکە کە یان لەبەرکەمیی زانیارییە دەستکەوتووەکان، یان کەم پەیوەندیی زانیارییەکان بەخوێنەری کوردەوە کورت کراونەتەوەو لەو شێوەیەدا بڵاوکراونەتەوە.

((جەلالەتی شای ئێران کە بە تەریقی گەشت و گوزارو تەوفیقی ئەحواڵی مەمالیکی ئێران لەداخڵی قەڵەمڕەوی خۆیاندا سیاحەتی دەکرد، هاتۆتەوە پایتەخت))[٨٩٨].

٣. وێنەی هەواڵدەر:

لەژێر وێنەکەدا هەواڵەکەی نووسیوە، (( ئەم ڕەسمە هەندێ زابت و عەسکەریی ئەڵمانیایە لەژێر ئاوەوە دەڕوا (غواصە) و پاپۆڕی ئینگلیزی تێکی شکاندووەو نوقمی کردووەو قایغەکەی ڕزگارکردون))[٨٩٩].

---

[896] بڕوانە: ژین (ژ٥٥٧: ٢).

[897] بڕوانە: ژین (ژ٨١٤: ١).

[898] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٤: ٣).

٤. هەواڵ، هەواڵی چاوەڕوانکراو:
ئەم جۆرە لە هەواڵ لەم ڕۆژنامەیەدا دەگمەن و کەمە، ئەمەش بۆ نەبوونی پەیامنێر و سەرچاوەی زانیاریی بەخشی ئەکتیڤ دەگەڕێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیرەمێرد هەوڵیداوە گەر لەسەرئاستی هەواڵە دەرەکییەکانیش نەبێت، لەئاستی هەواڵە ناوخۆییەکاندا هەواڵگەلی لەم جۆرە ئامادە بکات، ئەمەش یەکێکە لەم جۆرە هەواڵە کەلە ژمارە ٣٢٤ دا بڵاوبۆتەوە.
((هەیئەتی تەعلیمیەی مەکتەبی کچانی سلێمانی بۆ تەنمییەی ئەفکاری کچە خوێندەوارەکان تەمسیلێکی عیلمی و ئەدەبییان ڕێك خستووە کە مەوزوعەکەی عائید بە تەحلیلی حاڵەتی ئیجتیماعی نیسوانی ئێرەو مقایەسەی گوزەرانی سائری مەملەکەتانە... لەم هەفتەیەدا تەرتیبی ئەکەن ئینشائەڵڵا ئەمە ئەول قەدەمی خێری کچە خوێندەوارەکانمانە))[٩٠٠].

٥. کاپشن
لەژێر وێنەیەکی زیندوی فۆتۆگرافیدا نووسراوەو ڕاڤەی وێنەکە دەکات: ((ئەمە واپۆرێکی شەڕی ئینگلیزە لە بەحری سپییەوە تۆپ ئەهاوێژێ))[٩٠١].

٦. هەواڵ، لێدوانی هەواڵ:
لێدوان لەسەر هەواڵەکان هونەرێکی کارای ئەم ڕۆژنامەیەیە، لە ژمارە (٣٢١) دا نمونەیەکی زیندوی ئەم هونەرە دەردەکەوێت، ئەویش بۆ قسەکردنە لەسەر کۆچی دوایی بەڕێوەبەری چاپخانەی شارەوانیی کە (حسێن نازم)ە، "ژیان" بەم جۆرە ئەم لێدوانە لەسەر ئەم ڕوداوە کە بووەتە هەواڵ دەنووسێت:

---

[899] بڕوانە: ژین (ژ٥٩٠: ١) پاشکۆی (أ : ٤٣).

[900] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٤: ٤).

[901] بڕوانە: ژین (ژ٥٨٩: ١) پاشکۆی (أ : ٤٤). ئەم وێنەیە یەکەم وێنەی فۆتۆگرافییە لە سەنتەرگیریی سلێمانیدا بڵاودەبێتەوە.

(( زیاعێکی ئەلیم

مودیری مەتبەعە حسین نازم ئەفەندی کە زاتێکی ئەدیب و بەقیمەتی کورد بوو، ئەکسەری حەیاتی لە مەئموریەتی ئیداریدا سەرف کردبوو، چەند ساڵێکیش بوو لە وەزیفەی مودیرێتی مەتبەعەدا بە حوسن نییەت خزمەتی ئەکرد.

شەوی ئەم جمعەی ڕابردووە، سەعات چوارونیوی عەرەبی لە شدەتی کۆکەیەك کە گرتبوی فەجئەتەن وەفاتی کرد.

حەقیقەتەن زیاعی ئەبەدی ئەم زاتە بووبە باعیسی تەئەسوری هەموو ئەهالی وڵاتەکەمان، بنائەن عەلەیهی لەخوای تەبارك و تەعالا تەمەنی ئەکەین کە بە ڕەحمەتی خۆی عەفوی بکات و سەبرو تەسەلا بە عائلەی کەدەر دیدەیان ببەخشێ))[902].

٧. هەواڵ، ڕاپۆرتە هەواڵ:

هونەرێکی دیارو ناوازەی ڕۆژنامەنوسیی ئەم ڕۆژنامەیەیە کە دەربارەی درێژەی ڕوداوەکانی ڕۆژو بۆ خستنەڕووی زیاتری وەڵامی پرسیارە شاراوەکانی ڕووداوێك لەشێوەی ڕاپۆرتە هەواڵدا نووسراون، تا وردتر قسە لەسەر زانیارییەکانی ناو ڕوداوەکە بکرێت.

ئەمەی خوارەوەش نمونەیەکە لەو ڕاپۆرتە هەواڵانە:

((ئەحمەد شەوقی بەگی مدیری مەنتیقەی ئیشغاڵی کەرکوك لەم چەند ڕۆژانەدا هاتە سلێمانی، ڕێگای پێنجوێن لە شەش نوقتەوە دەستیان پێ کردووە، بەڕاستیی تێ دەکۆشن، ئەمڕۆ لە ملەکەوەدا ئیش دەکەن...هتد))[903].

---

[902] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢١: ١) .

[903] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٣: ٣) .

**٨. هەواڵ، چیرۆکە هەواڵ:**

ئەم نموونەیەی خوارەوە نموونەیە بۆ ئەم هونەرە زیندووەی ڕۆژنامەنوسیین کە زۆرجار بوار بۆ دەربڕینی ئەدەبیانەش دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی لەم ڕۆژنامەیەدا بەدیدەکرێت، زاڵبوونی زۆری ئەدەبە بەسەر دەربڕینە ڕۆژنامەنوسییەکاندا، بڕوانە ئەم چیرۆکە هەواڵە کە لەژێر ناونیشانی (مەولودنامە) دا بڵاوکراوەتەوە:

((ئێوارەی جومعەی هەرە ڕابردوو، دەمی ڕۆژئاوا لە ڕۆژئاواوە کزەیەکی شەماڵ هەڵیکرد، فێنکییەکەی لەلایەکەوە بوەستێ، بەبۆنەی بوونی خۆشییەوە دەماغ مەست ئەبوو، دڵ دەگەشایەوە،....تاد))[٩٠٤].

**٩. هەواڵی خێرا:**

هەرچەندە هەفتانەیی ڕۆژنامەکەو زۆرجار دەرنەچوونی لەوادەی خۆیدا وایکردووە هەواڵی لەم شێوەیە کەم بن، بەڵام بەهۆی ئەوەی لەزۆر قۆناغدا هیچ بڵاوکراوەیەکی تر لەناوچەکەدا نەبوون بۆیە لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی وەك ئەمەی خوارەوەدا وەك هەواڵی خێرا ئەژمار دەکرێن.

((بۆ میللەتی یەزیدی لە شاخی سنجاردا، مەجلیسێکی مەخسوس لە ڕوئەسای ڕۆحانی تەشکیل کراوە، کە هەموو دەعوایەکی دینی حەل بکەن))[٩٠٥].

یان دەنووسرێت: ((لەولای موسڵەوە لە عەممادیەو عەقرە ئەوەندە باران باریوە، ئەو پردەی لەسەر ڕێی شیروانی مەزن و مێرگەسورا بووە ئاو بردویە، ئێستا ڕێ بڕانەو هێشتا شەستە بارانە))[٩٠٦].

---

[904] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٢: ٢).

[905] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٠: ٤).

[906] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٤: ٣).

١٠. هەواڵ، هەواڵی درێژ:

(( ڕێگای شەمەندەفەری موسڵ و تەل کوچك کە دوو ساڵە حکومەت دەستی داوەتێ، لەم چەندانەی پێشوودا غەزەتەکان خەبەریان دابوو کە گەیوەتە صابونیە...تاد))[٩٠٧].

١١. هەواڵ، هەواڵی بەردەوام:

ئەم جۆرە لە هەواڵی بۆ ڕومالکردنی ئەو بابەت و ڕوداوانە دەبێت کە کراوەن و گۆڕان لەڕەوتی ڕوداوەکانیاندا هەیەو بە هەواڵێك کۆتاییان نایەت، ئەم ڕۆژنامەیە ئەم جۆرە لە هەواڵیشی شیاوانە بەکارهێناوە، وەك لە هەواڵی بەردەوامی (کۆمپانیای سینگر) دا دەردەکەوێ کەلە لاپەڕە (٣)ی ژیانی ژمارە (٣٢٥)دا بلاوکراوەتەوە بەلام بە کراوەیی هێلراوەتەوە. وەك زنجیربەندی ئەم هەواڵە کراوەیە، بڕگەیەکی تری لە لاپەڕە (٣) ی ژمارە (٣٣٢) ی ژیان و بڕگەی دواتر لە لاپەڕە (٤) ی ژمارە (٣٣٤) دا بلاوکراوەتەوە[٩٠٨].

١٢. هەواڵ، هەواڵی کاریکاتێری:

هەندێ جار لەخانەی تەنز یان ساتیردا دەردەکەوێت وەك ئەم هەواڵە ساتیرییەی لە ژمارە ٤١١ دا بلاوکراوەتەوە:

((م.نوری کۆنە شاعیر یەك دوو ساڵە چیکلدانەی شیعری ون بووە بە پەرۆشی بەشوێنیا ئەگەڕێ...، لە دۆلابی حساباتا لەگەڵ لەخەومای جەمیل سائیب بەیەکەوە لەخەوابوون))[٩٠٩].

ئەم جۆرە بابەتە کاریکاتێرییانە لە ڕۆژنامەکەدا هەن، بەلام هیچ کاریکاتێرێکی وێنەیی لەم ڕۆژنامەیەدا بلاونەکراوەتەوە.

---

907 بڕوانە: ژین (ژ٥٥٦: ٣).

908 بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٥: ٣)، (ژ٣٣٢: ٣)، (ژ٣٣٤: ٤).

909 بڕوانە: ژیان (ژ٤١١: ٢).

١٣. ڕیکلامە هەواڵ:

بڵاوکردنەوەی ڕیکلامێکی بازرگانییە لەشێوەی هەواڵدا تا بڕواو متمانەی زیاتر لە ڕیکلامێکی ئاسایی لای خوێنەر دروست بکات، بانگەشەکردنی ڕۆژنامەکەیە بۆ کالأیەکی دیاریکراو کە لەزۆربارردا ڕۆژنامە لە چۆنێتی و باشی و نرخی ئەو کالأیە جۆرێك لە بەرپرسیارێتی ئەخلاقیی ڕوبەڕوو دەبێتەوە، ئەمەش نموونەیەکی ئەم جۆرە هەواڵەیە کە لەژێر ناونیشانی "باوەشێن لە کۆمپانیای شرکتی سنگری سلێمانی" دا لە ژمارە ٣٢٦ دا بڵاوبۆتەوەو تیایدا هاتووە:

(( لە کۆمپانیای شرکەتی سنگری سلێمانی، باوەشێنی سەرمێزو هی سەقف ١٦ ئینجی کە زۆر مەتین و بێ دەنگ و هەوایەکی سەحیی هەیە کە حیاتی ئینسان ئیحیا ئەکاتەوە و لەگەڵ ئەویشدا قۆی کارەبائی کەمتر سەرف ئەکاو ئەمەش بە تەجرەبە سابیت بووە. بە فیئاتێکی مەقتوع بە نەقدو بە تەقسیت ئەفرۆشرێ...تاد))[910].

١٤. هەواڵ، هەواڵنامە:

هەواڵە بڵاوکراوەکانی ناو "ژیانو ژین" بەزۆری لە گۆشە یان ستونێکدا کۆکراونەتەوەو لەشێوەی هەواڵنامەدا بڕگە بڕگە بڵاوکراونەتەوە، لە هەندێ ژمارەدا لەژێر ناوی (لەم لاو لەو لاوە) دابەزیون، لە هەندێ شوێنی تریشدا لەژێرناوی (دەنگوباسەکانی ناوخۆو دەرەوە) دا بڵاوکراونەتەوەو بە ناوبەندێك یان بۆشاییەك لەیەکتر جیاکراونەتەوە نەك بە ناونیشان.

ئەمەی خوارەوە نمونەیە بۆ هەواڵنامە لەژێر ناونیشانی "لەم لاو لەو لاوە" کە لە ژمارە(٣٢٣)ی ژیاندا بڵاوکراوەتەوە:

((لە پایتەختی بەغدادا نادی ئەلموەزەفین کراوەتەوە... .

[910] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٦: ٤) .

بەلەدی موسڵ دوو سەعاتی چەلپ کردووە لەناو شاردا داینارە بۆ بێ سەعاتان کە بە سەعات دەچنە سەر ئیش...))[911].

۱۵. هەواڵ، دەستپێشخەریی هەواڵ:
هەواڵێکی تایبەت بە ڕۆژنامەکەیە، کە بەر لە هەر ڕۆژنامەیەکی تر بڵاویدەکاتەوە، ئەمەش بە هەواڵێکی بەهاداری ڕۆژنامە دەزانرێت و پشت بە درکی ڕۆژنامەنوسیی و خێرایی بڵاوکردنەوەو ڕاستگۆیی سەرچاوەی زانیارییەکانی دەبەستێت.
وەك ئەم هەواڵە کە وەك دەستپێشخەرییەکی هەواڵ لە ژمارە ۳۲۷ دا بڵاوکراوەتەوە:
((وەکو بە تایبەتی بیسوومانە، جەلالەتی مەلیکی موعەزەم، ئەمسالیش لەم مانگەدا تەشریف دێنن بۆ سلێمانی و ڕەنگە ئەمجارە بەشێنەیی هەوارە کوێستانییەکانی ئێرەیش ببینێ....تاد))[912].

۱٦. ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنوسیی:
گواستنەوەی ڕوداوێکە بۆ خوێنەر بەشێوەیەك کە خوێنەر زانیارییەکی تەواو لەسەر ڕوداوەکە وەربگرێت، ڕاپۆرتی جۆراوجۆر لە ژیان و ژیندا هەن بێ ئەوەی ئەم ناوەیان لێنرابێت، نمونەی ئەم هونەرەش ئەم ڕاپۆرتەیە کەلە ژمارە ٤١٠ دا بڵاوکراوەتەوە لەژێر ناوی "لە محکمەی کوبراوە":
((محکمەی کوبرای کەرکوك لە سلێمانی بە ریاسەتی حاکم عارف بگ تەشکیلی کرد...تاد))[913]، هەندێ جاریش ڕاپۆرتی خێرای لەژێرناوی "گوزارشی ناوخۆمان" دا بڵاوکردۆتەوە، وەك ئەم ڕاپۆرتە خێرایەی لە ژمارە ٤١١ دا بڵاوکراوەتەوە:

---

[911] بڕوانە: ژیان (ژ۳۲۳: ۲-۳).
[912] بڕوانە: ژیان (ژ۳۲۷: ۳).
[913] بڕوانە: ژیان (ژ٤١٠: ٤).

((میرزا عارف ئەفەندی مەئموری ئیستیهلاکی سلێمانی تحویلەن بۆ موتەرجمی قەلەمی محاسبە...تاد))[٩١٤].

١٧. لێدوانی ڕۆژنامەگەریی:
بەیاننامە یان لێدوانێکی ڕەسمیی یان ناڕەسمییە کە لەلایەن کەسێکی ڕاسپێردراو یان بەرپرسەوە ڕەوانەی ڕۆژنامەکە کراوە بۆ بڵاوکردنەوەو گوزارشتکەرە لە دیدی ئەو شوێنەی کە لێدوانەکە دەنووسێت، وەك لەم نمونەیەدا دەردەکەوێت کە لەژێر ناوی "تەبلیغێکی ڕەسمی"دا لە ژمارە ٣٢٨ دا نوسراوەو بۆ دووپاتکردنەوەی ئەمە ڕۆژنامەکە لەژێر ناونیشانەکەیدا نووسیویەتی "ئەوەی لە حکومەتەوە پێمان گەیشتووە":
(( لەم چوار ڕۆژەی دواییدا تا ٢٢ی حوزەیران لەشکری عیراق لە شیروانی مەزنەوە بەرێی هوبادا...ڕوی کردبووە جێ و شوێنی شێخی بارزان...تاد))[٩١٥].

١٨. بەدواداچوون:
((میرزا محەمەد ئەمین خاوەنی دیوانی مەنگوڕ، کتێبێکی بە عینوانی (هەنگاوێك بۆ سەرکەوتن) نوسیوە، لەسەر ئەم کتێبە شەش مانگ محکوم بوو...تاد))[٩١٦].

١٩. گفتوگۆی ڕۆژنامەنوسیی:
گفتوگۆ یان دیداری ڕۆژنامەنوسیی زۆر دەگمەنە لەم ڕۆژنامەیەدا بەڵام لە ژمارەکانی ٧٦١، ٧٦٢، ٧٦٥، دا پیرەمێرد وەك ڕۆژنامەوانێك دەردەکەوێت و دیدارێکی ڕۆژنامەنوسیی بە سێ بەش بڵاودەکاتەوە، بە ناونیشانی "پرسیاری ژین لە سەعادەتی موتەسەریف"
((هەموو ئەزانین کە پێویستە ڕۆژنامە لەخزمەتی رەئی عام و تێگەیاندنی قەومەکەی خۆی بکات و لەبەرئەوەی لەم سەرو دەمەدا هەندێ چشتی واهەبوو کە میللەتەکەمان ئەیویست بۆی دەرکەوێ، ئێمەش هەندێ پرسیارمان لە سەعادەتی موتەسەریف کرد، پرسیارێك لەبابەت چۆنیەتی هاتنی خۆیەوەو چەند پرسیارێکیش لەبابەت مەشاکلی تەموین و صەحەو مەعاریف و....تاد))[٩١٧].

---

[914] بڕوانە: ژیان (ژ٤١١: ٣).

[915] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٨: ٤).

[916] بڕوانە: ژین (ژ٥٧٤: ٤).

[917] بڕوانە: ژین (ژ٧٦١: ١).

٢٠. ڕیپۆرتاژ:

ڕیپۆرتاژ بەگشتیی لەم ڕۆژنامەیەدا دەگمەن و کەمە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەدا چەند بابەتێك بەرچاو دەکەون کە ئەگەر لەگەلّ ئاستی ڕۆژنامەکەو واقیعی کۆمەلاّیەتی و بارودۆخی سیاسی ناوچەکەدا لێکیان بدەینەوە، ئەوا دەشێ وەك ڕیپۆرتاژێکی سەرکەوتوو ناوزەدیان بکەین.

یەکێ لەوانە ڕیپۆرتاژێکی وەسفییە کە پیرەمێرد لەسەردانی کانە نەوتەکانی کەرکوکدا تۆماری کردووەو لە ژمارە ٣٨٤ دا لەژێر ناونیشانی "کانکەی نەوتی کەرکوك"دا بلاّوکراوەتەوە:

((....ئێمە دەستەیێ بووین لە سلێمانیەوە میرزا فەرەجمان بۆ بەغدا ڕەوانە دەکرد و زۆرمان ئارەزوو بوو کە کانکەو کارگەی ئەم نەوتە بەناوو داوە بەچاوی خۆمان ببینین، کاریان ڕاست بێ، وەك کاریان ڕاست بووە شەریکەت پیاوەتیان کردو ڕێیان داین و پیشانیان داین، چوین پیاگەڕاین و دیمان.

جارێ هەر لەناو شارەوە ڕێگایەکی زۆر بەڕێ و جێ و دروست بۆ ئۆتۆمبێل کراوە بەڕێدا لێمان خوڕی....تاد))[٩١٨].

٢١. دیمەن، وێنەی فۆتۆگرافی، وێنەی زیندوو:

بۆ یەکەمجار ئەمجۆرە وێنانە لە ڕۆژنامەنوسیی کوردییدا لەم ڕۆژنامەیەدا بلاّوکراوەتەوە کە لە لاپەڕە (١)ی هەریەك لەم ژمارانەدا هەن و بەکۆی ڕۆژنامەکە تەنها (٩) وێنەی لەم جۆرە بلاّوکراونەتەوە کە دەکەونە ژمارەکانی(٥٨٩، ٥٩١، ٥٩٢، ٥٩٣، ٥٩٥، ٥٩٦، ٥٩٨، ٥٩٩، ٦٠٠)[٩١٩].

[918] بڕوانە: ژیان (ژ٣٨٤: ١-٢).

[919] بڕوانە: ژین (ژ٦٠٠: ١) پاشکۆی ( أ : ٤٥).

٢٢. دیمەن*، وێنەی دەستی:
بۆ یەکەمجار لە ڕۆژنامەکانی سەنتەرگیریی سلێمانیدا لە پێشکەوتنەوە تا بە ژیان دەگات، وێنەیەکی دەستی لە لاپەڕە یەکی ژیانی ژمارە ٣٣٦ دا بە قەبارەی (٣,٥ سم X ١١,٧ سم) لە بابەتی "چی بکەین بۆ پێشکەوتنی منالآنمان"دا بلاوکراوەتەوە کە تیایدا چەند کچ و کوڕە خوێندکارێك دەرکەوتوون لەناو کتێبخانە یان پۆلێکی خوێندنی مۆدێرندا سەرگەرمی خوێندنەوەو کۆششی زانستین[٩٢٠].

٢٣. دیمەن، نەخش:
نەخش یان زەخرەفە جگەلەوەی لەسەرەتاکانی دەرچوونی ژیانەوە دەبنە بەشێك لە لۆگۆی ژیان، بەلأم هەندێ جاریش بۆ ڕازاندنەوەی بابەتەکانی ناو ڕۆژنامەکە بەکارهێنراون بەتایبەتی کە وێنە لە ڕۆژنامەنوسیی ئەو سەردەمەدا دەگمەن و کەم بوون[٩٢١].

٢٤. دیمەن، وێنەی کەسیی:
بۆ کۆچی دوایی "م.عبدولواحد نوری" لەگەڵ ئەو بابەتانەی بۆ کۆچی ئەو نووسراون وێنەیەکی کەسیی م.عبدولواحد نوریش بە گەورەیی دابەزیوە کە یەکەم وێنەی لەم جۆرەیە لە ڕۆژنامەکەدا[٩٢٢]. بەدوای ئەم وێنەیەدا دوا وێنەی لەم جۆرە لە ڕۆژنامەکەدا بلاوبۆتەوە کە وێنەی (عەلی کەمال)[٩٢٣] دەعوەت کراوە بۆ... تاد.

---

* بۆ یەکەمجاریش لەمێژووی ڕۆژنامەنوسیی کوردییدا، هەر پیرەمێرد وێنەی بەکارهێناوەو یەکەم وێنە لەژمارەیەکی ڕۆژنامەی (کورد تەعاون تەرەقی غەزەتەسی) دا لەساڵی ١٩٠٨ دا لە ئەستەمبوڵ بلاوکراوەتەوە، کە پیرەمێرد سەرپەرشتی دەکرد. بەدوای ئەم ڕۆژنامەیەدا وێنە لە گۆڤاری (ڕۆژی کورد) ی ١٩١٣ ی ئەستەمبوڵ و دواتر لە (هەتاوی کورد) ی ئەستەمبوڵدا لە ١٩١٣ دا، لە ساڵی ١٩٢٥ یشدا گۆڤاری (دیاری کودستان) کە لە بەغدا دەرچووە، وێنە بلاوکراوەتەوە.

[920] بڕوانە: ژیان (ژ٣٣٦: ١) پاشکۆی (أ : ٤٦).

[921] بڕوانە: ژیان (ژ٣٣٣: ١).

[922] بڕوانە: ژین (ژ٧٤٩: ١) پاشکۆی (أ : ٤٧).

[923] بڕوانە: ژین (ژ٩٢٢: ١).

**٢٥. ناونیشان، مانشێت:**

**مانشێت لەم ڕۆژنامەیەدا دەگمەن و کەمە، بەڵام ناتوانین بڵێین نییە، نموونەیەکی مانشێت ئەو مانشێتەیە کەلە لاپەڕە١ ی ژ ٣٣٦ دا بڵاوکراوەتەوەو پانیی ڕۆژنامەکەی داگیرکردووەو گوزارشتە لەبایەخی ڕۆژنامەکە بە بابەتەکەی بۆیە لەگەڵیدا وێنەی بڵاوکردۆتەوەو هەموو لاپەڕەکەی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کردووە[٩٢٤].**

**٢٦. ناونیشان، ناونیشانی اسەرەکی:**

**ناونیشانی سەرەکیی لەزۆر شوێندا لەم ڕۆژنامەیەدا بە (سەرلەوحە) ناوبراوە[٩٢٥]، بەشێکی زۆری بابەتەکانی ئەم ڕۆژنامەیە ناونیشانی سەرەکییان بۆ دانراوە بەڵام بێ ئەوەی فۆنت و سایزەکەی جیاوازبێت یان گەورەتر بێت لە فۆنت و سایزی نووسینەکان، بۆئەوەی ناونیشانەکان نەبنە بەشێکی خودی نووسینەکان، پیرەمێرد ئەم گرفتەی لەسەرەتادا بە بۆشایی ئاسۆیی ناونیشانەکان چارەسەرکردووەو لە هەندێ ژمارەی ژیانداو کۆتاییەکانی ژینیشدا هەوڵی داوە بە سایزو فۆنتێکی جیاوازی بەدەست نووسراوی دیار بەتەواوی بیانخاتە قاڵبی ناونیشانی سەرەکییەوە.**

**ئەمانە چەند نموونەیەکی ناونیشانەکانن:**

- **((کۆمپانیای سینگر بۆ فێرکردنی صنعەت مەکتەبێکی کچانی کشاد کردەوە))[٩٢٦].**
- **((مزگێنی دڵ تازەبوونەوەی خوێندەواران))[٩٢٧].**
- **((زاخاوی دڵی میللەتە تەشریفی مەلیکمان))[٩٢٨].**
- **((نەتەوەو زبانی کورد))[٩٢٩].**

---

[924] بروانە: ژیان (ژ٣٣٦: ١).

[925] بروانە: ژیان (ژ٣٣٤: ١).

[926] بروانە: ژیان (ژ٣٢٥: ٣).

[927] بروانە: ژیان (ژ٣٦٤: ١).

[928] بروانە: ژیان (ژ٣٣٣: ١).

٢٧. ناونیشان، ناونیشانی لاوەکی:

ناونیشانە لاوەکییەکان لەژیان و ژیندا دەگمەنن، لەهەندێ شوێندا نەبێت کە وەك ناوازەیەك دەرکەوتوون، ئیتر نین، نموونەی ئەم جۆرە ناونیشانە ئەم ناونیشانە لاوەکیانەیە کەلە ژمارە ٤١٥ دا بلاوکراوەتەوە، کە باسگەلێکی ناو گۆشەی گالتەوگەپن:

((سوری بێباك

غەریبی گەورە

سەر- کلاو))[٩٣٠].

٢٨. ڕاڤەکردن:

خستنەڕوو شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی بابەت یان ڕا، یان کتێبێکە، وەك ئەمەی لە ژمارە ٤٤١ دا بلاوکراوەتەوەو تیایدا لە کتێبی شێخ ڕەزا دەدوێت:

((شیعرو شاعیری وەکو بیستومە زۆر کۆنە، ئێمە شارەزای یۆنانی قەدیم و شاعیرەکانی ئەوروپانین...تاد))[٩٣١].

٢٩.پامفلێت:

ڕۆژنامەکە لە ژمارە ٣٩٥ دا دوو لاپەڕە زیاد دەکات بۆئەوەی ئەو پاشکۆ تەندروستییە بلاوبکاتەوە کە دوو لاپەڕە و نیوی ڕۆژنامەکەی داگیرکردووەو لەژێر ناوی "مجموعەی ئەوامیرو ئیرشاداتی سەحیە بۆ تەئمینی نەزافەت و سیحەتی شاری سلێمانی"دا وەك پامفلێتێکی تەندروستیی پەخشکراوە[٩٣٢].

---

[929] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٦: ١).

[930] بڕوانە: ژیان (ژ٤١٥: ٣).

[931] بڕوانە: ژیان (ژ٤٤١: ١).

[932] بڕوانە: ژیان (ژ٣٩٥: ٢-٣).

٣٠. وەرگێڕان:

مەبەستمان لە هونەری وەرگێڕان وەك هونەرێكی سەربەخۆ لەناو هونەرە ڕۆژنامەنوسیەكانی ئەم ڕۆژنامەیەدا ئەوەیە كە ڕاپۆرتێك یان هەواڵێك یان دەقێكی ڕۆژنامەنوسیی لە زمانێكی ترەوە وەرگێڕدرابێتە سەر زمانی كوردی و وەكو خۆی بڵاوكرابێتەوە، وەك لەم نمونەیەدا كە لە ژمارە ٣٢٥ دا لەژێر ناونیشانی "ئاهەنگی شەوانە كە لەتاراندا بۆ جەلالەتی مەلكی و موعەزەمی ئێمە كراوە"دا بڵاوبۆتەوە، تیایدا هاتووە:

((موخابیری غەزەتەی (المقگم) ئەگێڕێتەوە: بە قدومی موبارەكیی و میوانداری جەلالەتی مەلیكی عیراقەوە لە بیلانی جەلالەتی شای ئێراندا ئاهەنگێكی شوانە ڕێك خرابوو....تاد))[933].

پیرەمێرد دەربارەی وەرگێڕانی ئەم بابەتە لەهەمان ژمارەی ژیانداو لە لاپەڕە دوودا دەنووسیٚ: ((ئێمە ئەم مەقالەیەمان بۆ ئەوە هێنایە سەر زبانی خۆمان لەپێش هەموو شتێكا میوانداری و قدرشماری جلالەتی مەلیكی خۆمانی تیابوو، دووەم ئەمانەویٚ دەركەویٚ كە زبانەكەمان ئەوەندە دەگونجیٚ كە هەرچی پیٚ بنووسی....هتد))[934].

٣١. خزمەتگوزاری ڕۆژنامەنوسی:

ئەم هونەرە هونەرێكی زیندووە، پەیوەندی دەگرێت لەگەڵ خەڵكێكی زۆری دەرەوەی كایەكانی خوێندنەوەش، چونكە پەیوەندی بەژیانی ڕۆژانەو ئەتەكیەتی ژیانەوە هەیە، لە گۆشەی "گوڵە وەچنی" و لە زۆر شوێنی تری ئەم ڕۆژنامەیەدا، چەندین خزمەتگوزاری لەم جۆرە خراونەتەڕو. بۆ نموونە:

---

[933] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٥: ١).

[934] سەرچاوەی پێشوو (٢).

((ئەگەر بتەویٚ گلٚ لەناو گوڵداندا دانیٚی و زۆریش بمیٚنیٚتەوە و سیس نەبیٚ، ئەو ئاوەی دەیکەیتە ناو گوڵدانەکەوە یان هەندیٚ کافور، یان دەنکی ئەسپرینی تیٚکە درەنگ سیس ئەبیٚ...))[٩٣٥].

٣٢. پانۆراما:

وەك ئەوەی پانۆرامای جەنگی جیهانیی دووەم بڵاوکراوەتەوە:

(( بەهۆی بڕانەوەی پیٚنجەمین ساڵی ئەم شەڕەوە، وا موهمترین ڕۆژەکانی ئەم پیٚنج ساڵی ڕابردووە باس ئەکەین...))[٩٣٦].

---

[935] بڕوانە: ژیان (ژ٣٢٢: ١).

[936] بڕوانە: ژین (ژ٧٥٧: ٣).

١- چەشنە ئەدەبییەکان تێکەڵاوی یەکتر دەبن و جۆری نوێ دەهێننەکایەوەو گەشەی ئەدەبیی بەرهەمدەهێنن، چەشنە ڕۆژنامەنووسییەکانیش بەهەمان شێوە، لەم ڕۆژنامەیەدا تێکەڵاوبوونێکی تریش هەیە کە تێکەڵاوبوونی چەشنە ئەدەبیەکانە بە چەشنە ڕۆژنامەنووسییەکان بەشێوەیەك لەهەندێ بابەتدا ڕوبەری بازنەیی تێکەڵاوبوونەکانیان سنوری چەقی بازنە ڕۆژنامەنووسییەکان دەبڕێت. ئەدەب نەك هەر زاڵە لەم ڕۆژنامەیەدا بەڵکو ئامادەیی لە هەموو بابەتە ڕۆژنامەنوسییەکانیشدا هەیە.

٢- بەشێکی زۆری چەشن و جۆرو هونەرە ئەدەبیی و ڕۆژنامەنووسییەکان لەم ڕۆژنامەیەدا بەکارهاتوون، ئەمەش تۆکمەیی ڕۆژنامەکەو ئەزمونگەرێتی خودی پیرەمێرد دەردەخات. پەیوەندیی ئەدەب و ڕۆژنامەنووسیی پەیوەندییەکی جیاکارییانەیە لە فۆڕمدا و پەیوەندییەکی تەواوکارییانەشە لەناوەڕۆکدا، بۆیە ژانرگەلێکی ڕۆژنامەنووسیی زۆر دەبینینەوە کە بە ناوەڕۆکێکی ئەدەبیانە خراونەتەڕوو، زمانی ئەدەب و تێڕوانینی تاکەکەسی بۆ ڕوداوەکان و لێکدانەوەکان زمان و تێڕوانین زاڵەو هەموو بەگشتی لە کەسی (پیرەمێرد) دا کۆبۆتەوەو چەشنە ئەدەبییەکانی ناو ڕۆژنامەکەش لەزۆرباردا تۆماری بزاوتەکانی ڕۆژانەی خەڵك بوون.

٣- ژمارەکانی "٥٨٣" و "٧٠١" ی ژین دەرنەچوون و بەم پێیەش ژمارەی ڕۆژنامەی "ژیان و ژین" تا سەردەمی پیرەمێرد دەکاتە ١٠١٣ ژمارە نەك ١٠١٥.

٤- ڕۆژنامەکە بەتایبەتی لە ژمارە ٥٣٩ بووە بە ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆی خاوەن چاپخانەی تایبەتی خۆی، بۆیە دەشێ بەیەکەم ڕۆژنامەی سەربەخۆ لە کوردستاندا بژمێردرێت و پیرەمێرد یەکەم ڕۆژنامەوان و یەکەم پەیامنێری کوردە کە خۆی بۆ خۆی ڕومالی ڕوداوەکانی لەسەر

شوێنی ڕودانیانەوە تۆمارکردووە. یەکەم وێنە لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا پیرەمێرد لە (کورد تەعاون و تەرەقیی غەزەتەسیی) بلاّویکردۆتەوەو یەکەم وێنەش هەر پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکانی سەنتەرگیریی سلێمانیدا لە ژیاندا بلاّوی کردۆتەوەو لەژمارەکانی ژیندا وێنەی زیندووی ڕۆژنامەنووسیی هێناوەتە بواری ڕۆژنامەنووسیی کوردییەوە. یەکەم گفتوگۆی ڕۆژنامەنووسیی لەمێژوی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا لەم ڕۆژنامەیەدا و لە ژمارەکانی "٧٦١، ٧٦٢، ٧٦٥"دا بلاّوکراوەتەوە.

٥- ڕۆژنامەکە پردی گەیاندنی نەوە ئەدەبیەکانی کوردە بەیەکتر و نەوەی کۆن و هاوچەرخ و نوێی لە ڕۆژنامەکەدا پێکەوە گرێداوەو بە دیوانێکی گەورەو فەرهەنگێکی دەوڵەمەندیی ئەدەبیانەی بەرهەمە ئەدەبیەکانی کوردە لەو قۆناغەداو سامانێکی ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی و کەلتوری بەنرخی نەتەوەکەی پاراستووە. ئەوەی جێی سەرنجە لەگەڵ ئاشنایەتیی پیرەمێرد بە ئەدەبی کوردیی لە ڕۆژهەلاّت و باکوری کوردستاندا، بەلاّم تەنها بابەتێکی نوسەرو شاعیرانی ڕۆژهەلاّت و باکورو تەنانەت خۆرئاوای کوردستانیش لە ڕۆژنامەکەدا نابینرێتەوە، تەنها هەندێك دەقی مەلای جزیری نەبێت کە پیرەمێرد خۆی بلاّویکردونەتەوە.

٦- هەموو ئەو زانیارییانەی لەسەر مێژووی ئەم ڕۆژنامەیە نووسراون لە بنەمای لاپەڕە ئۆرگیناڵەکانی ڕۆژنامەکەدا ڕاستکراونەتەوە.

٧- سانسۆری حکومیی و هەژموونی ئەو سانسۆرە بەسەر ڕۆژنامەکەوە تەنها بابەتە سیاسی یان نیمچە سیاسی و نەتەوەییەکانی گرتۆتەوەو دەشێ قۆناغی پیرەمێرد بە قۆناغی زێڕینی ڕۆژنامەی "ژیان" بزانرێت. تیراژی ڕۆژنامەکە دیارنییە بەلاّم بە فرۆشتنی ئەوساو مانەوەی لەئێستادا بێت، تیراژێکی کەم و دیاریکراوی لێ چاپکراوەو ژمارەیەکی کەمیشی لێ فرۆشراوە. هەڵەی چاپ لەهەموو ژمارەیەکدا هەیە، بەشێك

لەژمارەکانی ڕۆژنامەکەش لە ژمارەو ساڵ و مانگ و ڕۆژ و ڕۆژی دەرچوونیدا هەڵەی زەقی تیاکراوە. بابەتگەلێك هەن لەم ڕۆژنامەیەدا چەندجارێك بڵاوکراونەتەوە، ئەوانەش بەشێکیان دەقاودەق وەکویەك بڵاوکراونەتەوە بێ ئەوەی ئاماژەیان پێ بکرێت، بەشێکیشیان بە ناوەڕۆك چەند بارەبوونەتەوە.

٨- بەشی هەرەزۆری هەموو بابەتەکانی ڕۆژنامەکە نووسینی خودی پیرەمێرد خۆین، بەتایبەتی هەموو بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان پیرەمێرد خۆی نووسیونی و یان دایڕشتونەتەوە. لەگەڵ ئەوەدا زۆرترین نووسەرانی کورد بۆ یەکەمجار لەم ڕۆژنامەیەدا بەشدارییان کردووە کە ژمارەیان لە سەد کەس نزیك دەبێتەوەو زۆرێك لە نووسەرە دیارەکانی کوردستانیش یەکەم بەرهەمی ئەدەبیی خۆیان لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاوکردۆتەوە.

٩- ڕۆژنامەکە لەسلێمانی دەرچووە، بەڵام هەندێ لە ژمارەکانی گەیشتوونەتە شوێنەکانی تری کوردستان و لە کوت و حلەش بڵاوبوونەتەوەو لەڕێی پەیوەندیی تۆکمەی ڕۆژنامەکەش بە گۆڤاری گەلاوێژەوە زۆربەی ژمارەکانی گەیشتونەتە بەغدا.

١٠-دەشێ ژیان بە چوار ڕۆژنامە بزانین لەڕۆژنامەیەکدا چونکە سیاسەتی ڕۆژنامەکە لەو چوار قۆناغەی پێیدا تێپەڕیوە تەواو جیاواز بوون لەیەکتر، سیاسەتی ڕۆژنامەش بەر لەناوەکەی جۆری ڕۆژنامە دیاریدەکات. دواتریش کە "ژیان" دەبێتە "ژین" جارێکی تر ئاراستەی ڕۆژنامەکە دەگۆڕێ، بۆیە دەشێ "ژیان و ژین" وەك یەك ڕۆژنامەی کۆکراوەی چەند ڕۆژنامەیەك بناسین.

## سەرچاوە کوردییەکان:


- ئەحمەد تەوکلی (٢٠٠٥)، ڕاپۆرتی ڕۆژنامەنووسی، وەرگێڕانی: مەجید ساڵح: www.kurdistannet.org.
- ئەرسەلان بایز ئیسماعیل (٢٠٠١)، ڕاگەیاندنی شۆڕش و بزوتنەوەی شیعری کوردی" نامەی ماستەر"، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی.
- أمور خبر برون مرزی (٢٠٠٦)، هەواڵنوسین، نوسینی بەشی کاروباری هەواڵی دەرەکی، کۆماری ئیسلامیی ئێران، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: بەهادین محەمەد، سلێمانی.
- ئومێد ئاشنا (١٩٩٨)، پیرەمێردی ڕۆژنامەنوس، لە یادی سەد ساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردییدا، سلێمانی.
- ئومێد ئاشنا (٢٠٠١)، پیرەمێردو پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.
- ئومێد مەسعودی (٢٠٠٥)، بنەماکانی نوسین لە ڕاگەیاندندا، وەرگێڕانی: جوامێر مارایی، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبیی و ڕوناکبیریی گەلاوێژ ژمارە (٦٩)، سلێمانی.
- ئیحسان فوئاد (٢٠٠٠)، سەوداو سنور، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: گۆران ئەژی گۆران، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی.
- ئیحسان فوئاد(٢٠٠٥)، وانەکانی خوێندنی باڵا " ماستەر"، وانەی چیرۆک، کۆرسی یەکەم، کۆلیژی زمان، زانکۆی سلێمانی.
- ئیدریس عەبدوڵا (٢٠٠٣)، جوانکاریی لە ئەدەبی کوردییدا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (٢٣٥)، سلێمانی.
- بۆدهۆڵ (٢٠٠١)، هەڵەبجە، وەرگێڕانی: ئیحسان فوئاد، نوسینەوەی: هەڤاڵ ئەبوبەکر، شیعرستان ، ژمارە (٦)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.

- پەندەکانی پیرەمێرد (١٩٩٥)، بەرگی دووەم، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی: فائق هوشیار-محمود احمد محمد-مستەفا ساڵح کەریم-محمد نوری توفیق-احمد زرنگ مستەفا، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا.
- پەندەکانی پیرەمێرد (١٩٩٥)، بەرگی یەکەم، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی: فائق هوشیار-محمود احمد محمد-مستەفا ساڵح کەریم-محمد نوری توفیق-احمد زرنگ مستەفا، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا.
- پەندەکانی پیرەمێرد (١٩٩٦)، بەرگی سێیەم، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی: فائق هوشیار-محمود احمد محمد-مستەفا ساڵح کەریم-محمد نوری توفیق-احمد زرنگ مستەفا، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا.
- جەبار جەباری (٢٠٠٢)، کۆی بەرهەمە کوردییەکانی نوسەری شەهید جەبار جەباری، کۆکردنەوەو لەسەرنوسینی: سمکۆ جەباری، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە ژمارە (٥٦)، سلێمانی.
- جەبار قادر (٢٠٠٥)، ژنانی کورد لە مێژوودا: www.hetawikudistan.it.
- جەمال خەزنەدار (١٩٧٣)، ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی، بەغدا.
- جەمال خەزنەدار (١٩٧٩)، لاپەڕەیەکی بێگەرد لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە (٥٦)، بەغدا.
- حەمە ساڵح فەرهادی (١٩٨٨)، چەند لایەنێکی ڕۆژنامەنووسی ی کوردی، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا.
- حەمە کەریم هەورامی (٢٠٠١)، درامای کوردی لە ناو درامای جیهاندا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.

- حسين پاينده (٢٠٠٣)، تيۆری ڕۆمان، وەرگێڕانی: محەمەد كەريم، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم ژمارە (٢٠٧)، سلێمانی.
- حسين عارف (١٩٧٧)، چيرۆكی هونەری كوردی ١٩٢٥-١٩٦٠، دەزگای ڕۆشنبيری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی، بەغدا.
- خاڵە حەمە فەرەج (٢٠٠٦)، بەڕێوەبەری ئەرشيڤی نەتەوەيی، ٢٠٠٦/٨/١.
- خورشيد ڕەشيد ئەحمەد (١٩٨٩)، ڕێبازی ڕۆمانتيكی لە ئەدەبی كورديدا، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای ڕۆشنبيری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی ژمارە (٢٣٤)، بەغدا.
- دانا عەلی سەعيد (٢٠٠٣)، هونەری نوسينی دراماو دەقی شانۆی خۆماڵی، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم ژمارە (٢٣٦)، سلێمانی.
- دايانا داوبتغاير (١٩٨٢)، ڕۆمان‌و پيشەی نووسينی ڕۆمان، وەرگێڕانی: ئەژی گۆران، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای ڕۆشنبيری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی، بەغدا.
- دڵشاد عەلی (١٩٩٨)، بنياتی هەڵبەست لە هۆنراوەی كوردی دا "نامەی ماستەر"، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی.
- دڵشاد عەلی (٢٠٠٥)، وانەكانی خوێندنی باڵا " ماستەر"، وانەی ڕەخنەی ئەدەبیی، كۆرسی يەكەم، كۆليژی زمان، زانكۆی سلێمانی.
- ديوانی پيرەمێرد (١٩٩٠)، بەرگی يەكەم، كۆكردنەوەو ساغ كردنەوەی: فائق هوشيار-محمود احمد محمد-مستەفا ساڵح كەريم-محمد نوری توفيق-احمد زرنگ مستەفا، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای ڕۆشنبيری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی ژمارە (٢٦٤)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا.

- دیوانی پیرەمێرد (۲۰۰۱)، بەرگی دووەم، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی: فائق هوشیار-محمود احمد محمد-مستەفا ساڵح کەریم-محمد نوری توفیق-احمد زرنگ مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنیی و ڕاگەیاندنی خاك، سلێمانی.
- دیوانی پیرەمێرد (۲۰۰۱)، بەرگی سێیەم، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی: فائق هوشیار-محمود احمد محمد-مستەفا ساڵح کەریم-محمد نوری توفیق-احمد زرنگ مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنیی و ڕاگەیاندنی خاك، سلێمانی.
- ڕۆجەر فولەر (۱۹۹۹)، ئەدەب چییە؟ وەرگێڕانی: شاهۆ سەعید: .www.sardam.info
- ڕەزا حاجی ئابادی (۲۰۰٤)، مانشێتنوسی، وەرگێڕانی مەلا بەهادین، گۆڤاری ڕایەن، ژمارە (۱۱).
- ڕەزا حاجی ئابادی (۲۰۰٥)، دەروازەی ڕۆژنامەنووسی، وەرگێڕانی: کارزان محەمەد، کتێبی گیرفان (٦٤)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.
- ڕەفیق ساڵح ئەحمەد (۲۰۰۲)، بیبلۆگرافیای ڕۆژنامەنوسیی کوردی لە شاری سلێمانی ۱۹۲۰-۱۹۹۰، لە بڵاوکراوەکانی هەفتەنامەی سلێمانی نویٚ ژمارە (۱)، سلێمانی.
- ڕەفیق ساڵح- سدیق ساڵح (۲۰۰۲)، ڕۆژنامەی ژیان ژمارە (۱-۸۱)، یەکەم بەرگ، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە ، سلێمانی.
- ڕەفیق ساڵح- سدیق ساڵح (۲۰۰۳)، ڕۆژنامەی ژیان ژمارە (۸۲-۲۵۹)، دووەم بەرگ، لە بڵاوکراوەکانی شارەوانی سلێمانی.
- ڕەفیق ساڵح- سدیق ساڵح (۲۰۰٤)، ڕۆژنامەی ژیان ژمارە (۲٦۰-۳۲۰)، سێیەم بەرگ، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی.

- ڕەفیق ساڵح- سدیق ساڵح (٢٠٠٥)، ڕۆژنامەی ژیان ژمارە (٣٢١-٤٠٠)، چوارەم بەرگ، بەشی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی.
- ڕەووف حەسەن (١٩٩٩)، ئەلفاو بێتای ڕۆژنامەگەریی، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی.
- زاهیر لەتیف (٢٠٠٦)، سەرۆکی بەشی عەرەبی، کۆلیژی زمان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٦/٤/٥، چاوپێکەوتن.
- سەعید ناکام (١٩٧٠)، چەند بیرەوەرییەك لە ڕۆژانی ئیشکردنم لەگەڵ پیرەمێردی نەمردا، ڕۆژنامەی "برایەتی"، ساڵی یەکەم، خولی دووەم، ژمارە ٢، تەموز.
- س.ع. شادمان (١٩٨٨)، ئاهەنگی بیستەمین ساڵەی ڕۆژنامەی ژین چۆن کرا لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٦، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٦٣)، هەولێر.
- سوزان دان (٢٠٠١)، شێوازەکانی هەڤپەیڤینی ڕۆژنامەوانی، چاپی دووەم، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: بەدرەدین ساڵح-فاتیمە حوسێن پەناهی، لە بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر.
- سیامەند هادی (٢٠٠٤)، مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆمان، لێکۆڵینەوە، سلێمانی.
- سلێمان حەیدەر پور دەعوایسرا (٢٠٠١)، پانۆڕامای کاری ڕۆژنامەوانیی لە بەریتانیا، بەشی یەکەم، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: عەبدولقادر ساڵح، گۆڤاری ڕایەن، ژمارە (١).
- شکریە رسول (١٩٨٧)، زمان و ئەدەبی کوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر.

- شوكريه رسول (١٩٨٩)، ئەدەبی كوردیو هونەرەكانی ئەدەب، چاپخانەی خوێندنی باڵا، زانكۆی سەلاحەدین، هەولێر.
- شێخ محەمەدی خاڵ (١٩٦٤)، فەرهەنگی خاڵ، جزمی٢، چاپخانەی كامەران، سلێمانی.
- شێخ محەمەدی خاڵ (١٩٧١)، پەندی پێشینان، بەغدا.
- عبدالرزاق بیمار (١٩٩٨)، پەخشانی كوردی، لە بڵاوكراوەكانی دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوكردنەوەی كوردی ژمارە (٣١٤)، بەغدا.
- عبدالصمد اسلام طه دوسكی (٢٠٠١)، ڕەنگدانەوەی ئەدەب لە گۆڤاری هاواردا ١٩٣٢-١٩٤٣، زانكۆی سەلاحەدین، كۆلیجی ئاداب، بەشی زمانی كوردی.
- عەبدوڵڵا زەنگەنە (٢٠٠٠)، ژیانەوە شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی كوردیدا ١٩٢٤-١٩٢٦، دەزگای چاپو بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر.
- عەزیز گەردی (١٩٨٧)، پەخشانی كوردی، زانكۆی سەلاحەدین، كۆلیژی ئەدەبیات، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەدین، هەولێر.
- عەزیز گەردی (١٩٩٩)، كێشی شیعری كلاسیكیی كوردی، چاپی یەكەم، وەزارەتی ڕۆشنبیری، ژمارە (٨٠)، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر.
- عەلائەدین سەجادی (١٩٥١)، یادی پیرەمێرد، چاپخانەی معارف، بەغدا.
- عەلائەدین سەجادی (١٩٦٧)، ئەدەبی كوردیو لێكۆڵینەوە لە ئەدەبی كوردی، بەغدا.
- عەلائەدین سەجادی (١٩٧١)، مێژووی ئەدەبی كوردی، چاپی دووەم، بەغدا.

- عەلائەدین سەجادی (٢٠٠٠)، مێژووی پەخشانی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس ژمارە (١٨٢)، هەولێر.
- عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٠)، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا.
- عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (١٩٧٩)، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم، زانکۆی سلێمانی، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی.
- عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ (٢٠٠٥)، وانەکانی خوێندنی باڵا "ماستەر"، وانەی تیۆری ئەدەب، کۆرسی یەکەم، کۆلیژی زمان، زانکۆی سلێمانی.
- فاروق عەلی عومەر (٢٠٠١)، ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عیراقدا بەراییەکان ١٩١٤-١٩٣٩، وەرگێڕانی: تاریق کارێزی، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر.
- فاروق عەلی عومەر (٢٠٠٥)، کلیلی دەسەڵاتی چوارەم، وەرگێڕانی: هیوا ساڵح ئەحمەد، بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان، سلێمانی.
- فازڵ مەجید مەحمود (٢٠٠٤)، شیعری مناڵان لە ئەدەبی کوردییدا "نامەی دکتۆرا"، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم ژمارە (٢٨٨)، سلێمانی.
- فەرهاد پیربال (٢٠٠٢)، مێژووی وەرگێڕان لە ئەدەبی کوردییدا، زنجیرەی بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی (١٠)، هەولێر.
- فەرهاد پیربال (٢٠٠٤)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.
- فریبا سەیاد- عەلی ئەکبەر فەرهەنگی (٢٠٠٦)، نەریتی ڕۆژنامەوانی، وەرگێرانی لە فارسییەوە: کارزان محەمەد، لە

بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی چاپو بڵاوکردنەوە ژمارە (٤٤٥)، سلێمانی.

- قوباد ڕەسوڵ (٢٠٠٦)، بەشێك لە بنچینە سەرەتاییەکانی زانستی ڕۆژنامەگەریی، وەرگێڕان لە ئەڵمانییەوە، پێداچونەوەو داڕشتنەوەی: هەڤاڵ ئەبوبەکر، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی چاپو بڵاوکردنەوە ژمارە (٤٤٦)، سلێمانی.

- ڤلادیمیر سیمیۆنیڤ (٢٠٠٣)، ڕۆژنامەوانی، وەرگێڕانی لە بولگارییەوە: بەختیار ڕەوف، گۆڤاری ڕایەن، ژمارە (٩-١٠).

- کۆرتیس ماکدۆگاڵ (٢٠٠٥)، بنەماکانی هەواڵنوسین، وەرگێڕانی: هەندرێن شێرزاد، پێداچونەوەو داڕشتنەوەی: هەڤاڵ ئەبوبەکر، لە بڵاوکراوەکانی بەشی چاپو بڵاوکردنەوەی ڕادیۆ نەوا، سلێمانی.

- کمال ڕەووف محەمەد (١٩٩٠)، ڕۆژنامەی ژیان، ڕۆژنامەی ئاسۆ، ژمارە (٣٤)، بەغدا.

- کمال ڕەووف محەمەد (١٩٩٦)، یەکەمین قوتابخانەی کیژانی سلێمانی، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (١٣٠٧).

- کەماڵ فوئاد (٢٠٠٠)، کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨-١٩٠٢، پێشەکی: فەرهاد پیرباڵو مەلا بەختیار، چاپی یەکەم، چاپخانەی داناز، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبیی و ڕوناکبیریی گەلاوێژ، سلێمانی.

- کەمال مەزهەر ئەحمەد (١٩٧٨)، تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

- کەمال مەعروف (٢٠٠٣)، ئەدەبیاتی کلاسیکیو نوێخوازی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە ژمارە (٢٠٦)، سلێمانی.

- کەمال مەمەند میراودەلی (١٩٧٩)، فەلسەفەی جوانیو هونەر، لە چاپکراوەکانی زانکۆی سلێمانی، سلێمانی.
- مالکوڵم ئێف مالیتی (٢٠٠٣)، هاوڕێی ڕۆژنامەنوسان، لە بڵاوکراوەکانی کۆمیتەی جیهانیی ڕۆژنامەگەریی ئازاد، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئازاد حەسەن فەتاح، پێداچونەوەو داڕشتنەوەی: هەڤاڵ ئەبوبەکر، سلێمانی.
- مالمیسانژ (٢٠٠٧)، جەمعییەتی تەعاونو تەرەقیی کوردو ڕۆژنامەکەی، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: زریان ڕۆژهەلاتی، پێداچوونەوەی: سدیق سالح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، زنجیرە(٥٦)، سلێمانی.
- مەغدید سەپان (٢٠٠٥)، ژانرەکانی ڕۆژنامەوانییو مێژووی چاپخانە ١٤٥٠-١٥٠٠، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کوردستان، هەولێر.
- مەلا عەبدوڵلای زێوەر (١٩٨٥)، گەنجینەی مەردانو یادگاری ڕۆژانی دەربەدەری، ساغکردنەوەو ئامادەکردنی: محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا.
- مجید محمود مطلب (١٩٧٨)، شیعرو فەلسەفە، وەرگێڕانی: فوئاد مەجید میسری، چاپخانەی عەلاء، بەغدا.
- محەمەد بەکر (٢٠٠٤)، پەخشانە شیعری کوردی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.
- محەمەد دلێر ئەمین میسری (٢٠٠٢)، ڕۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ لە گەشەسەندنو پێشخستنی ئەدەبی کوردییدا "نامەی ماستەر"، لە بڵاوکراوەکانی بەڕیوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە ژمارە (٢٤٣)، سلێمانی.
- محەمەد دلێر ئەمین میسری (٢٠٠٤)، ڕۆژنامەنووسیی کوردیو بزوتنەوەی ئەدەبی لە سایەی یەکەمین دەسەلاتی سیاسیی کورددا لە

مێژووی هاوچەرخدا ١٩٢٢- ١٩٢٤"نامەی دکتۆرا"، لە چاپکراوەکانی شارەوانی سلێمانی، زنجیرەی ژمارە (٣٨)، سلێمانی.

- محەمەد دلێر ئەمین میسری (٢٠٠٦)، ڕاگری کۆلیژی زمان، زانکۆی سلێمانی، چاوپێکەوتن.

- محەمەد فەریق حەسەن (١٩٩٨)، دەسەڵاتی چوارەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر.

- محمد رسول هاوار (١٩٧٠)، پیرەمێردی نەمر، چاپخانەی (العانی)، بەغدا.

- محەمەدی مەحوی (٢٠٠٣)، زمان و زمانەوانیی لە ڕۆژنامەگەرێتیدا، گۆڤاری ڕایەن، ژمارە(٧و٨).

- محەمەد مەعروف فەتاح (٢٠٠٥)، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین ، چاوپێکەوتن.

- مستەفا ساڵح کەریم (٢٠٠٦)، جێگری نەقیبی سانديكای ڕۆژنامەنوسانی کوردستان و جێگری سەرنوسەری ڕۆژنامەی ( الأتحاد)، ٢٠٠٦/٧/١٢ ،چاوپێکەوتن.

- مستەفا نەریمان (١٩٨٤)، فەرهەنگی ئەدیب و نووسرانی کورد، بەغدا.

- موحسین ئەحمەد عومەر (٢٠٠٥)، فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.

- نەژاد عەزیز سورمێ (١٩٩٩)، ڕۆژنامەگەریی کوردی چەند سەرەقەڵەمێك لە بارەی تەکنیك و هونەرەکانی، چاپی یەکەم، کتێبی برایەتی (٣)، هەولێر.

- نەوزاد عەلی ئەحمەد (٢٠٠٥)، هونەرەکانی ئەدەب لە ڕۆژنامەگەریی نهێنی کوردیدا ١٩٦١- "نامەی ماستەر"١٩٩١، کتێبی ڕوناکبیری ژمارە (٤٩).
- نەوشیروان مستەفا ئەمین (١٩٩٩)، خولی ٢٠٠٠ی کوردستانی نوێ، هۆڵی ڕوناکبیری، سلێمانی.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠١)، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی ١٨٩٨-١٩١٨، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (١٣٤)، سلێمانی.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢أ)، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی ١٩١٨-١٩٣٨، بەرگی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە ژمارە (١٣٣)، سلێمانی.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین (٢٠٠٢ب)، ژیان بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی ١٩٣٦-١٩٣٨، ، لە بڵاوکراوەکانی هەفتەنامەی سلێمانی نوێ ژمارە (٤)، سلێمانی.
- هەڤاڵ ئەبوبەکر (١٩٩٧)، چەند هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیاندن، ڕۆژنامەنوسیی، پڕوپاگەندەو ڕای گشتیی، چاپی دووەم، چاپخانەی هەواڵ، سلێمانی.
- هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٢)، لەنێوان ئەدەب و ڕۆژنامەگەرییدا، گۆڤاری ڕایەن، ژمارە (٤-٥).
- هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٢أ)، ڕۆژنامەوانیی لە سەردەمی جیهانگەرییدا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (١٩٥)، سلێمانی.
- هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٢ب)، ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی کوردی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیر لە سلێمانی.

- هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٥)، زمان و پراکتیزەکردنی لە ڕۆژنامەوانییدا، بابەتگەلێکی تایبەت بەزمانی ڕاگەیاندن، سلێمانی.
- هەڤاڵ ئەبوبەکر (٢٠٠٥)، کوردش میدیا، پیرەمێردو ڕۆژنامەگەریی: www.kurdishmedia.com.
- هیمداد حوسێن (١٩٩٨)، ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، هەولێر.
- وریا جاف (١٩٩٨)، کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردی، کتێبی گوڵان ژمارە (١٩)، هەولێر.
- یۆئیل یوسف عەزیزو هاوەڵەکانی (١٩٨٤)، وەرگێڕانی ئەدەبی، وەرگێڕانی: غازی فاتیح وەیس، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیژی ئەدەبیات، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر.

## سەرچاوە عەرەبییەکان:

- أ. ب. فولكيس (١٩٨٦)، الأدب و الدعاية، ترجمة: موفق الحمداني، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- إبراهيم إمام (١٩٩١)، دراسات في الفن الصحفي، مكتبة الأنجلو المصرية، القاهرة.
- أحمد عطية الله (١٩٦٨)، القاموس السياسي، دار النهضة العربية، القاهرة.
- أديب خضور (١٩٨٢)، الخبر الصحفي، مطابع دار البعث، ديمشق.
- أديب خضور (١٩٩٠)، النظرية العامة في الصحافة، المكتبة الإعلامية، الطبعة الأولى، مطبعة العجلوني، دمشق.
- أديب خضور (٢٠٠٠)، مدخل الى الصحافة نظرية و ممارسة، الطبعة الثانية، المكتبة الإعلامية، دمشق– سوريا.
- آرنولد كيتل (١٩٧٧)، مدخل الى الرواية الأنكليزية، مجلد ١، ترجمة: هاني الراهب، وزارة الثقافة، دمشق.

- إسماعيل إبراهيم (١٩٩٨)، فن التحرير الصحفي بين النظرية و التطبيق، دار الفجر للنشر ة التوزيع، القاهرة.
- إسماعيل إبراهيم (٢٠٠١)، فن المقال الصحفي، الطبعة الأولى، دار الفجر للنشر و التوزيع، القاهرة.
- ألبرت ل. هستر (١٩٨٨)، دليل الصحفي في العالم الثالث، ترجمة: كمال عبدالرؤف، دار العربية للنشر و التوزيع، القاهرة.
- ألسكندر بلوك (١٩٧٧)، دراسات أدبية و فكرية، ترجمة: يوسف الحلاق، منشورات وزارة الثقافة و الأرشاد القومي، دمشق.
- ألفين وهايدى توفلر (١٩٩٨)، أشكال الصراعات المقبلة– حضارة المعلوماتية و ما قبلها، تعريب: صلاح عبدالله، دار الأزمنة الحديثة، بيروت– لبنان.
- أميل بوافان (١٩٤٩)، تأريخ الصحافة، ترجمة: محمد اسماعيل محمد، الدار المصرية للطباعة والنشر.
- بشير عباس العلاق (١٩٩٨)، الترويج و الأعلان – مدخل متكامل، الطبعة الأولى، دار اليازوري العلمية، عمان – الأردن.
- بيار ألبير (١٩٧٠)، الصحافة، ترجمة: محمد بروجاوى، منشورات عديدات، بيروت– لبنان.
- تزفيطان تودوروف (١٩٧٢)، الأجناس الأدبية، ترجمة: جواد الرامي.
- توفيق الحكيم (١٩٧٣)، فن الأدب، دار الكتاب اللبناني، بيروت.
- تيري إيجليتون (١٩٩٧)، مقدمة في نظرية الأدب، ترجمة: أحمد حسان، الطبعة الثانية، نوارة للترجمة و النشر.
- تيسير أبو عرجه (١٩٩٩)، الصحافة المعاصرة، دار الكتب الجامعي، الأمارات المتحدة.
- جابر عصفور (١٩٩٩)، زمن الرواية، القاهرة– مصر.

- جاكوب كورك (١٩٨٩)، اللغة في الأدب الحديث (الحداثة والتجريب)، ترجمة: ليون يوسف و عزيز عمانوئيل، دار المأمون للترجمة والنشر، بغداد.
- جان بول سارتر (١٩٩٠)، ما الأدب، ترجمة وتقديم و تعليق: محمد غنيمي هلال، مطابع نهضة مصر، الفجالة– القاهرة.
- جان جبران كرم (١٩٩٢)، مدخل الى لغة الإعلام، طبعة ثانية منقحة، دار الجيل، بيروت.
- جان ماري شيفير (١٩٩٧)، ما الجنس الأدبي، ترجمة: غسان السيد، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، مدشق– سوريا.
- جلال الدين الحمامصي (١٩٩٣)، المندوب الصحفي، دار المعارف، القاهرة.
- جنكيزايتماتوف (١٩٨١)، الأتجاهات التقدمية في الأدب، الأدب و قضايا العصر، ترجمة: عادل العامل، مجموعو مقالات النقدية، منشورات وزارة الثقافة و الإعلام، الجمهورية العراقية.
- جهاد عطا نعيسة (٢٠٠١)، في المشكلات السرد الروائي، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق– سوريا.
- جورج ماري (١٩٩٢)، السيرة الذاتية، تعريب: محمد القاضي و عبدالله صولة، بيت الحكمة، قرطاج– تونس.
- جون ر. بيتنر (١٩٩٠)، مقدمة في الأتصال الجماهيري، الطبعة الرابعة، مركز كتب الأردني.
- جون ل. هاتلنج (بلا)، أخلاقيات الصحافة، ترجمة: كمال عبدالرؤف، الدار العربية للنشر والتوزيع، الطبعة العربية الأولى، القاهرة.
- جون هوهنبرك (١٩٦٠)، الصحفي المحترف، ترجمة: فؤاد مويساني، المؤسسة الأهلية للطباعة والنشر، بيروت.

- حسني نصر، سناء عبدالرحمن (٢٠٠٤)، التحرير الصحفي في عصر المعلومات (الخبر الصحفي)، الطبعة الثانية، دار الكتاب الجامعي، العين- الأمارات العربية المتحدة.
- حسين محمد فهيم (١٩٨٩)، أدب الرحلات، عالم المعرفة (١٣٨)، المجلس الوطني للثقافة والفنون والآداب، الكويت.
- حنا عبود (١٩٩٧)، فصول في علم الأقتصاد الأدبي، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، مدشق- سوريا.
- حنا عبود (١٩٩٩)، مسوغات النظرية الأدبية الحديثة، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، مدشق- سوريا.
- حنا عبود (٢٠٠٢)، من تأريخ الرواية، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، مدشق- سوريا.
- حيدر حسون الفزع (٢٠٠٥)، كيف تصبح صحفيا، الجزء الأول، نقابة الصحفيين العراقيين، رابطة الصحفيين الشباب، بغداد.
- د. أ. بورتيسكي (١٩٩٠)، الصحافة التلفزيونية، ترجمة: أديب خضور، المكتبة الإعلامية (٣)، الطبعة الأولى، دمشق- سوريا.
- د. تودوروف (١٩٩٠)، تأريخ الصحافة العالمية، ترجمة: أديب خضور، الطبعة الأولى، المكتبة الإعلامية، دمشق- سوريا.
- داينيل- هنرى باجو (١٩٩٧)، الأدب العام و المقارن، ترجمة: غسان السيد، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق- سوريا.
- رؤوف وصفي (١٩٩٠)، أدب الخيال العلمي، الموسوعة الصغيرة (٣٧٤)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- رامان سلدن (١٩٩٨)، النظرية الأدبية المعاصرة، ترجمة: جابر عصفور، الطبعة الأولى، دار قباء، القاهرة.

- روبيرت ل. هيلييرد (٢٠٠١)، الكتابة للتلفيزيون و الأذاعة و وسائل الأعلام الحديثة، ترجمة: مؤيد حسن فوزي، دار الكتاب الجامعي، العين، الأمارات العربية المتحدة.
- روجر آدن (١٩٩٧)، الرواية العربية، ترجمة: حصة ابراهيم المنيف، المجلس الأعلى للثقافة، مصر.
- روجر فولر (١٩٩٩)، موسوعة الأدب و النقد- الأدب، تقديم وترجمة و تعليق: عبدالحميد شيحة، الجزء الأول، المجلس الأعلى للثقافة.
- رولان بارت (١٩٩٠)، الأسطورة اليوم، ترجمة: حسن الغرفي، الموسوعة الصغيرة (٣٤٥)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- رينيه ويليك (١٩٨٧)، مفاهيم نقدية، ترجمة: محمد عصفور، عالم المعرفة، المجلس الوطني للثقافة والفنون و الآداب، الكويت.
- سالم أحمد الحمداني (١٩٨٩)، مذاهب الأدب الغربي، جامعة الموصل.
- سامي ذبيان (١٩٨٧)، الصحافة اليومية و الإعلام، الطبعة الثانية، دار المسيرة، بيروت- لبنان.
- سعدو أسود خضر (١٩٨٥)، فن الكتابة، مطبعة الثقافة والشباب، أربيل.
- سي. دى لويس (١٩٨٢)، الصورة الشعرية، ترجمة: أحمد نصيف الجنابي، منشورات وزارة الثقافة و الإعلام، دار الرشيد للنشر، بغداد.
- شكري عزيز الماضي (١٩٨٥)، في نظرية الأدب، دار الحداثة للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت- لبنان.
- شوقي ضيف (١٩٦٢)، في النقد الأدبي، الطبعة الثالثة، مكتبة الدراسات الأدبية (٢٦)، دار المعارف بمصر.

- شوقي ضيف (١٩٦٢)، في النقد الأدبي، الطبعة الثانية، مكتبة الدراسات الأدبية (٢٦)، دار المعارف بمصر.
- صابر فلحوط و محمد البخاري (١٩٩٩)، العولمة والتبادل الأعلامي الدولي، الطبعة الأولى، دار علاءدين، دمشق.
- صالح مهدي شريدة (١٩٧١)، دراسات والنقد في الشعر، مطبعة الأرشاد، بغداد.
- طلعت همام (١٩٨٨)، مائة سؤال عن الصحافة، موسوعة الإعلام والصحافة، الطبعة الثانية، دار الفرقان للنشر و التوزيع، عمان- الأردن.
- عادل فريجات (٢٠٠٠)، مرايا الرواية- دراسات تطبيقية في الفن الروائي، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، مدشق- سوريا.
- عادل فريجات (٢٠٠٢)، النقد التطبيقي للقصة القصيرة في سوريا، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، مدشق- سوريا.
- عبدالرزاق الأصفر (١٩٩٩)، المذاهب الأدبية لدى الغرب، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، مدشق- سوريا.
- عبدالستار جواد (١٩٩٨)، اللغة الإعلامية، منشورات دار الهلال للترجمة، أربد- المملكة الأردنية الهاشمية.
- عبدالستار جواد (١٩٩٩)، النقد الصحفي، الموسوعة الصغيرة (٤١٩)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- عبدالستار جواد (٢٠٠٢)، فن كتابة الأخبار، عمان- الأردن.
- عبدالعزيز شرف (١٩٨٩)، المخل الى وسائل الإعلام، الطبعة الثانية، دار الكتاب المصري، القاهرة.
- عبدالعزيز شرف (١٩٩١)، اللغة الإعلامية، الطبعة الأولى، دار الجيل، بيروت.

- عبدالعزيز شرف (٢٠٠٠)، الأساليب الفنية في التحرير الصحفي، دار القباء للطباعة والنشر و التوزيع، القاهرة.
- عبدالعزيز عتيق (١٩٧٤)، تأريخ نقد الأدبي عند العرب، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت– لبنان.
- عبدالقادر شرشار (٢٠٠٣)، الرواية البوليسية، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق– سوريا.
- عبداللطيف حمزة (١٩٥٥)، الصحافة و الأدب في مصر، جامعة دول العربية، معهد الدراسات العربية العالية، مطبعة البرلمان بالعتبة، مصر.
- عبداللطيف حمزة (١٩٥٨ أ)، المدخل في فن التحرير الصحفي، الطبعة الثانية، دار الفكر العربي، القاهرة.
- عبداللطيف حمزة (١٩٥٨ ب)، أدب المقالة الصحفية في مصر، الجزء ٢، الطبعة الثانية، دار الفكر العربي، القاهرة.
- عبداللطيف حمزة (١٩٦٥)، الأعلام له تأريخه و مذاهبه،الطبعة الأولى، دارالفكر العربي، مصر.
- عبدالنبي خزعل (٢٠٠٣)، فن تحرير الأخبار في الأذاعات الدولية، دار العلمية الدولي للنشر والتوزيع، عمان– الأردن.
- عزالدين إسماعيل (١٩٧٥)، الأدب و فنونه، الطبعة الخامسة، القاهرة.
- عصام الخطيب ، توفيق عزيز عبدالله (١٩٨٦)، في نقد النثر و أساليبه، الموسوعة الصغيرة (٢١٨)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- علي المصري (١٩٩٨)، في رحاب الفكر و الأدب، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق– سوريا.

- عمر الدسوقي (بلا)، في الأدب الحديث، الجزء الأول والثاني، دار الفكر العربي، القاهرة.
- فاروق أبو زيد (١٩٨٣)، فن الكتابة الصحفية، الطبعة الثانية، دار الشروق للنشر و التوزيع و الطباعة، جدة.
- فاروق أبو زيد-ليلى عبدالمجيد (٢٠٠٠)، فن التحرير الصحفي، مداخلات تكنولوجيا التعليم، القاهرة.
- فوزي كريم (٢٠٠٣)، قصيدة النثر، منشورات دار المدى، عدد (٤٠)، دمشق.
- قيس الياسري (١٩٨٧)، الخبر الصحفي، دار الحكمة للنشر والتوزيع، بغداد.
- قيس الياسري و آخرون (١٩٩١)، الفنون الصحفية، جامعة بغداد، كلية الآداب، دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد.
- ڤ. ل. سكڤوزينكوف (١٩٨٠)، نظرية الأدب، تأليف عدد من الباحثيين السوفييت المختصيين، ترجمة: جميل نصيف التكريتي، المركز العربي للطباعة والنشر، بيروت.
- ڤ. ل. سكڤوزينكوف (١٩٨٦)، موسوعة نظرية الأدب، القسم الأول، قضايا الشكل والقصص الشعبي البطولي، ترجمة: جميل نصيف التكريتى، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- ڤ. ڤ. كوژينوڤ (١٩٨٠)، نظرية الأدب، تأليف عدد من الباحثيين السوفييت المختصيين، ترجمة: جميل نصيف التكريتي، المركز العربي للطباعة والنشر، بيروت.
- كرم شلبي (١٩٩٤)، معجم المصطلحات الإعلامية، الطبعة الثانية، دار الجيل، بيروت.

- كمال الرياحي (٢٠٠٤)، محمد شكري: الكتابة الأوتوبيوغرافية "فورة الأجناس و رسوخ السيرة الذاتية"، مجلة كتابات المعاصرة، العدد (٥٢) شباط و آذار، بيروت.
- لانريكي اندرسون أمبرت (٢٠٠٠)، القصة القصيرة- النظرية والتقنية، ترجمة: علي ابراهيم علي متوفي، القاهرة.
- لسان العرب (بلا)، المحيط، العلامة إبن منظور، المجلد الأول (أ-ر)، معجم لغوي علمي، دار لسان العرب، بيروت- لبنان.
- لين أدلتبنيرند و آخرون (١٩٨٣)، الوجيز في دراسة القصص، ترجمة: عبدالجبار المطلبي، الموسوعة الصغيرة (١٣٧)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- مؤيد عبدالجبار الحديثي (٢٠٠٢)، العولمة الأعلامية، الطبعة العربية الأولى، الأهليى للنشر والتوزيع، عمان، المملكة الأردنية الهاشمية.
- ماجد حمود (٢٠٠٠)، مقربات تطبيقية في الأدب المقارن، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق- سوريا.
- مجد الهاشمي (٢٠٠٣)، الإعلام الدولي و الصحافة عبر الأقمار الصناعية، دار المناهج للنشر و التوزيع، عمان- الأردن.
- محفوظ جودة (١٩٩٧)، أساليب البحث العلمي، زهران للنشر، عمان- الأردن.
- محمد أزهر سعيد السماك و آخرون (١٩٨٦)، أصول البحث العلمي، الطبعة الأولى، جامعة الموصل.
- محمد الدروبي (١٩٩٦)، الصحافة والصحفي المعاصر، الطبعة الأولى، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت.
- محمد حسن عبدالعزيز (بلا)، لغة الصحافة المعاصرة، السلسلة الثقافية، المركز العربي للثقافة والفنون، بيروت- لبنان.

- محمد راتب الحلاق (٢٠٠٠)، النص و الممانعة- مقاربات نقدية في الأدب و الأبداع، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق- سوريا.
- محمد رياض وتار (٢٠٠٢)، توظيف التراث في الرواية العربية المعاصرة، دراسة، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق- سوريا.
- محمد عبدالحكيم محمد (١٩٩٩)، فنون المقال بين النظرية و التطبيق، دار أم القرى للخدمات التعليمية، المنصورة.
- محمد عبدالحميد- السيد بهنسي (٢٠٠٤)، تأثيرات الصورة الصحفية-النظرية والتطبيق، الطبعة الأولى، عالم الكتب، القاهرة.
- محمد غنيمي هلال (١٩٧٥)، في النقد المسرحي، دار العودة، بيروت.
- محمد غنيمي هلال (١٩٧٣)، النقد الأدبي الحديث، دار العودة- بيروت.
- محمد فريد الصحن (١٩٨٨)، الأعلان، دار الجامعية، كلية التجارة، جامعة الأسكندرية، مصر.
- محمد فريد محمود عزت (٢٠٠٢)، القاموس الموسوعي للمصطلحات الإعلامية، الطبعة الأولى، العربي للنشر و التوزيع، القاهرة.
- محمد مرتاض (٢٠٠٠)، النقد الأدبي القديم في المغرب العربي- نشأته و تطورة (دراسة وتطبيق)، من منشورات إتحاد الكتاب العرب، دمشق- سوريا.
- محمد مندور (١٩٧٤)، الأدب و فنونه، دار نهضة مصر للطبع والنشر، الفجالة- القاهرة.
- محمد مشبال (٢٠٠١)، البلاغة و مقولة الجنس الأدبي، مجلة عالم الفكر، المجلد (٣٠)، عدد (١) سبتمبر ٢٠٠١، تصدر عن المجلس الوطني للثقافة والفنون و الآداب، الكويت.

- محمود أدهم (١٩٨٢)، دراسات في فن الحديث الصحفي، مطبعة دار نشر الثقافة، الفجالة، القاهرة.
- محمود أدهم (١٩٨٥)، جريدة الأهرام و فن التحقيق الصحفي، القاهرة.
- محمود فهمي (١٩٦٤)، الفن الصحفي في العالم، دراسات صحفية، دار المعارف بمصر.
- مختار الوكيل (١٩٥٤)، بين الصحافة و الأدب، مطبعة الجريدة التجارية المصرية، القاهرة.
- معروف خەزنەدار (٢٠٠٠)، موجز تأريخ الأدب الكردي المعاصر، ترجمة عن الروسية: عبدالمجيد شيخو، الناشر: هوشنك كرداغي.
- ممدوح حمادة (١٩٩٩)، فن الكاريكاتير من جدران الكهوف إلى أعمدة الصحافة، دار عشتروت للطباعة والنشر، دمشق.
- ممدوح حمادة (٢٠٠٠)، فن الكاريكاتير في الصحافة الدورية، دار عشتروت للطباعة والنشر، دمشق.
- ميشال عاصي (١٩٧٠)، الفن والأدب، بيروت – لبنان.
- ميلفن مينتشر (١٩٩٢)، تحرير الأخبار في الصحافة و الأذاعة والتلفزيون، ترجمة: أديب خضور، الطبعة الأولى، المكتبة الأعلامية (٧)، دمشق.
- نيل ماكنيل (١٩٥٥)، تعليم الصحافة، شركة ماكميلان، نيويورك.
- هوف جورج (١٩٧٣)، الإبراق الصحفي، شركة هفتن ملفن بسطن.
- هادي نهر (٢٠٠٣)، الكفايات التواصلية و الأتصالية– دراسات في اللغة و الإعلام، الطبعة الأولى، دار الفكر، عمان– الأردن.
- هويدا مصطفى (١٩٩٩)، الأعلان في الأنظمة الأذاعية المعاصرة، دار المصرية اللبنانية، القاهرة.

- وائل العاني (١٩٨٠)، آراء في الكتابة و العمل الصحفي، الموسوعة الصغيرة (٧٥)، منشورات دار الجاحظ للنشر، وزارة الثقافة و الأعلام، بغداد.
- واثق الدايني (٢٠٠١)، الترجمة في الصحافة المحلية، دراسة تحليلية، بيت الحكمة، بغداد.
- ويلبريس. سكوت (١٩٨١)، خمسة داخل إلى النقد الأدبي، ترجمة و تقديم و تعليق: عناد غزوان اسماعيل و جعفر صادق الخليلي، دار الرشيد للنشر، بغداد.
- يا. إي. إيليسبورغ (١٩٨٠)، نظرية الأدب، تأليف عدد من الباحثين السوفييت المختصيين، ترجمة: جميل نصيف التكريتي، المركز العربي للطباعة والنشر، بيروت.
- يا. إي. إيليسبورغ (١٩٨٦)، موسوعة نظرية الأدب، القسم الأول، قضايا الشكل والقصص الشعبي البطولي، ترجمة: جميل نصيف التكريتى، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد.
- يعقوب حسين نشوان (٢٠٠٤)، البحث العلمي، الطبعة الأولى، دار الفرقان للنشر والتوزيع، المملكة الأردنية الهاشمية.

## سەرچاوە فارسییەکان:

- ژان کازنو (١٩٩١)، جامعه شناسی وسایل ارتباط جمعی، ترجمه: باقر ساروخانی، منوچهر محسنی، چاپ سوم، انتشارات اطلاهات، تهران.
- سیروس شمیسا (١٩٩٥)، أنواع أدبی، چاپ سوم، انتشارات فردوس، تهران.
- کاظم معتمد نژاد (٢٠٠٤)، روزنامەنگاری، چاپ پنجم، مرکز نشر سپهر، تهران.

- محمود ساعتچی (١٩٩٥)، أصول و فنون إجرای مصاحبه، چاپ دوم، مؤسسهء انتشارات أمیر کبیر، تهران.
- نعیم بدیعی، حسین قندی (٢٠٠١)، روزنامەنگاری نوین، چاپ دوم، دانشگاه علامه طباطبایی، تهران.

## سەرچاوە ئینگلیزییەکان:

- F. Fraser Bond (1973), An Introduction to Journalism, Macmillan Co.
- Herbert Joseph Muller (1965), The spirit of tragedy, Washington Square Press.
- J. A. Cuddon (1984), A Dictionary of Literary Terms, Published in Penguin Books.
- Karam Shalabi (1994), Dictionary of Mass Communication Terms.
- M. A. Abrams (1993), A Glossary of Literary Terms, Sixth Edition, Printed in United States of America.
- Malcolm F. Mallete (1998), Handbook for Journalists, Third Printing, World Press Freedom Committee, USA.
- Marina Wachter (1988), The Best of Newspaper Design 2, PBC International, NewYork.
- Melvin Mencher (2001), Basic Media Writing, Fifth Edition, United States of America by Times Mirror Higher Education Group.
- Oxford Advanced Learner`s Dictionary (1989), Chief Editor: A p Cowie, Fourth Edition, Oxford University Press.
- Ralph D. Berenger (2004), Global Media Go To War, Marpuette Books, United States of America.
- Seon Brone (1976), Leader Writing, London.

**پێگەکان:**


- www.ahlulbaitonline.com.
- www.ar-wikipedia.org.
- www.ekateb.net.
- www.elsohof.com.
- www.enashir.com.
- www.fingersfollies.com.
- www.geocities.com.
- www.georgegopen.net.
- www.islamonline.net.
- www.islamweb.net.
- www.jenskleemann.de.
- www.kurdistannet.org.
- www.mnaabar.com.
- www.philo.most4host.com.
- www.wissens-quiz.de.

# خلاصة البحث

هذه الرسالة، تحت عنوان ( الأنواع الأدبية و الصحفية و إنعكاسهما في "ژيان و ژين" ١٩٣٢-١٩٥٠)، تمت دراستها حسب منهج التحليل الوصفي. وقد تم العمل على ٦٩٥ عدد من هذه الصحيفة، إبتداءً من العدد ٣٢١ من " ژيان" إلى ١٠١٥ من " ژين".

وقد تم الحصول على ٢٩٤٨ صفحة من هذه الصحيفة بعد بحث دؤوب ومن ثم وضعت هذه الصفحات تحت الدراسة. وكذلك تم الحصول على كثير من نسخ خط اليد لصاحب هذه الصحيفة (پيرەمێرد) و دراستها للمرة الأولى كمادة للبحث في رسالة كهذه.

تنقسم الرسالة إلى مقدمة و أربعة فصول و ثلاث ملحقات:

في الفصل الأول، تم تحليل مفهوم الأدب و الأنواع الأدبية و تصنيفها حسب مبدأ (الشعر و النثر).

خصص الفصل الثاني لتحليل مفهوم الصحافة و الأنواع الصحفية و تصنيفها حسب مبدأ (الذاتية و الموضوعية).

وفي الفصل الثالث تمت دراسة العلاقة بين الأدب و الصحافة و خصائص كل منهما و التمييز بينهما و تطورهما، ودراسة (پيرەمێرد) كأديب صحفي، ودراسة "ژيان و ژين" كصحيفة جامعة بين الأدب و الصحافة.

وقد خصص الفصل الرابع لدراسة أبعاد الأدب و الصحافة و تحديد أنواع و أجناس و فنون الأدب و الصحافة التي أستخدمت في هذه الصحيفة.

وقد تم في الملحق الأول عرض العديد من النسخ الأصلية للصحيفة و بعض الصحف الضرورية الأخرى. وفي الملحق الثاني عرضت نسخ خط اليد، والملحق الثالث يحتوي على جدول يضم أعداد الصحيفة من ٣٢١ إلى ١٠١٥ مع كل تواريخ الصدور حسب اليوم و الشهر و السنة، وكذلك الحجم و الصفحات، مع حقل لتصحيح الأخطاء.

لهذه الرسالة نتائج و إستنتاجات عديدة، من أهمها:

- إكتشاف الأعداد (٥٣٨، ٧٠١) وإثبات أنها لم تصدر أساساً، حيث كان من المفترض ان يكون آخر عدد في هذه الفترة العدد ١٠١٣ بدلاً من ١٠١٥.

- إثبات أن (پيرەمێرد) هو أول صحفي محترف و مراسل كوردي، من حيث تواجده شخصياً و عملياً في موقع الأحداث و قيامة بتغطيتها.

- الصحيفة- وعلى وجه الخصوص من العدد ٥٣٩ فما فوق- أصبحت أول صحيفة كوردية مستقلة.

- طغى الأدب على الصحيفة بشكل كامل، حتى أن المواضيع الصحفية قد كتبت أيضاً بطريقة أدبية.

- وجود رقابة حكومية صارمة على الصحيفة تم إثباتة للمرة الأولى في هذه الرسالة.

- وتم لأول مرة في رسالة كوردية كهذه، التمييز بين الأجناس الأدبية و الصحفية و تصنيفها حسب معايير علمية.

